دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان – هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ۲۸ تشرین (۲) ۱۹۹۸ هاتووەتە دامەزران

شوکور مستەفا
دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی
کتێبی ئاراس ژمارە: ۹۹۹
چاپی دووەم ۲۰۱۰
تیرێژ:۱۵۰۰ دانە
چاپخانەی ئاراس – هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٦٠٤ – ۲۰۱۰
نەخشاندنی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید . ئاراس ئەکرەم
ڕازاندنەوەی بەرگ: ناسح ساڵح
پیت لێدان: ڕۆشنا ڕەشاد
هەڵەبژێری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل . فەرهاد ئەکبەری . ئومێد بەننا
ڕێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

## پێڕست

# پێشوتار

شێخ ڕەزای تاڵەبانی، بەپێی چامەیەك كە لەمەڕ بنەچەكە و ڕەگەمای خۆی و بنەماڵەی خۆی فەرموویە، كوڕی شێخ عەبدوڕەحمان كوڕی شێخ ئەحمەد كوڕی شێخ مەحموودی زەنگنەیە. هێندێك دەڵێن، خانوادەكە، بەڕەچەڵەك دەچنەوە سەر كاكە سووری كوڕانی شێخ مووسا و شێخ عیسا و لە هۆزی زەنگنە نین واتە شێخ مەحموود بەڕەچەڵەك لە نەوەی كاكە سوورییە و باوی نێوی یووسف ئاغایە و خزمایەتییان لە كیژی میر سمایل بەگەوە سەری هەڵداوە و شێخ مەحموود لە ساڵی ١١٣٠ك. دا لە قەراخ، چاوی بەدنیای ڕوون هەڵێناوە.. بەڵام ئەم قسانە سەرلەبەر، بەشایەتیی شێخ ڕەزا خۆی، بەڕای بەندە دەپووچێتەوە و بنەماڵەكە خۆیان بەزەنگنە دەزانن. لە تەزكەرەی ئەعلادا كە بەبڕوای بەندە كۆنترین دەساوێزی ئەهلی هەقە. باسی سەیدایەتیی بابانەكان لە حەسەن بەگەوە دەكا و لەوێشدا، شێخ مووسا و شێخ عیسا هاتوونە ناو ناوانەوە. ئەمن كارم بەسەر ئەوەوە نییە، كە شێخ مووسا و شێخ عیسا بەچەند پشت دەچنەوە سەر بابا تایەری هەمەدانی، بابان، یا كاكییەكان یا هەر تیرەیەكی دیكە سەیدن یا سەید نین، وەلێ هەرگیز لەوەدا دوودڵ نیم، كە سەرلەبەری كوردی ئەم بەر و ئەو بەری چۆمی سیروان، لە سەرچاوەوە بگرە تا دەگاتە خوارێ، بەپێی ئەو نەخشەیەی "ئیڤان" دایناوە، تێكڕای ئەهلی هەق بوون و كاكەییەكانی ئەمڕۆ پاشماوەی ئەوانن. بەندە بەپێویستی نازانم لەمەڕ بۆچی بوون بەئەهلی هەق، درێژە بەقسان بدەم؛ ئەمە جێی خۆی هەیە..

شێخ ڕەزا لە ساڵی ١٨٣٦ـ١٨٣٧ز. دا، لە گوندی "قرخ"ی سەر بە بازیان لە دایك بووە. شیعری شێخ ڕەزا، ئەوەی ماون و لە چاپ دراون بێ گومان هەڵەیان تێ كەوتووە و ڕەنگە زۆریشی لێ لە ناوچووبن. هۆی ئەمەش زۆر و جۆراوجۆرە. بەش بەحاڵی هەڵە، نەمازا، شیعرە كوردییەكانی، نەخوێندەواری و دەسكاریی بەئەنقەست، دەوری زۆریان گێڕاوە. بەداخەوە، شێخ ڕەزا، تا ئەوڕۆش لە نێو خەڵكدا، وەك بێژی، تەنها وەك شاعیرێكی فڕاوێژ و جنێوفرۆش لە قەڵەم دراوە..

ئەمەش کەم سەلیقەیی و کەم زانی و لە بابەتی دیکەی شێخ ڕەزا بێ سەرەودەرییە، دەنا شێخ ڕەزا، لە سەرلەبەری بابەتەکانی شیعردا، سوارچاکە و بەشایەتیی لە شیعرزان و پسپۆڕان شاعیری چاکە و چ گومان لەوەدا نییە...

ئەمن لەم کارەمدا، بۆ ساغکردنەوەی شیعرەکانی شێخ ڕەزا، واتە ئەو شیعرانەی کە لە چاپ دراون، یا لە بەیازێك، لە کەشکۆڵێکدا نووسراون، پشتم بە لە خۆم شارەزاتر و لێزانتر، حەکایەتهایەك، کە دەماودەم، لە دۆست و دوژمنانی شێخ ڕەزاوە دەگێڕدرێنەوە، بەشێوەی نووسین، بەکێشی عەرووز و قافیە و هتد... بەستووە. ئەوەندیم سەر لێ دەرچووە، خۆمم پێوە ماندوو کردووە، هیوادارم کارەکەم شتێکی نوێی تێدا بەر چاوی لە خۆم خوێندەوارتر بکەوێ، ئەگەر پێکابێتم، دوعای خێرم بۆ بکەن، ئەگەرنا، خوێندەواران با بفەرموون، هەڵەکانم ڕاست کەنەوە. زۆر سپاسی کاك محەمەد عەلی قەراخی دەکەم. زۆری بەیاز و دەستنووسی بۆ فەراهەم کردم.

شوکور مستەفا

(١) ئەلف

**ستایشی حاجی ئەسعەد ئاغا***

تۆ کەم نەزەری دەرحەقی من ئێستەکە ئاغا
من ماوە هەوای سوحبەتی تۆم هەر لە دەماغا
تا ڕۆژی قیامەت بە خودا زیندووە نامرێ
بابێ کە بمێنێ کوڕی وەك تۆی لە وەجاغا
بۆ تووتنەکەی بێشەمەیی (شاور) و ( شێتنە)[١]
شێت بووم و نەهات وەختە دڵم دەرچێ لە داغا[٢]
جاران چ بە جاغ و چ بە بار بۆت دەهەناردم
نانێری ئەمێستا نە بار و نە بە جاغا[٣]
ڕێی نەوتەکە باجگیری ئەگەر زۆرە دەفەرمووی
ڕێی خاسە بە شەو خاڵییە با بێ بە بلاغا
نەمزانی فەلەك گۆبەنی هەر بۆمنە یاخۆ
سەد دەستی وەکو دەستی منی کردووە بە زاغا
یا ڕەب گوزەران کا بە سەفا وەختی عەزیزت
پەیوەستە لە دەوری چەمەن و گەردشی باغا
بۆ چوونە تەوافی حەرەمی شاهیدی مەقصوود[٤]
عالەم هەموو مەئزوونە (ڕەزا) هەر لە یەساغا

..............................................................

(١) بێشەمەو: (ت ، م)، بێشەمەیی: (م . م) بێشمەو (هـ . ق) بەواوی عەتف بێ وادەگەیێنێ بێشەمە و شاور و شێتنە هەرسێکیان سێ جۆرە تووتن بن، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە، بێشەمە، جۆری تووتنەکەیە و شاور و شێتنە دوو شوێنن کە بێشەمەیان لێ دەچێندرێ، بۆیە دەبێ ئیزافە بکرێتە باڵ (شاور و شێتنە).

(٢) دەچێ:(ت . م)، ڕەش بێ: (خ).

(٣) بەجاغا: (ت . م)، لە جاخا: (خ).

(٤) مامۆستا خاڵ سەرواکانی بە (خ) نووسیون، ڕاستییەکەی دەبێ (غ)بن. بەقەرینەی

(ئـاغـا)، کـورد نـاڵـێ (ئـاخـا) لـە چـەند بـەیـازمدا بـە (غ) دیوە و بـە (خ) زمـانزەدی نەخوێندەوارانە.

(*) کێش: هـەزەج موسـەممـەن ئـەخرەب مـەکفووف مـەحزووف

(مفعول مفـاعیلُ مفـاعیلُ فعولن)

وەك "دردی کە مرا هست بـە مرهـم نفروشم

ور عـافیتش صرفـە دهـی هم نفروشم"

کەم نـەزەر (ع . النظر): کەم لوتف، کەم چـاودێری، کەم مشوورخۆری. ئـامێتـەیەکی وەسفـیـیـە. سیفـەت پـێش مـەوسووف کـەوتـووە، کـە دەکـاتـە "الـنَّعت السَّبـبـی"یـا" صفة جـاریة لغیر من هـي لـە" دەرحەق: (ف . در)، (ع . الحق): دەرهـەق، لـەبـارە، لـە هـەق (مقـابل). ئێستەکە (ك): ئێستاکە، نـها، نـهۆ، وێستـاکە. هـەنووکە، نووکە، ڤـێ گاڤـێ... ئـاغـا (ف . آغـا): خـاتوون، بیبی، بیگم، خـانم، ژن، حـەرەم. ئـەمـە نـاوێکە، کە لـە نوای یـا لـە دوای نێوانـەوە دێ و بـەنۆکـەری حـەرەمسـەرا دەگوترا. بـەزۆری دەشخـەسێندران وەك "حـەرەم آغـاسی" و "ایشیك آغـاسی" بـەتورکی و "مبـارك آغـا" و "آغـا المـاس" و ئی دیکە بـەفـارسی... بـەڵام بـەکوردی بـەمـانـای "آقـا"ی فـارسی دەکـاردەبـرێ، واتـە گـەورە و سەروەر و هـتـد... بـەفـارسی هـەر "آغـا"یـەکـە بـوو، بـەڵام بـۆ لـە مـانـایـەکـەی دیکـە هـاوێرکردنی، بـە "آقـا"ی دەنووسین و بـە "آغـا"ی دەڵێن: چونکە (ق) دەکەنـە (غ) و (غ) دەکەنـە (ق). غـەیری فـارس عـارەبی جبوور و ئی شوێنی دیکـەش هـەر وا دەکـەن... سەروا "قـافیـە"ی ئـەم چامـەیە (غ)ە. جـا هـەر بۆیە "دەمـاغ" و "وجـاغ" و "داغ" هتد... هـەمووی هـەر (غ)ە، نـەك یـەکێکیـان (خ) و یـەکێکیـان (غ)؛ چونکە ئـەگـەر بگوترێ، هـەر وەکو گوتراوە، "وەجـاخ"، "دەمـاخ"، "داخ" لـەگـەڵ (ئـاغـا)دا ڕێك نـاکـەون، بـەڵام ئی وەك شێخ ڕەزای "شـاعـیـری چـاك" هـەڵـەی وا نـاکـا... بـەهـەشتـی شێخ مـحـەمـەدی خـاڵ. هـەمووی کردوون بـە (خ)، کە گۆیـا ئـەلفبێتکەی کوردی (غ)ی تێدا نییە... هـەوا (ع. الـهـوی): مـەیـل ئـارەزوو، خـۆشەویستـی و ئـیـدی.. سوحـبـەت (ع. الـصُّحـبـة): هـاودەمیکردن، تێکەڵی، ئـاخـاوتن، گاڵتەکردن و ئیدی .. دەمـاغ (ع. الدَّمـاغ): لووت، کەپوو، کونە کەپوو، برنـاخ. شێخ ڕەزا یـا لـە وەڵامی حـاجی ئـەسعـەد ئـاغـادا، وەك بیستوومـە، گلـەییی لـێ کردووە، دەڵێ: "تۆ کـەم نـەزەری، بـێ لوتفی.. یـا ڕەزا بۆ خۆی گازن لـە حـاجی دەکـا، دەڵێ: "ئـاغـا جـاران دەرهـەقم زۆر بـەلوتف بووی، کەچی ئێستـا وا نیت، بـەڵام من مـەیل و ئـاڵـهـای هـاودەمی و ئـاشنـایـەتیی تۆم هـەر لـە دەمـاغدا مـاوە...

وشەی دەماغ (دەماخ) لە کوردیدا بەمانای دیکەش هاتووە: دەڵێن: فلانە کەس زۆر بەدەماغە، واتە: زۆر کەیفسازە، یا زۆر لووت بەرزە، یا دەماغی هەڵپێکاوە، دەمامکی کردووە و هتد... وەجاغ (ت. اوجاق): کوانوو، ئاگردان، دوودمان، خانەدان، بنەماڵە (بەکوردیش و بەفارسی)ش بنەماڵەی نامێ و بەناووبانگ. قیامەت (ع. القیامة) هەڵستانەوە، لە پاش مەرگ زیندووبوونەوە. مانەوەی کوڕ لە وەجاغدا، وەجاغ روونی، منداڵ مانەوەی مەبەستە. ئەگەر کورد کوڕی هەبێ، دەڵێن: وجاغی رۆشنە، روونە... ئەوەی هەر کچی هەبێ، یا هەر هیچی نەبێ، وەجاخ (وجاغ) کوێری پێ دەگوترێ. مەبەستی پەستیی حاجییە و دەڵێ بابی حاجی دەبێ شانازی بەحاجییەوە بکا، کە فرزەندی وەکی وی هەیە... عارەب دەڵێن: "لا تقل اصلی وفصلی ابدا/ إنما اصل الفتی ما قد حصل" و " الولد علی سر ابیه" و هتد... بێشەمە (ك): بێشەما، تووتنی بۆندار، جۆرە تووتنێکی تایبەت. شێتنە و شاور: هەرتك نێوی دوو شوێنن، تووتنی چاك و بۆنداریان لێ دەچێندرێ، ڕەزا گلەیی لە حاجی دەکا، وەکو جاران لوتفی دەگەڵدا نییە و تووتنی بێشەمەی بۆنداری شاور و شێتنەی بۆ نانێرێ و هەر وەختە شێت بێ و دڵی لە داخان دەرچێ. جاخ (ك): دەسکێ لە گەڵا تووتن، توورەکە، یا کیسکەی تووتن، کە جگەرەکێش دەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرێ و بەبەری پشتێندیدای دەکا، هێندێ جار بە "بەرماغ"، هێندێ جار بە "سیغار"ی بافرەی دەکێشێ. شێخ ڕەزا لە وشەی "جاخ"دا دەسکە گەڵا و توورەکەشی مەبەست بووە، واتە: دوو نیشانی بەتیرێ ئەنگاوتووە. ئەمێستا: ئێستا. لە ئەم و ئێستا هاتۆتە گۆڕێ. بۆ زێدە پێ لەسەرداگرتنە. وشەی "بە" بۆ زەرفییەت و بۆپێناویش دێ. واتە: بەهۆی جاخ و بارەوە، کە نیاز لە "جاخ" و "بار" دەفر نەبێ، یا لە نێو جاخ و باردا، کە نیاز دەفر بێ. لە حاڵەتی زەرفییەتدا کە "بە" بەمانای "لە"بێ، وەك: پارەکەت بەپیرۆتدا بۆ دەنێرم، واتە دەگەڵ پیرۆتدا.. یا ئەگەر "دەگەڵ" بێ "ا" و "دا" دێنە پێش دەفرەکە و ئاوەڵەوە، بەلام ئەگەر بەمانا "بەهۆ" یا "عەیارە" بێ، هەنگین "ا" و "دا"ی ناوێ. بار: ئەوەی لەسەر پشتی ولاخ دەئێخرێ. بەبارست، زۆر. شێخ ڕەزا لە دەکاربردنی کاری "دەهەناردم"دا یا کێشی شیعرەکە ناچاری کردووە بێژێ "دەهەناردم"، یا ویستوویە لاسایی خەڵکی ناوچەی "ئاکۆیان" بکاتەوە؟.. بەدووری نازانم ئی یەکەمیان ڕەنگە پتر بەئەقڵەوە بچێ. دیارە شێخ ڕەزا گلەیی لە حاجی دەکا و دەڵێ جاران بەتوورەکە و بار، یا بەدەسکە گەڵاو بە بارست تووتنی بێشەمای شاور و شێتنەت بۆ دەناردم،

بەڵام ئێستا بۆم نانێری. باجگیر (ف. ك. باج، باژ، پاژ): وشەی باج، پارسی (فارسی)ی کۆنە و بەماڵ و سامانێ دەگوترا کە پادشایان لە ژێردەستانی خۆیانیان وەردەگرت. گومرگ، پیتاك، خەرج، ئەو پارەیەی کە پیاوی میری بەباج لە خەڵکی دەستێنێ. ″باجگیر″، ڕشتی فارسییە. بەکوردی ″باجگر″ە، واتە: باج ئەستێن. ڕێی نەوتەکە: ئەو ڕێگایەی کاروانی بەری کۆیە و شوان و ″شێخ بزەینی″ «شێخ بزنی» و ئەولاتریشی پێدا بۆ کەرکووك دەهاتن. بۆ خۆم لە بیرمە جارێکیان لە ٤٢دا، چوومە کن خاڵە سابیرم، لە کەڵوڕی ماڵە سەید ئەحمەدی خانەقا، سەپان بوو، شەوێ دەگەڵ کارواندا بەوێدا بۆ کەرکووك وەگەڕام، هەر لە قات قاتەکان ئاودیو دەبی، چراخان و مەشخەڵانی باوەگڕگڕ دنیا دەکا بەڕۆژی نیوەڕۆیێ.. ڕێی خاسە: خاسە (ع. الخاصَّة): بەمانای مڵکی دەوڵەتە. لە دەستاوێز و بەڵگەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بە ″خاصَّە تیماری″ هاتووە. ″تیمار″ بەو زەویوزارە دەگوترا، کە سوڵتان بەمیر و بەگلەکانی دەبەخشی و دەیەکی داهاتیان بەدەوڵەت دەدا، بەمەرجێ، هەر کاتێکی دەوڵەت داوای لێ کردن لە تاڵان و بڕۆیەکانیدا هاوبەشی بکەن. ئەمن بەبیرم دێ. بەری ڕۆژهەڵاتی ″خاسە″ سەرلەبەر ″خاصَّە تیماری″ی پێ دەگوترا، بێ گومان ڕێگای کومپانیا لە هاتوچۆ پاوان کرابوو و کاروان دەبوا، بەتایبەت بارە تووتن و شمەکی دیکە، باجی لەسەر دابا، ئەو سەردەمە ″عەلوە″ نەبوو، خەڵك شمەك بۆ ″عەلوە″ بێنێ و باجی خۆی بدا. باجگر (تحصیلدار) و جامباز بەپیریی کاروانییانەوە دەچوون، پێش وەی بگەنە شار، باجیان لێ دەستاندن. باج لە زۆر شتان وەردەگیرا، تەنانەت لە هێلکە و مریشکیش، لە بارە کا و دار و دەوەن و پەڵۆشەش وەردەگیرا، چ جای گەنم و جۆ و تووتن و خوری و ڕۆن و سپیایی و ئی دیکە... هێندێ کاو، باجگر و جامبازی جلخواری کەرکووك فێڵیان لە کاروانیی کوردی هەناسە سارد دەکرد، باجیان بێ قۆچان لێ وەردەگرت. زۆر جار جامباز خۆی لە کاروانی دەکرد بەباجگر، هێندێ جاریش باجگر خۆی لێ دەکرد بەجامباز، چوزانم ئیدی هەر گەلەکۆمە بوو و لە کوردی بەستەزمان دەکرا. شێخ ڕەزا دەفەرموێ: بەڕێی خاسەدا وەرە، واتە: بەبەری ئەم بەردا وەرە، با باجگر و ماجگر نەتگرن، کەم ڕێیان دەکەوێتە ئەوێ، خاڵییە، بەبڵاغدا بێ. بڵاغ (ت. بولاق): کانییەکە لەم بەری ڕۆژهەڵاتی کەرکووك، واتە: بەری تەکیە و ئاخوڕ حوسێن ″أخي حسین″ هەڵکەوتووە. کانیاوێکە لە بن کەنیشتی عیسەوییانی کلدانی کەرکووك، شوورەدرابوو، موسڵمانان دەستنوێژیان تێدا دەگرت،

وسڵیان دەکرد... گەرەکێك بەلای خوارێدا هەیە، بەنێوی "بلاغ"ەوە نێونراوە. دیارە "سابلاغ" (ساوجبلاغ ـ صغوق بولاق)یش، کەواتە: کانیی سارد، هەر لەوەرا هاتووە. گوندێکیش لە ناوچەی قەرە حەسەن هەیە بەنێوی "خدر بلاغ"ەوە لە نێوان لەیلان و باداوادا بوو، ئەو ناوە سەرلەبەر ئەنفال کراون و کەسی تێدا نەماوە... پێش ئەنفال کران، خەڵکەکەی بلاوەیان لێ کرد، هاتنە باداوا، بیستمەوە یەکێ لە تاڵەبانییەکانی باداوا، شێخ نەجمەدین ناوێ پەنای لەوێ دان و حەوانەوە... سەگیان زۆر بوو، دەگەڵیان نەهاتن. دوای چەنانێك، لە برسان هەموویان تۆپین... فەلەك (ع. الفلك): هەر یەك لە بەشەکانی (حەوتەوانە، یا نۆیەوانە)ی ئاسمان، کە خولگەیەکی گەردوونە، ستێرناسانی کەونارا بڕوایان وابوو، لە پێنحەمیانە. بەکوردی، "گەردوون"ە... کورد هەرکە تووڕە دەبێ بەر تووك و نزای دەدەن، پێیان وایە ئەو هەموو مەینەتی و دەردی سەریی دنیایە هەموو لە بن سەری گەردوونی چەپگەڕدایە... لە شیعری فارسی و کوردی و تورکی و عەرەبیدا نێوی زۆر بەگلی و گازن لێکرانەوە هاتووە... فەلەك زەدە و مەفلووك، واتە: بەرشەقی زەمانە کەوتگ... گۆبەند (ك): بۆ بەزمی شایی خڕبوونەوە. ڕستەی گۆی خشڵ، گۆڵمەز، گەڕ، لەوان بابەتن. "گۆڤەند"ی زاری کرمانجی تەنێ بەمانای شادی "شایی" دەکاردەبرێ. کورد بەمانای هەرا و گەڕ و گۆڵمەز و چەرمەسەرێی دەکاردەبەن. "کاورا" گۆبەنی نایەوە، بشێوی، هەرای نایەوە، بەزمی نایەوە... "(ف. ك): یا، یان. زاغ (ف. زاگ): عارەب کردوویە بە "زاج" کەسك و سپی و ڕەش و شینی هەن. بۆ قایمکردنی شتی لەق و شل و شەوێق دەکار دەبرێ. بۆ دەرمان و هەتوانی برینان بەکاردێ. کورد دەڵێ: "زاخاوی مێشکی دا، کینایەتە لە خۆشگوزەراندن، تیژکردنەوە، خەنجەر تیژکردنەوە... "دەستی بەزاخا کردم" فریوی دام، گەزەندی گەیاندمێ... شێخ ڕەزا، لە فەلەك تووڕەیە و زۆر جاری دەست بەزاخدا کردووە، نامرادی کردووە. گەردش (ف. گردش): گەشت و گەڕان. سەفا (الصَّفاء): ژیان و گوزەرانی بێ خەوش و مەینەتی، ڕەنگە سەفا و مەرواشی مەبەست بێ. پەیوەستە (ف. پیوستە): هەمیشە. بێ ناوبڕ. تەواف (ع. الطَّواف): بەدەوری کابەدا خولانەوە، زیارەت. شاهید (الشَّاهد): یار. مەقسوود (ع. المقصود): مەبەست. یەساغ (ت. یساق): قانوون. شتێکی بێ فەرمانی میری لە کردن نەهاتگ وا دیارە شێخ ڕەزا لە دیدەنیی حاجی ئاغا بەرەوبڕیی لێ کراوە.

(٢) ئەلف

عەشرەتی جاف

**در وصف عثمان بەگ جاف***

خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا[١]
مێروولە نەچێ چاکە بە گژ قوللەیی قافا
کێ بێ لە دلێرانی عەشایر کە نەچووبێ[٢]
وەك تیری ئەجەل نووکە ڕمی جافی بە نافا[٣]
خوێنڕێژ و شەڕەنگێز و عەدوبەند و تەنومەند
کامی کە گەنە شێرە لە مەیدانی مەسافا[٤]
چونکی ڕەسەنن ورد و درشتیان هەموو جەنگین[٥]
مەی سارییە نەشئەی چ لە دوردا چ لە سافا[٦]
وا بێ غەم و پەروا دەچنە عەرسەیی هەیجا
تۆ ناچییە سەر دۆشەکی بووکێ لە زەفافا
(یأتون الی الأمر صغاراً وکباراً[٧]
یسعون الی الحرب ثقالاً وخفافا)
وەسمان بەگییان ئامیرە، وەختێ کە بڵێ دەی!
دێنە جەوەلان هەروەکو حاجی لە تەوافا
خواهم زخدا آنکە شود دشمن جاهت[٨]
کۆتی لە دەسا، دەس لە ملا، مل لە تەنافا
لوتفێ بکە با (شێخ ڕەزا) بێتەوە گوفتار[٩]
حەیفە بڕزێ تیغی موجەوهەر لە غیلافا

(١) خزمینە: (ت، م)، خەڵقینە: (خ).
(٢) عەشایر: (ت، م)، زەمانە: (خ).
(٣) ئەجەل: (ت، م)، قەزا: (خ).
(٤) کامی کە گەنە: (م. م)، گەندیان هەموو وەك: (خ)، کامیان کە گەنە: (ت)، کامیان کە گەنن: (م).

(٥) چونکی ڕەسەنن: (م. م)، چونکە بەڕەسەن: (خ). چونکە ڕەسەنن: (ت، م).

(٦) دڵ دا: (ت، م)، دوردا: (خ).

(٧) یأتون: (خ)، یبغون: (ت، م)، یصغون: (م، م).

(٨) بکە (رچا) (ت، م).

(٩) لوتفیێ: (ت، م)، ڕەحمیێ: (خ).

(*) کێش: هەزەج موسەممەن ئەخرەب مکفووف مەحزووف

(مغعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)

وەك: "هەرگز نبود سرو بەبالا کە تو داری

یا مە بە صفای رخ زیبا کە تو داری"

خزمینە، خزم (ك.): قەوم، هاوخوێن. ئەم وشەیە ئی وەکو کوڕینە و هەتیوینە و کچەتیمینە و خەڵکینە و هتد... بەکوردی زۆر بەکاردێن .. بۆ خۆی لە ئیعرابدا، "منادی"یە، واتە: هۆ خزمینە، ئەی خزمینە. "ین" کەی پاشگر نییە، بۆ زۆر مانا هاتووە، وەك نێرینە، کەمینە، قوڕینە، دارینە وهتد... لێرەدا بۆ نیسبەت دەکار براوە، واتە: نیسبەت وەباڵ خزم دراوە. "ە"یەکەش ئەوە بۆ (ندا)یە، وەك : "کورە"، "سەگە" و هتد... لە زاری کرمانجیدا "ۆ"یە وەك "کوڕۆ" "لاوۆ". جاف (ك.): بەڕای مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی ئەم ناوە لە "جافان"ەوە کەوتۆتەوە. بەهەشتی د. مستەفا جەواد، کە مێژووی "جاوان العشیرة الکردیة المنسیة"یەی نووسی، یارمەتییەکی زۆری ڕاستیی ئەم بیروبۆچوونەی ڕۆژبەیانیی مامۆستامانی داوە. بێ گومان "جاوان" "گاوان" بووە. عەرەبی عێراقی "گ" و "ق" دەکەن بە "ج" بە "بیك" دەڵێن "بێجات" وەك بێجات تکریت. بە "باب الشرقی دەڵێن باب الشرجی"، بەگرەی ژێر دەمی هەتاو دەڵێن "شەرجی"، بە "قدر" (بەڕۆش) دەڵێن "جدریە" هێندێ جاریش جبووری لای مووسڵ، دەیکەن بە "غەین"، بە "دالْغە" دەڵێن "دالْقە" بە "غیرك" دەڵێن "قێرك" وهتد... دوور نییە "گاوان" بووبێ بە "جاوان". لە نێوان گوندی مەملی (مەنمی؟) و کەوەڵەی گوندەکەی شێخ عەبدوڵلای بەهەشتیی کوڕی سەید عومەری خانەقادا، گوندێك هەبوو "جافان"یان پێ دەگوت، هەموو جافی ڕەوەند بوون، ئەوجا بەدووری نازانم، جاران وشەی "جاف"بە کۆ "جافان" یان گوتبێ و ئەو "جافان"ە بووبێ بە "جاوان" بەڵام ئەمە بەڵگەی لە مێژینەشی گەرەکە .. هەروا وشەی "جوانڕۆ"ش دوور نییە لە "جاوانڕود" کەوتبێتەوە. وەك ڕۆژبەیانی دەفەرموێ جوانڕۆیەکانیش هەر جافن: لە

ئەحمەد ئاغای پشتدەرێی بەهەشتیم بیستەوە کە لە پشت بەرگی کتێبێکی کۆندا نووسراوە: شێخی سەعدی بەڕەچەڵەك جوانڕۆیی بووە. ئەحمەد ئاغا یەك دوو جار بوو بەنمایەنەی پشدەرێ، خەزووری شێخ مستەفای شێخ باقییە، کە دەکاتە برای مەلا مەحموودی مەزناوێ "مەزن ئاوا". ئەحمەد ئاغا فارسیزانی چاك بوو، ئەدەب دۆست بوو، شیعری سەعدی و حافزی زۆر لە بەر بوون. باوەجانییەکانی جوانڕۆ، کە تیرەیەکن لە جاف، لە جوانڕۆ دادەنیشن. جافی مرادیی کەلار و هەڵەبجە (ئەو نێوە سوڵتان مرادی چوارەم ـ ئەگەر هەڵەم نەکردبێ ـ پێی بەخشیون). بەهەموو تیرەکانیانەوە بەجاف لە قەڵەم دەدرێن (بڕوانە کتێبەکەی بەهەشتی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، بابی د. حەسەن و بەهەشتی مستەفا بەگ و عەلی بەگ و فەتاح بەگ و حەمەمین بەگ (مینە جافی شاعیر و حەبە خانم و زێبا خانمی خێزانی حەمە سەعید بەگ و ئیقباڵ خانمی خێزانی سالار بەگی شەهید..) بەڵام عەباس عەزاوی لە کتێبی "العشائر الكردية"دا جافەکانی مرادی دەباتەوە سەر "سەید ئەحمەد"ێك، کە بەئەسڵ عارەبو بووگە؟! باوەڕ ناکەم. جافەکان، تەنانەت هۆزی "بۆرەکەیی"یش هەر بەجاف دەزانن.. جورجی زەیدان لە کتێبی "المدنية الاسلامية"دا لە هۆزێکی گەورەی تورکمانان دەدوێ، کە لە سەردەمی دوامین خەلیفەی عەباسییاندا، موستەعسیم لە پاش بەیات و چەند هۆزێکی دیکە هاتوونە عێراقێ، نێوی "جەف" بووە. هێندێ پێیان وایە جاف سەروکاریان بەو "جەف"ەوە هەس؟ باوەڕ ناکەم .. هۆزی جاف، هۆزێکی گەورەی کوردە و دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران زۆریان لە دەست وەزاڵە هاتبوون! هێزی بڕبڕەی پشتی کوتەك وەشێنی بابان "باوەکانی کاکەیی ـ ئەهلی حەق" جاف بوون. جاف تا ئەم چەنانەش، هەر ڕەوەند بوون، هەموو کوردستانیان بەموڵکی خۆیان دەزانی، گەرمیان و کوێستانیان دەکرد، نێرم دەویست دە بەرابەریاندا بکۆخی.. ئێستاش هەر سەرکێشن.. داود بەگ و برایانی دەگەڵ شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمردا، لە دژی ئنگلیز بوون، شەڕیان بۆ کرد. حەمە پاشا. بەدەستی تورکی عوسمانی، بەدەست کەرەم وەیسییەکانی تیرەیەك لە تیرەکانی جاف لە ناو چوو، هەمەوەند لەسەر ئەوە جاف قڕی کردن.. کاك خوسرەو جافی میعمارییی زۆر زیرەك و ئەدیب و شاعیری دۆستم، ئەو ڕووداوەی کردووە بەماکی داستانێکی زۆر جوان و لەبار، بەسەر دێڕی (پاشایان کوشت). زۆریش سەرکەوتووە و لە ڕوویی مێژوویینەوە لە ڕاو و بۆچوونەکانی د. حەسەن جاف، گەشتەکەی ریچ و

زۆر ژێدەرێن دیکەی سوود وەرگرتووە. کاك خوسرەو، نووسیارێکی تایبەکاری کوردە، مۆرك و شەقڵی زمانی کوردیی خۆی هەیە زۆر کەم لە ئی خەڵکی دیکە دەچێ، نوسخەی ڕەسەنی خۆیەتی. هونەرمەندە، هەست و بیر ناسکە، کەم کەسم دیوە هێندەی ئەو کەلەڕەق و لەسەر حەق و بێ پەنا و پەردە بێ، بەڵام ئاخ و سەد ئاخ... خۆزگەم لە کوردستانی ئازاددا، لە پەنای کوڕە کوڕەی بارزانییاندا پشووی دابا... جاف کەڵەمێردی وەك مەحموود پاشای بلیمەتی هەبووە، کە ترکی عوسمانی و عەجەمی ئێرانێی هێنابووە زاڵە، کە پیر بوو، ئنگرێز، ویستیان ختووکەیەکی بدەن، گوتی.. "تا توانیم نەمزانی، تا زانیم نەمتوانی". ترك دەڵێن.. "دورنەیی گوێزندن أورماق"، کە کینایەتە لە دەست ڕاستیی تیر هاوێژان، عارەویش دەڵێن "أصابه من عینه" خوێنڕێژ (ف. ك. خونریز): پیاوکوژ. شەڕەنگێز (ك.): جنگن، ئاژاوەگێڕ، شەڕهەڵایسێن. ئەم دوو وەسپە بۆ پەسنکردن دەکاربراون، نەك بۆ فراوێتن و داشۆرین. عەدوبەند (ف. ع. ك.): دژمن دەست و پێ بەست، دژمن ترێن. تەنومەند (ف. تنومند): چوارشانە و داروپەردوو ڕوختە. بەخۆوە، توانا، بەزەبر. گەن (ك.): خراپ، بێ پایە، مەیدان (ع. المیدان): لە "ماد ــ یمید" بەمانا فرەوان بوونەوە هاتووە. کورد بۆ ئەوە گۆڕ دەڵێن: "چ لە گۆڕێدا نییە"، "لەو گۆڕە". مەساف (ع. المصاف) (ف. ك): ڕیز، ڕیزی لەشکر. لە جەنگەی شەڕێدا، شەڕ. (ص)ەکە بەعەرەبی بەشەددەیە، ئەوە بۆ کێشی شیعرە. چونکی (ف. ك چواینکە، زاینکە): لەبەر ئەوە، چونکە، چوکە، چون، لەورا. جەنگی (ف. ك) شەڕانی، وازلەشەڕ. ساری (ع. الساري) "سری ــ یسري" بەمانای سیرایەت کردن، تەشەنەکردنە، بەشەو ڕۆیشتن دودە (ف. درد): تڵپە، بەو شتە دەگوترێ دەبن هەر شتێکی شلدا خەست ببێتەوە و ببێ بەتڵپە.. وەك تڵپی شەراب، شەربەت، خۆشاو. ساف (ع. صاف)، " صفا ـ یصفو" بێ خەوش، بێ تڵتە، زوڵاڵ، ڕەوان. لێرەدا شاعیر ئەم تیرەی جافەی بەماکێکی ڕەسەنترین بێ خەوش و تڵپە لە قەڵەم داوە، چ گەن و بێ خێر، چ پاڵەوان و شێریان... واتە وەك مەی بێ غەل و غەشن، سافەکەشی و تڵپەکەشی پیاو مەست دەکا... گەنەکەشیان و پاڵەوانەکەشیان کەسیان دەبەرخۆ ڕاناگرێ. (تەشبیهەکە بەئیستیلاحی بەیان، زیمنییە... ڕەنگە بۆ (حسن التعلیل)یش بشێ...

لا تنکري عطل الکریم من الغنی
فالسیل حرب للمکان العالي

ئەتۆ پیاوی خواردە و دڵاوات لە کن وانەبێ، لێ کەوتووە و ئیدی دەستی نارِوا، ئەدی نابینی سێڵاو بەدوند و ترۆپکانەوە خۆ ڕاناگرێ؟ ئەم جۆرە (حسن التعلیل)ە هێندێك بەقیاسیشی دادەنێن... غەم (ع. الغمّ): خەم. پەروا (ف. ك پروا) باك، ترس، سڵکردن، پرینگانەوە، کۆکردنەوە. عەرسە (ع. العرصة): مەیدان، هەیجا (ع. الهیجاء): شەڕ، گەڕ، جەنگ (شەڕ و گەڕ بەیەك مانان. گەڕناس ، لە شەڕزان، گەرم پێ مەکە، شەڕم پێ مەفرۆشە، بەشێوە ترکیی قازاخی، (ژڕ، جڕ) دەگوترێ. دۆشەك (ف. تشك): ڕایەخێکی نەرم کە لۆکە و خوریی تێ دەئاخندرێ. دەگەڵ لێفەدا دەگوترێ: لێفە و دۆشەك. تەنانەت جلخوار بەکوردی ژێر دەستیان دەڵێن: ″کرد أشك، نەبیلیر یورغان دوشك″؟ بووك (ك. ئار): وەوی. لە زۆر زمانە ئارییەکاندا هەیە... زەفاف (ع. الزفاف): بووك وەگواستن. ئەم لێکچوواندنەی چوونە بەر مەیدانی شەڕ و بووك وەگواستنەوە (تشبیە)ێکی (تمثیلی)یە... واتە لێکچوواندنی دوو شتی لێك دووفاق: یەکێکیان پڕ مەترسی و ئەوی دیکەیان پڕ ئارەزوو و خۆشییە .. مەبەست ئازایەتی و چاونەترسیی شەڕکەری کوڕە ـ کوڕە جافی ئازایە. بەیتی دووەمی کە بەعەرەبییە، بۆ خەستکردنەوەی مانای ئەو ئازایەتی و بێ پەرواییيەیە... دەڵێ: جاف هێندە ئازان، مل لە هەموو کارێکی گچکە و گەورە دەنێن و لە شەڕدا بەقورسیش و بەسووکیەوەش لە دوژمن هەڵدەکەن .. لێرەدا ″تناظر″ێك هەیە... (ثقالاً) بەرابەر، بە الصغار″ و ″خفاقاً» بەرابەر بە ″کباراً″، واتە: بۆ شتی بێ مایە خۆیان شپرزە ناکەن و بۆ شتی گرینگ و گەورە، سەریان پێوە نییە واتە: وەك موتەنەبی دەڵێ: ″وتعظم في عین الصغیر صغارها/ ویصغر في عین العظیم العظائم″، لە بەیتی دوایەدا دیسان دوو دیمەنمان بەرچاو دەکەوێ: یەکێکیان دەکاتێکدا وەسمان بەگی سەرکردەیان، دەیان لێ دەکا و دەڵێ کوڕگەل ڕۆژ ڕۆژی مەردایەتییە و لە منەونەکەون، هەڵمەت بەرن، دووەمیان دیمەنی حاجییان لە کاتی بەدەوری کابەدا خولانەوە بۆ تەوافە. لێرەدا نێو بەندی (مشبە) و(مشبەبە) شتێکی پیرۆزە و لەسەر هەموو موسوڵمانێك، بەجێی بێنێ، ئەو لە دژمن هەڵکردنەش بەو سەنگ و تەرازووە، وا پێویست و ناچارییە. کۆت (ك.): ئەم وشەیەم بەفارسی نەدیتەوە، بەفارسی (کندە)یە. واتە داری ئەستووری قاچی زیندانی. بەڵام لە کن مەنگۆڵ و چینییەکان لە دار دروست دەکرا و هەردوو دەستی زیندانییان پێوە دەبەست و لە ملیان دەکردن. کەچی شێخ ڕەزا (کۆت)ی لە دەستی کردووە و لە ملی شەتەك داوە و ملیشی لە تەناف داوە... دیارە (کۆت)ەکە لە ملیدا دەبێ... نەك پێیدا؟!

گوفتار (ف. ك گفتار): وتار. ئەوە (ئیسمی مصدر)ە، وەك (رفتار)كە بەقیاس دەبێ "رەوتا"ر بێ وەك بڕیار و كردار و (كشتار) كوشتار و هتد... ماناشیان هەروەك مانای (مصدر) وایە، واتە گوتی، ڕۆیشت و بڕی و كوشتی... موجەوهەر (ع. المجوهر) دەبان " بەگەوهەر. تیغ (ف. ك): كێرد. سیكارد، شیر... لێرەدا مەبەست شیری بڕایە. غیلاف (ع. الغلاف) كالان، كێلان، كێلوون، كیفكی شیر. دیارە لێرەش هەر دوو وێنە هەن: یەكێكیان زمانی شێخ ڕەزا و دووەمیان شیری گەوهەردار، دەبان. "شیری دەبانە لە كالاندا ناوەستێ"، "شیری میسرە لە كالاندا ناوەستێ" چون هەردوك بۆ دەكاربردنە... ئەمەش وەڵامی شێخ ڕەزایە، لە لایەن حاجی سەلیم خانەوە:

نەتبیستووە چەند ساڵێ لەمەوبەر لە مەسافا
هەر (جاف)ە چووە، نووكی ڕمی (موكری)ی بە نافا
تیپی (عەدو) وەك پۆلی (قولنگ)، ئەو وەكو شمقارٍ
تێكی دەشكاند یەك یەكە، ئەیخست لە مەسافا
(شێخ) بێ خەبەرە لەم قسە: مەشهوورە لە ئافاق
(حەربە) و (ڕم)ی ئەم بوو، كە بە جێ ما لە غیلافا
هەر ئەو (كوڕە جافە)یش بوو، لە بەر چووپی دلێران
ناڵینی دەهات، هەر وەكو (بووك)ێك لە زەفافا
زۆر كەس لە جەوانانی ئەوان بوو، بە ئەسیر هات
دەست بەستە وو تەن خەستە وو گەردن لە تەنافا
چاك وایە، نەكا مەتحی ئەوان، نەك بڵێ مونسیف:
ئەم مەتحە كە فەرموویەتی (شێخ)، لاف و گەزافا
بۆ مەدحەتیان، كافیە (شێخ)، بێت و نەزەركا
مەعلوومە، كە مەعنای لە لوغەتدا هەیە (جافا)

(٣) ئەلف

**دلبەری بێ وەفا***

ڕۆژێ نەبوو ئەم دلبەرە بێ ڕەحمە وەفاكا
جارێ نەبوو ئەم كافرە شەرمێ لە خودا كا

حـەیـرانـن ئـەتـیـبـا لـە عـیـلاجـی مـەرەزی مـن
لـوقـمـانـی ویسالت مـەگـەر ئـەم دەردە دەواکـا
کـاریٚ کـە خـەم و دەردی فـیـراقت بـە مـنـی کـرد
سەرمـا بـە هـەتـیـو، بـا بـە دەواری شڕی نـاکـا
دێوانـەیـە شەخسیٚ کـە لـە غـەیـری لـەبـی لـەعـلـی
وەك شاهـی سکـەنـدەر تـەڵـەبـی ئـاوی بـەقـاکـا
تـاب و تـەبی ئـاتـەشکـەدەیی هیجری وەکو شەمع(١)
نـەزدیـکـە مـنـیش واریـدی سەحـرایـی فـەنـاکـا
لـەم ڕێگـەیـە تـەقـدیـری ئـەزەل وابـوو کـە ئـێمـە(٢)
پـامـاڵـی جـەفـا بـین و ڕەقـیب سەیـر و سەفـاکـا
ڕۆح و دڵ و دین هـەرسیٚ دەکەم بەزل و نەساری
کـامـی دڵـی مـن گـەر لـە لـەبـی لـەعلـی ڕەواکـا
سەردانـی لـە ڕێی عـەشق (ڕەزا) لازمـە عـاشق
بـۆ یـار سەر و مـاڵـی سوپـەری تـیـری قـەزاکـا

.......................................................................

(١) ئاتەشکەدەیی: (م)، ئاتەشگەدەیی: (ت).

(٢) تەقریری: (ت، م).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەمەن تەخرەب مەکفووف مەحزووف

(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)

وەك "گر خلق بدانند کە من عاشق ومستم

آوازە درست است کە من توبە شکستم"

وەفا (ع. الوفاء): بە پەیمان و گفت و بەڵێن پابەندبوون و بەسەر بردن. وەفا کا: وەفای هەبیٚ، یا هەر وەك فارس و عارەب دەڵێن: "وەفاکند"، "یفی". دلبەر (ف. ك دلبر): دڵبەر، گراوی، ماشقە، ڕوحم (ع. الرحم، الرحمة): بەزە، لوتف، کافر (ع. الکافر): ناخودا، بیٚ باوەڕ، باوەڕ بەخودانەبوو. حەیران (ع. الحیران، الحیرة): سەرسوڕ، واقوڕ. ئەتیبا (ع. الاطباء): بژیشك، نۆشدار. عیلاج (ع. العلاج): چارە، چارەسەر. مەرەز (ع. المرض) دەرد، نەخۆشی، ناساغی. لوقمان (ع. لقمان): بژیشکێکی

حەبەشستانی بووە، لە سەروبەندی داوودا ژیاوە. ویسال (ع. الوصال): بە یار و ماشقە گەیشتن، بەدیداری گراوی گەیشتن. فیراق (ع. الفراق): جودایی. هەتیو (ع. الیتیم): سێوی، هەتی. یەتیم. دەوار (ك): پارچەی سیاماڵ، تاوڵ، ڕەشماڵ، کۆن، کوێن. لێرەشدا دوو دیمەن بەرچاو دەکەون، یەکەمیان حاڵی شاعیر بەدەست جەزرەوەی جوداییەوە دە بەرابەر دوو دیمەندا: حاڵی هەتیوی بێ بەرگ بەدەست سەرماوە، حاڵی دەواری شڕ بەدەست باوە. نێو بەندیش شڕ و شیپڕێوی و مەینەتیی هەر دوو وێنەکەیە... نالی دەڵێ:

هەر چەندە کە ڕووتم بە خودا مائیلی ڕووتم
بێ بەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە

لەب (ف. لب): لێو لەعل (ف. ك لعل): لاڵ، بەردێکی بەقیمەتە. سکەندەر: ئەسکەندەری مەکەدۆنی، کە لە گۆمەلیلە داریوشی بەزاند و ئیمپراتۆریی خەهەخامەنشییانی تێکوپێك نا. ئیزافەی "شاه" ئەباڵ سکەندەر، وەك شاهی نەقشبەند، پاشای کۆر، شاحوسەین. دە شێوەی (عطف بیان)دایە... تەڵەب (ع. الطلب): داوا، خوایشت، خواست. بەقا (ع. البقاء): مانەوە، نەمری، جاویدانی، ئاوی بەقا. واتە: ئاوێکی کە هەر کەسێ وەیخوا هەتا هەتایە دەژی و نامرێ. دەڵێن تەنها حەزرەتی خدر وە نسیوی بووگە. سکەندەر گۆیا، کە دەستی داوەتە جیهانگوشایی، لە دووی ئاوی حەیات گەڕاوە. مەبەست لەم دوو وێنەیە: داواکردنی غەیری لێوی سووری ماشقە و لە دوو ئاوی حەیات گەڕانی سکەندەری مەکەدۆنییە. واتە لێوی سووری ئەو وەك ئاوی حەیاتە... کێی دەگاتێ. تاب (ف.) تاو، گەرمی. تەب (ف. تب): تێ، تا، گەرماییەك کە دە ئاکامی بزووتی خوێن لە لەشی مرۆدا، بۆ دەگەڵ میکرۆبدا ململانێ دێتە گۆڕێ. واتە، تین و تاو. ئاتەشکەدە (ف. آتشکدە): ماڵی ئاگر. ئەو جێی زەرتوشتییان ئاگری تێدا دەپەرستن. وشەی کەدە (کدە) بەزازایی ـ دملی: (کەی)یە. کە دەڵێن کابان، کەیوانۆ، کوێخا: واتە: (کدبانو، کدخدا) خانمی ماڵێ، خێوی ماڵ، خانە خوێ، ماڵخۆ... هیجر (ع. الهجر): جودایی کردن، دووری، فیراق، خۆ لە ئاشقە نەبان کردنی ماشقەی... خولێ بەدوور گرتن. نەزدیك (ف. ك. نزدیك): نزیك. وارید (ع. الوارد): گەیشتوو، گەییك. واتە بمگەیەنێت. سەحرا (ع. الصحراء): چۆڵ، بیابان. فەنا (ع. الفناء) نەمان. ئاشقان زۆر بەدەستی هیجرەوە دەناڵن... لێرەدا (مبالغة، اغراق)ێکی زۆر خەست هەس. دووریی یار ئاورخانەیەکی بەتاووتێ و گەرمی وایە، کە وەك شەم هەر وەختە

شاعیر بەرەو بیابانی فەنا، نەمانێ ببا... بەجارێ تەفروتونای کا. موبالەغەکە لە دوو سەرەوەیە: یەکەمیان تاو و گەرمیی ئاتەشکەدەی دووری، کە وەك شەم وایە وەختە لە ناوی ببا. دووەم: ئەو شەمعە، کە ماشقەیە هەر دەڵێی جەهەنەمی ئاتەشکەدەیە... تەقدیر (ع. التقدیر): چارەنووس. ئەزەل (ع. الازل): بێ سەرەتا، هەوەڵی نییە... پامال (ف. ك پایمال): پێخوست، پێشێل. جەفا (ع. الجفاء): ستەم، جەور، زوڵم، زۆرداری، ڕقیب (ع. الرقیب): مونافیس پێشبڕك، کێبڕك، ڕەقیب، دژمن، ناحەز، نەیار، سەیر (ع. السیر): ڕۆیشتن. بەکوردی بەمانا تواشا کردن و رابواردن و چوونە گەشت و گەڕان و سەیرانە. سەفا (ع. الصفاء): کات بێ خەم و پەژارە بەسەر بردن، دڵ و مێشك سافکردن. بەڕابواردن و سەیرانکردن زاخاودانی مێشك. شاعیر گازن لە حاڵی خۆی دەکا، کە چۆن ئەو هەمیشە هەر ستەمدیتە و نەیار و ڕەقیب دە سەیر و سەفا و ڕابواردندان. بەزل (ع. البذل): دەهەندەیی، دەسبڵاوی، دڵاوایی، نەسار (ع. النثار): بەسەردا باراندنی پارە، زێڕ و گوڵیان بەسەر بووکدا، پاشادا باراند. کام (ف. ك کام): ئارەزوو، مراد، مەبەست، کامی دڵ: بەمراد گەیشتن دەگەڵ یاردا. ڕەواکا (ع. الرَّواء): تێراوکا، یا وشەی "ڕەوا" بەکوردی بەمانای ڕایی، بەجێهێنان، یا بەمانای شیاو و جائز. سوپەر (ف. ك سپر): مەتاڵ، قەڵغان. کۆن. لە چەرمی کەرکەدەن دروست دەکرا، شەڕکەر خۆی پێ لە نووکەنێزە و مەودای شیری نەیار بپارێزێ. قەزا (ع. القضاء): قەدەر، ناگەهان، چاوەنۆڕ نەکراو.

(٤) ئەلف

**بۆ مودیری قزڵجە***

لە تەرەف کێرەوە بەریدی سەبا
بۆ مودیری قزڵجە نامە دەبا
بۆ جەنابی موقەڕڕەبولخاقان
میرم عەلی بەگ، لە ئەنجەبی نوجەبا
میرم، ئایا چلۆنە عیللەتەکەت
باز بە خارشتە بن گونت عەجەبا
ئیحتیاجت بنووسە، عەیبی چییە؟
مەحرەمی ڕازی تۆم بە عەهدی سەبا

سەد تـرِت دا بــە كـوودەكـی لـە گـونـم
ئــەی تـرِت رەعـدو وەی تست رِەشەبـا
دوودمــانـتــان چـرووكـە بـونـیــادی
(بــو قــبـــاحت بـنـم دگـل هــە بــەبـا)
عەبدوورِەحمان بەگی برات فەرمووی
كـە عـەلـی بــەگ بـووە بــە دێڵــەبـەبـا
(هـــذه إرثـــكـــم اخـــاً وابـــا)[1]
خاڵە كوێرەش بە سەراحەت ئەی گوت
كـە عـەلـی بــەگ بـووە بــە دێڵــەبـەبـا
لــە ئــەبــانت ئـیـبـا مـەكـە مـیـرم
ئــابـرِووی خـانــەدان عـەلـی دەیـبـا
گــەر بـــەداری قــزڵــجـە تـێر نـاخـۆی
وەرە بـــا شێخ رِەزا بـــە رِەشتــا بـــا[2]

---

(١) دەبا: (هذا) بڵێ.
(٢) وەرە تا: (ت)، سا وەرە: (م)، وەرە با: (خ). (شێخ رِەزا) (ت).
(*) كێش: بەحری خەفیف، موسەددەس مەخبوون مەحزووف
(فعلاتن مفاعلن فعلن)
وەك: "آه ازین زنـدگی ناخـوش من
وز دل و خاطر مشوَّش من"
تەرەف (ع. الطرف): لا، لایەن. بەرید: (بەعەرەبی كراوی) "برید"ە و لە "بوریدو"ی ئەكەدی و بابلی كەوتووەتەوە، نامەبەر، چەپەر، سەبا (ع. الصبا): بە بایەك كە لە باكووری رِۆژهەڵاتەوە هەڵدەكا، دەگوترێ. فێنك و خۆش. شوعەرای عەرەب زۆریان باس كردووە: "الا یا صبا نجد متی هجت من نجد؟" بای سەبا بەنامەبەری ئاشقان نامێیە. لەبەر فێنكی و ناسكی ئەو كارەیان بەوی ئەسپاردووە. "پەیكی یاران"ە. قزڵجە (ت. قزلجە): قزڵ: بەتوركی بەرِەنگی سوور، بەزێرِ دەگوترێ، وەك قزڵ ایرماق، قزڵ تەپە، قزڵ ئۆردە و هتد... (جە)یەكەی دەبێتە پاشبەندی وشان و مانای "شوێن"

دەدا، وەك (ئاوا) ″ئاباد″ و (ستان) و (ان) لەم جۆرە بابەتانە... یەنگیجە، ″ینیجە (هەڵەبجە) ″البجە″ واتە (الب ئاوا) چاملیجە، (چام ئاوا)، یا (چام جاڕ)، وەك کانی جاڕ و هتد... بەدووری نازانم نێوەکە وەك (البجة) کە ڕەنگە بەناوی (الب ارسلان)ەوە ناونرا بێ، ئەمیش بەناوی (قزڵ أوردە)وە نێونرا بێ. لە کوردستان ناوی داگیرکەرانی دوابڕاوی وەك تەیمەڵزاوا کە تەیمەز، تەهماسب ئاوایە، قەرە چاتان، قەرەتاموور (قەرە تەیموور، قەرە تاغموور، بای حەسن، قزقاپان، قوڵ دەرەسی، (بابا گلدی) هتد... زۆرن. قزڵجە گوندێکە لای پێنجوین. وەك مام هەژار لە هەمبانە بۆرینەدا نووسیویە بەعسی کاولیان کرد. گوندێکی دیکەش بەم ناوەوە لای مەهاباد هەیە. ئەنجەب (ع. الانجب) ئیسمی تەفزیلە. بەمانای خێوی خەسیەت و ئاکاری بەرجەستە و پەسەندتر. نوجەبا (ع. النجباء): نەجیبان. مانای (ئەنجەبی نوجەبا) وای لێ دێتەوە: بەڕێزی بەڕێزان. چلۆن (ك. ع. چلون): لە چ + لون پێك هاتووە. (چ)یەکە ئامرازی پرسیارە، لۆن (ع. لون) ڕەنگ، تەرح، جۆر. بەکوردی ئەو (چ)یە دەگەڵ واژەی دیکەشدا دێ، وەك: چتۆ، چما و هتد.. هەر بەمانای (چۆن)ە. باز (ف. باز): دیسان، هەروەك جاران. خارشت (ف. ك. خارش): خوران. ئەم وشەیە لە هێندێ ناوچەی کوردەواریدا بە (خوارشت، خورشت)یش دەگوترێ. بەفارسی مەسدەری شینیی پێ دەگوترێ. لە فارسیدا نیشانەی مەسدەرییەت هەر (شین)ەکەیە، وەلێ لە کوردیدا، (شت)ە، وەك: بڕشت (بڕست)، ئاڵشت (گۆڕینەوە) ماڵشت (پەرداخ کردن)، ئارایشت (دەم و چاو هەڵگرتن). گون (ك. گون): باتوو، خایە، کینایەیە لە کونی قوون. عەجەبا (ع. عجباً): مەفعوولی موتلەقە، فیعلەکەی حەزف کراوە، واتە (أعجب عجباً)، بەڵام بەکوردی و تورکی تەنانەت بەعەرەبیش و فارسیش بەئامرازی پرسیار دەکار دەبرێ، وەك: ئاخوا، ئایا، گەلۆ و هتد... ئیحتیاج (ع. الاحتیاج): پێویست. عەیب: (ع. العیب): فهێت، شوورەیی. ئەم پرسیارە دە شێوەی (استفهام انکاری)دا هاتووە، واتە: عەبەس نییە. مەحرەم: (ع. المحرم): کەسێکی بەهۆی دۆستایەتی و خزمایەتییەوە لە ڕازی یەکێکی دیکە ئاگا و باخەبەر بێ، هاوڕاز. ڕاز (ف. ك. راز): نهێنی، سڕ. کورد (ڕازونیاز) دەڵێن. عەهد (ع. العهد): سەروبەند، (صباء): ئەگەر بەهەمزەت درێژ کردووە، دەڵێن (صباء). بەڵام ئەگەر گوێ نەدەیە سەرواکان، کە سەبا، دەبا، نوجەبا، عەجەبا و هتد، دەبێ بە (ع. صبا)ی وەخوێنی. تڕ (ك): بایەکی کە بەدەنگەوە لە قوون دەردێ. کوودەك (ف. کودك): منداڵ. تڕی دا لە گونی، واتە کابرا

بەرگەی کاکە لاسی شێخی نەگرتووە و لە تاوان سەد ترِی لە گونی داوە... ئەوجا کە کورد دەڵێن، ترِت بەگونم، یا دەستت بەگونم، یا بەگونتەوە، یا بەگونی بارگینمەوە و هتد... ئەوانە هەمووی کینایەتی تەمسیلین و وێنەی بەرچاو دەنوێنن. رِەعد (ع. الرَّعد) هەورەتریشقە، دەنگ و تریشقەی هەور. تس (ك.): بایەکی کە بێ دەنگ لە قوون دەردێ و بۆنێکی ناخۆشی هەیە. باوبژی زگ، تس. رِەشەبا (ك.) بایەکی توندی رِۆژاوا، بای دەبوور. شاری سلێمانی بەم بایە نامێیە. دیارە لێکچوواندنی (ترِ) بەرِەعد و (فس) بەرِەشەبا، بۆ موبالەغەیە... و تا بێژی کوردەوارییانەیە. وەجهی شەبەهـ لە یەکەمیاندا، دەنگ و لە ئی دووەمدا گرماندنە... دوودمان (ف. دودمان): فامێلیا، خانوادە. چرووك (ك.) قەڵب و بێ نرخ، قرِپۆك. بونیاد (ف.): بنیات، بنەما، بنواشە، بنیچە، بناخە، تەمەڵ، بو (ت. بو): ئەمە. قەباحەت (ع. القباحة): دزێوی، کاری ناشیرین، خەتا، هەڵە، سووچ، گوناهـ. هەبەبا (ك. ت): ئامرازێکە بۆ وریاکردنەوە و تەوکیدکردن دەکار دەبرێ. ها کورە، ها کچێ، وانەکەی، دەنا.. بەبە(ك): بابە. شێخ بەتورکی دەڵێ: بابە ئەوە خەتای من نییە... سەراحەتەن (ع. الصراحهً): بەرِاشکاوی، رِاستەوخۆ، یەکرِاست. دێڵ (ك.): نێوی مێیەتی کە پێش ناوی جانەوەر دەکەوێ: (دێڵەسەگ، دێڵە دێو). بەبا (ك.): مێی نێرخواز، دەڵەوەبا. ئەبان (ع. الاب): بەکوردی و فارسی کۆی (ئەب)، باو، باوك، واتە: باوکانت، ئیبا (ع. الاباء): ئیمتیناع، خۆلێ بە بەرزگرتن، تەرەففوع... (هذه ارثکم اخا واباً): واتە ئەم پیشەیەتان بەبرا و بابەوە، بۆ ماوەتەوە. رِش (ك.): قوون، قنگ ، کوون.

(٥) ئەلف

**بۆ مەستی ئەفەندی***

دەستێکی هەیە (مەستی) ئەفەندی لە کەرەمدا
میهمانی عەزیزی هەیە دائیم لە حەرەمدا
ئەلحەق ژنەکەی موشفیقە دەرحەق بە غەریبان
سەد گانی بە رِۆم دا وو هەزاری بە عەجەم دا(١)
هێند کێری هەتیوانی بە کوزدا چووە داکی(٢)
دەستێکی شکابوو بە منالی لە شکەمدا

بــەر زەربــەتــی کــام کــێری قــەوی کــەوتــووە ئــاخــۆ
بەو دەردە چووە ساعیدی (مەستی) لە ڕەحەمدا[٣]
حــەقــقــا کــە (مــەجــیـدی) کوڕی زۆر تـەبـعـی جـەوادە
سەد گــانــی بــەیــەك لـەحـزە بـە بـێ پـوول و درەم دا
گـەوودا و تـەرەس، مـولـحـید و بـێ دین و مـونـافـیق
مـورتـەددە، نـیـیـە مـیسلـی لـە مسقـۆف و عـەجـەمدا
بۆ سەددی ڕەهی (مەستی) وەکو تەپڵی سکەندەر[٤]
ئــاوازی دەهــۆڵــی کــوزی داکــی لــە حــەرەمــدا
ئەو کێرە زلەی کێ بوو لە کێلانی فەتاح بەگ[٥]
مشتــێکــی کــوتــایــە کــوزی، مشتــێکــی لــە دەم دا

---

(١) (ت، م) صەد گانی بەڕۆم و دوو هەزاری بەعەجەم دا: (خ).
(٢) بەکوزیا: (ت، م)، بە (ق)ی داکیا چووبوو (خ)، بەکوزدا (ف، م.م). هەتیوان کە (ح ـ ن).
(٣) دەبوا: ڕەحیم بڵێ، بەڵام لەبەر کێشی سەروا وای لێ کردووە.
(٤) بۆ سەددی ڕەهی وەك تەبڵی سکەندەر: (ت)، بو سەددی ڕەهی (١) وەك تەپڵی سکندر (م)، بۆ سەددی ڕەهی قافڵە: (خ).
(٥) کێلانی: (ت، م)، گەیلانی: (ج).
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)
وەك: "اندوه تو شد وارد کاشانەام امشب
مهمان عزیز امده در خانەام امشب"
میهمان (ك. ف): میوان. کەرەم (ع. الکرم): دەهندەیی، بەخشش. ئەلحەق (ع. الحق): ڕاستی، بەڕاستی. موشفیق (ع. المشفق): بە بەزە، بە ڕەحم دەرحەق (ف. ع.): لە هەق، دەربارەی. غەریبان (ع. الغریب): بیانی، بێگانە. ڕۆم (ك): تورك. عەجەم (ع. العجم): ئێرانی، غەیری عەرەب. هەتیو: (ع الیتیم): هەتیو و مەتیوی مەبەستە. کوز (ك.): زێ، خەمشە، قوز، جێ شەرمی مێیینە. شکەم (ف.) زگ، سك، منداڵدان. زەربەت (ع. الضربة) زەبر، ساعید (ع. الساعد): لە ئانیشك بەرەوژوور تا شان. قۆڵ. ڕەحەم (ع. الرَّحم):

مندالّدان. بەعەرەبی (الرَّحِم، الرَّحم)ە. حەققا (ع. حقّاً): ئەوژی مەصدەری تەوکیدە لە بۆ فیعلێکی نادیار: تەبع (ع. الطبع): سریشت، سروشت، تەبیات، خۆرسک، زگماک. جەواد (ع ـ الجواد): سەخی، دەهندە، دلاوا. گان (ك): نێوی کاری خێرە. پێم وایە لە (گیان) کەوتووەتەوە. کە دەڵێن "با گانێ بکەین" واتە: با گیانێ دروست بکەین (؟) یان هەر (گاییدن)ە. پوول (یۆ. O,bolos): پارێك لە زێر، زێو، مس، یا هەر مەرتاڵێکی دیکە، کە لە لایەن دەوڵەتێکەوە لێ درابێ. درەم (یۆ. Draxme) یەکانەی دراوی زێو، درهەم. بەرامبەر بەچل و هەشت دنك، یا چل و هەشت جومیانەیە. گەواد (ع. القواد): کەسێکی پێناویی شەهوەترانیی یەکێکی دیکە بکا، جاکەش. دەویت (الدیُّوث)، قورمساغ. تەرەس ت. Teres: دەویت، ئەو وشانە بۆ جنێو دەکار دەبرێن. مولحید (ع. الملحد): خوا نەناس. مونافیق (ع. المنافق): دووڕوو. مورتەدد (ع. المرتدّ) : لە ئاین وەرگەڕای. میسل (ع. المثل): وەك، مانەند، مینان، مسقۆف (دوو. مەسكڤا): مۆسكۆ. ڕووس، مۆسكۆیی. سەدد (ع. السد): گرتن، بەستن. ڕەهـ(ف. راه): ڕێ، تەپڵ (ع. الطَّبل): دەهۆڵ: گەورکی جاڕدانی شەڕ. سکەندەر (یۆ. ئەلیکساندەر): ئەسکەندەری مەکەدۆنی. حەرەم (ع. الحرم): خانووی جێگەی ژنانی ماڵ. کێلان (ك): کالان، کیف. مشت (ف. ك مشت). مست، کۆڵەمست، تۆڵەمست" درێوشە لە کۆڵەمشت دەگەڕێتەوە"

(٦) ئەلف

## هەجوی قازیی کۆیسەنجەق*

شێخ ڕەزا بێت و لەسەر تۆ هەجوی قازیی کۆی بکا
سەیری کە چیی پێ بکا، دۆم بێ و کلاش بۆ خۆی بکا
چونکە غەدری کرد لە (لامیع) شەرتە قازی وا بگێم
هەر گەن و گوویێ لە زگیایە بە جارێ ڕۆی بکا

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: "هرکە چیزی دوست دارد جان و دل بر وی گمارد
هەر کە محرابش تو باشی سەر ز خلوت بر نیارد"
هەجو (ع. الهجاء): فڕ، داشۆرین. کۆی (ت. ك. ف کوی): گوند، دێ، ئاوایی، گەڕەك،

تـاخ. لـێرەدا کـراوە بـەنـێوی شارە خـەڵك زیـرەك و ئـەدەب دۆست و زانـاپـەروەر و خەباتگێڕەکەی حاجی قادری کۆیی و مەلای گەورە، جەنابی مەلا محەمەدی جەلی زادە دە کـتـێبـەکـەی فـۆن هـاممەر، لـە مـەڕ دیرۆکی عوسمـانـی، نووسراوە، کوێە لـە سەردەمی عیسەوییەکاندا نێوی (نوویییە) بووە، واتە: پەیامبەر؟ دۆم (؟) دۆمی، کاوەلی، قەرەج، قەرەجی، تیرەیەکی گەڕۆکە. بەکڵاش و چەقۆ و تەشیە و کەمۆڵە و پنە و کەوچك و شتی لەم جۆرە بابەتە دروست کردنانە بەنامێن. دۆم کڵاش لە زوێڵ و تیلماسکە پەڕۆ و پاتاڵە کۆن دروست دەکەن. هەورامان بەو جۆرە کڵاشە زۆر بەناوودەنگە.. مەبەست ئەوەیە، کە دۆمی کڵاش بۆ خۆی چێتر دروست دەکا. شێخ ڕەزا وا دیارە قازیی کۆیەی بە ئی خۆ زانیوە و نفرێکی بۆ وی بکا، وەك ئەوە وایە دۆمی کڵاشی بۆ خۆ بکا و لامیع: (ع. اللاّمع). درەخشان نازناوی شێخ ڕەزایە. غەدر (ع. الغدر): خراپە دەگەڵ یەکێکدا کردن، زوڵم کردن. شەرت (ع. الشَّرط): گرەو، گرێو، گرۆ، پەیمان، بەڵێن، گفت. لێرەدا گفت و پەیمان مەبەستە.

(٧) ئەلف

**هەجوی شێخ محەمەد عەلی کەرە***

سا بێ زگی خۆت هەڵمەدڕە و مەمرە لە داغا
ئەم قەومە هەموو مردن و تۆ مای لە وەجاغا
لـەولاوە پـەلـێکت لـە زەهـاو پـەل ئـەوەشێنـێ
لـەم لاوە ڕەگـێکت لـە کـنـی ساوجـبـلاغـا(١)

(١) ڕەنگە بڵێی ساوجبلاغەی گوتبا خۆشتر بوو: بەڵام کێش و سەروا ئەوەی گەرەکە. لە سەرێکی دیکەشەوە ئەگەر (ساوجبلاغ) بکەی بەزەرفی (پەل وەشاندن) ئەوە ئیدی زۆر ڕوونە.

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)
وەك: "آن را کـە خدای از قلـم لطف نگـارد
شاید کە بر او زحمت مشاطە نیارد"

سا (ك): ئەوجا، جا، ئینجا، ئەوجا وەرە، جاوەرە، خۆت مەكوژە، جاوەرە داكی لە كەر مەكێشە...

قەوم (ع. القوم): نەتەوە. وەجاخ (ت. اوجاق): كوانوو، بنەماڵە، خانوادە. پەل (ك.)! لاق و دەست. لك، تیرەیەك لە هۆزی پیل" هەر پەلێكی ها وەدەست یەكێكەوە "لە پیلی نەوی" پیلی لە بن دەرێنا" مەبەستی تیرەیە. پەل وەشاندن: هەڵپەكردن، جوولانەوە. مانایەكی دیكەی ئەوەیە كە لاقی بەدەست یەكێكەوەیە و بۆی تێ خستووە و لە تاوان خۆی پێ راناگرێ و هەر لاق دەوەشێنێ. ساوجبلاغ، (صغوق بولاق): ساوجبلاخ، مەهاباد. ڕەگ (ك.): كن (ك.): كن، لا، كونی قوون، قنگ. جاران "كون" بەرێنووسی كۆن (كن)یش دەنووسرا .. كەواسا، وە هەردوو مانا دێ. ئەدی نابینی شێخ ڕەزا لەم بەیتەشدا دەڵێ:

ڕقی هەڵسا سنەیی دێ لە سولەیمانی ئەدا

ئافەرین ئەهلی سنە ئەم ڕقەتان هەر لە "كنە"

دیارە: "ئەم ڕەقەتان هەر لە كونە"ش دخوێندرێتەوە. بەڕواڵەت، لە (پەل) تیر و لە (ڕەگ) خزم و كەسانی شێخ محەمەد عەلییە كەڕەی مەبەستە.

(٨) بێ

**لە فیراقی قادری وەستا خدر***

بۆ نەسووتێ جگەرو بۆچی نەبێ دڵ بە كەباب
بۆچی نەڕوا لە تەنم ڕۆحی ڕەوان میسلی شەهاب(١)
بۆ لەسەر چاوەیی چاو هەڵنەقوڵێ ڕەشحەیی خوێن
بۆچ لە فەووارەیی موژگان نەچكێ قەترەیی ئاب(٢)
بۆ لەبەر ناڵەی نەبێ حەلقەیی حەلقم بە سروود
بۆچ لەبەر گریە نەبێ چەشمەیی چەشمم بەسەراب
موئنیسی ڕۆژ و شەوم باعیسی ئارامی دڵم
ڕۆیی و من لە غەمی كەوتمە نێو بەحری عەزاب
بە وقووعی سەفەری قادری وەستا خدرم(٣)
خانەیی عەیشمی تاڵ كرد فەلەكی خانەخەراب

چەنگ و نەی لێ مەدە موتریب کە لەبەر فیرقەتی ئەو
ڕەنەکی ڕۆحە لە گوێم نەغمە وو ئاوازی ڕەباب(٤)
ساغەری مەی مەدە ساقی! کە لەبەر دووریی ئەو
تاڵە وەك ژەهری هەلاهیل لە مەزاقم مەیی ناب
کاری کردن نەبوو ئەم کارە کە گەردوونی دەنی
کردی، ڕووی ڕەش بێ وەکو بەختی من و پەڕڕی غوراب
ئەی ڕەزا! ڕەنگە لەبەر فیرقەتی ئەو موئنیسە تۆ
قەت نەبی خاڵی وەکو کوورە لە سۆزی تەب و تاب

..............................................................

(١) غوراب (دیوان) شەهاب.
(٢) نەچکێ: (ت. م)، نەتکێ: (خ).
(٣) وەستا خدر: (ت)، استاد خدر (م). بە ئوستاد خدریش بەیتەکە لەنگ نابێ.
(٤) زەنەکی روح دێت: (م) ڕەنەکی ڕۆحە لە گوێم: (ت)، نەفحەیی: (ت، م)، نەغمەیی: (خ).
(*) کێش: ڕەمەڵ موسەمەن مەخبوون مەقسوور
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)
وەك: "امشب ان نیست کە در خواب رود چشم ندیم
خواب در روضەء رضوان نکند، اهل نعیم"

ڕەوان (ف.): ڕۆح. ڕۆحێك کە لە لەش جیا دەبێتەوە و دەڕوا. دیارە مرۆ بڕوای بەدەرچوونی ڕۆح هەبووە و هەیە و بەنەمری دەزانێ. تەنانەت کە خەونان دەبینێ پێی وایە ڕۆح لە لەش دەردەچێ و وە گەشت و گوزار دەکەوێ و شتانێك دەبینێ، یا هەر نەیدیوە و تازە دەیانبینێ... ڕەنگە بیروباوەڕی دۆنادۆن (تناسخ)، کڵێشە گۆڕی هەر لە مەڕا هاتبێ. ئەهلی هەق باوەڕیان وایە. ڕوحی خوا چووەتە کڵێشەی ئیمامی عەلی و پیران و باوەکانی وەك سوڵتان سوحاق و سەرلەبەری باوەکانیانەوە... میسلی (ع. المثل): وەك، مینا، چون. غوراب (ع. الغراب): قەلەڕەش، پەلەوەرێکە بەنیشانەی شوومی و خراپی لە قەڵەم دەدرێ. ڕەشحە (ع. الرشحة) تەڕاوشت، فەووارە (ع.الفوارە): بەتەوژم بەرەو باڵا چوونی ئاو، کوفارە، فیچقە. نافوورەشی پێ دەگوترێ (ئەدی شەدروان شەتڕەوان چییە؟). موژگان (ف. مژگان)! برژانگ، بژۆڵ. چکین (ك.): تکین، دڵوپان. ئاب (ف. آب): ئاو، ئاڤ. ناڵە (ك.): هاوار، ناڵین، ناڵان ـ

ناڵ. حەلقە (ع. الحلقە): ئاڵقە، بازنە. حەلق (ع. الحلق): گەروو، گەڵوو، قوڕگ. سروود (ف. ك): گۆرانیی نیشتمانی.نەشید، گریە (ف. ك) گریان، گرین. چەشم (ف.): چاو، چەو، چەعڤ. سەراب (ع. السراب): تەڕاویلکە، تراویلکە. "کسراب بقیعة یحسبها الظمآن ماءاً ـ ئایەتی قورئانی پیرۆز" زرێ دڕۆزنە... موئنیس رع. المؤنس): هاودەم. باعیس (ع. الباعث): هۆ، مایە، سۆنگە. ئارام (ف. ك): هێمنی. کورد ئەم وشەیە و وشەگەلی وەك "توانا" و "ئاگا" بەهەڵەی باو دەکار دەبەن. ئەمانە وەسفی فاعیلین. یەژین دنیا ئارامە، کاورا توانایە، تۆ ئاگای: نەك دنیا بەئارام و کاورا بەتوانایە و تۆ بەئاگای. چاك وایە (ئارام) بۆ شتەکەی خۆی (توانا) بۆ ئینسانەکە بگوترێ. ئەگەر ویستت بێژی کاورا ئاگای لە هەموو شتێکە، ئەوێ بێژی "ئاگایی لە هەموو چشتێکە "یا ئەگەر ویستت بلێی فلانەکەس بەتوانایە "دەبی بلێی" بەتواناییە، یا بەتوانە یا بەتوانستە" و بۆ (ئارام)یش ئەوێ بێژی "بەئارامی سەرم نایەوە" "ئارامیی دڵم، نەك ئارامی دڵم". بەحر (ع. البحر): دەریا، زەریا، زرێ. عەزاب (ع. العذاب):ئازار و ئێش، دەرد. وقووع (ع. الوقوع): ڕوودان. ئەم بەیتە کەمێ لەنگە. دەبێ بۆ لە لەنگی خۆ بواردن نەختێ (وەستا خدر) بەگرانی بخوێنییەوە عەیش (ع. العیش): گوزەران، ژیان بەسەر بردن. فەلەك. (ع. الفلك): گەردوون. خانە خەراب (ف. ك): ماڵ وێران. چەنگ (ف. چنگ): ئەمرازێکی ژێدارە، حەوت دانە ژێی پێوەیە. نەی (ف. ك): قەمیش، موسیقای بلوێری قەمیش. موتریب (ع. المطرب): سازندە، گۆرانیبێژ. فیرقەت (ع. الفرقة): جودایی. ڕەنەك "ك": ئامێرێکی ئاسنی وەك دەوی هەڕە واسە، ولاخی بەرزەی پێ دەڕنن و پێی پاکژ دەکەنەوە. نەغمە (ع. النغمة) ئاواز. ڕەباب (ع. الربابة): ئامێرێکی سەرەتاییی ژێداری چۆلگەڕانە تاکە ژێیەکی هەس... ساغەر (ف. ساغر): پیاڵە، جامی شەراب، ساقی (ع. الساقي) مەیگێڕ. هەلاهیل (ف. هلاهل): گیایەکی یەك ساڵەییی ژهراویی لە تیرەی ئالاڵان (هەلاڵان) گوڵووکی ورد و ساق و پۆپی هەیە و لە گوێ چۆم و جۆگەلان دەڕوێ. هەلاڵە: بەگوڵی زەردی بۆن خۆشیش دەوترێ. "سۆسن و هەلاڵە و بەیبوون تازە بۆنیان خۆش دەبێ "مەزاق (ع. المذاق) چەش، چێژ، چەشتی. ناب (ف. ناب): لە خەوش و دورد و تڵپە بەدەر. ساف، سویل، زەلال. دەنی (ع. الدنئ) پەست، ئەدی وشەی (دنیا)ش هەر لەمەڕا نەهاتووە، واتە: نزم و پەست و نەوی. سیفەتی مێیە. بۆ نێر (الادنی) دەگوترێ. سیفەتی موشەببەهەیە. لەسەر وەزنی (أفعل ـ فعلی). پەڕ (ف. ك، پر): پەڕی پەڕەوڵ، پەلەور، پەلەوەر. غوراب

(ع. الغراب): قەلەڕەش. پەلەوەرێکە بەنیشانەی شوومی و خراپی لە قەڵەم دەدرێ. کووره (ف. ك، کوره): جۆرێ لە ئاگردان، وەجاغ، کوانووی سەرداخراو بۆ گەرمایی ئانینە گۆڕێ. کوورەی ئاسنگەر کوورەی خشت سوورکردنەوە و هتد... تەب وتاب (ف. تب وتاب): تاو و تێن، گەرمی.

(٩) بێ

**دەردی حەبیب***

دەمکوژێ حوکمە دەزانم بە خودا دەردی حەبیب
وەرە سا بەشقی خودا دەس لە یەقەم بەردە تەبیب
وەرە دەستێ بخەمە گەردەنی بلللوریننت
تا وەکو سفرە لە داخا بدڕێ ورگی ڕەقیب
تالەعم نەحسە دەترسم کە بە ئازاری فیراق
بمرم و ڕۆژێ نەبێ دەوڵەتی وەسڵم بە نەسیب
چاوی فەتتانی ئەتۆ ساحیرە یا جادووگەرە[١]
کە بە عیشوە و ناز ئەدا عابیدی سەد ساڵە فریب
تا لە تۆ دوورە دڵی غەمزەدە ئەی ڕاحەتی گیان
مەشریق و مەغریبە مابەینی لەگەڵ سەبر و شەکیب
بێ فەراز نابێ نەشیب، ئەم قسە تەحقیقە وەلێ[٢]
من لە ڕێی عەشقی تۆ نەمدی بە خودا غەیری نەشیب[٣]
قەیدی زوڵفە لە سەر و سەفحەیی ڕووت سابیتە، یا
شێخ دەگۆڕێتەوە گەر چاوی بە زوڵفەت بکەوێ
خیرقە وو سەبحە بە زوننار و چلیپاو و سەلیب
تاقەتی تاق بووە بێچارە لە ژێر باری فیراق
بکە ڕەحمێ بە (ڕەزا) چاکە تەرەحەحوم بە غەریب
تیبەت و تیبە کە مەمزووجە لەگەڵ زینەت و زیب

---

(١) جادووگەرە یان (دیوان).

(٢) تەحقیقە: (ت، م)، ڕاستە: (خ).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەقسوور

(فاعلاتن، فعلاتن فعلاتن فعلان)

وەك: "از پی تو ز عدم ما بەهـ جهان آمدەایم

نیز برای طرب و لهو و فغان آمدەایم"

حوکم (ع. الحکم): حوکم، ڕەت ناکرێتەوە. حەبیب (ع. الحبیب): یار، خۆشەویست، ماشووق، بەشق (ف. ع. بەعشق): بە ئەوین، بەخۆشەویستی. یەخ (ت. یاقا): بەرۆك. بلوور (یۆ Beryllos): جۆرێ لە شووشەی لە ئاوێتەی سیلیکاتی دوو پۆتاسێوم و سیلیکاتی دوو پلب دروست دەکرێ. ئاوێنەی ساف و دیوەدەر. بللورین نیسبەتە وەبالّ (بلور). ڕەقیب (ع. الرقیب): ئەو کەسەی کە هەمیشە لە داخان چاوی لە هەڵسوکەوتی دوو ئەویندارە، خەنیم. تالع (ع. الطالع): بەخت. نەحس (ع. النحس): شووم. فیراق (ع. الفراق): جودایی، لێك دابڕان. وەسڵ (ع. الوصل، الوصال): بەیەك گەیشتن. نەسیب (ع. النصیب): قسمەت، بەش، نسیو . فەتتان (ع. الفتان): مایە فیتنە، فیتنە ئەنگێز، بشێونە. ئاژاوەگێڕ. ساحیر (ع. الساحر): سحر باز. جادووگەر (ف. ك): بەکەسێ دەگوترێ بەخوێندنی هێندێ وردە دوعا بەسەر هێزی شتاندا ڕابگا. ئەفسوونکار. عیشوە (ع. العشوة): کر و ڕەفتارێکی تایبەت کە ژنێك (وەك ناز و غەمزە و چاوداگرتن و زەردە) بۆ ڕامکردنی پیاوێك دەیکا. عابید (ع. العابد): بەندە، کەسێکی بەنوێژ و ئـایـنـداری بـەنـدەگـیـی خـۆی لـە خـوا ڕاگـەیـەنـێ. فریب (ف.فریب): خـاپـانـدن، هـەڵـخـەڵـەتـانـدن (ف. ع. غـمـزده): بـەرپـێـخـوسـتـی خـەم کـەوتگ. سەبر (ع. الصبر): بوردەباری، سەورگرتن. شەکیبر ف. ك. ولی): بەڵام، بەڵان، بەرام، لێ. لە (لکن)ی عەرەبیرا هاتووە. قەید (ع. القید): پێوەند، سەفحە (ع. الصفحة): لا. ئال، ڕووپەڕە. سابیت (ع. الثابت): چەسپ، پایەدار. تینەت (ع. الطینة): قوڕ، هەش، هڕی. تیب (ع. الطیب): بەرامە. مەمزووج (ع. الممزوج): تێکەڵ، ئاوێتە. زینەت (ع. الطینة): هەر شتێکی کە ماشووق خۆی پێ جوان کا. زیب (ف. زیب): جوانی. خیرقە (ع. الخرقة): پەڵاس، جلکی شڕ، پەڕۆ و پاتاڵ. سەبحە (ع. السبحة): تەزبیە، زوننار (ع.الزنار): پشتێنی عیسەوییان، ڕەنگی سوورە. چلیپا (ئارا. صلیبا): ئەو دارە چەپ و ڕاستەی حەزرەتی عیسایان پێ چوارمێخە کێشا. چەپراز. سەلیب (ع. الصلیب): تاقەت (ع. الطاقة): توانایی، بەرگە گرتنی وشار یا باری ماددی یا سۆزەکی. تاق (ك.): تاق

بوون، جیابوونەوە. تاقەت نەمان، کزبوون، تەرەححوم (ع. التّرحم): بەزەیی، دڵ پیّ سووتان، ڕەحم پیّ کردن.

## (١٠) تیّ
## ئێسترێکی ڕووت و قووت*

میر بە سەد میننەت هەناردی ئێسترێکی ڕووت و قووت
دەست و پا سست و سەقەت ئەندامی هەروەك عەنکەبووت
خاوەنی ناڵێم کە ئالیکی نەداوە موتڵەقا(١)
داویەتی ئەمما وەکو بیستوومە قووتی لایەمووت
پووش لەلای حەڵوایە حەتتا گەر پەڵۆشەی چنگ کەویّ
بای ئەدا، لوولی ئەدا، قووتی ئەدا مانەندی حووت
گەرچی ناتوانیّ ببزویّ هێند لەڕ و کەم قووەتە
دەنکە جۆیێکی نیشان دەی، تا قیامەت دیّ لە دووت
پشتی ڕێش و شانی زامدار و جەدەو بوو، ناعیلاج
چەند قورۆشێکم هەبوو بۆم دا بە نەوت و عەنزەڕووت
مەسڵەحەت وایە هەتا نەیخواردووم بینێرمەوە
زۆر ئەترسم دەفعەیێ قووتم بدا بمکا بە قووت
سەی فەتاحی مەیتەرم ڕۆژێ بە حوججەت لێی نەوی
کلکی دەرهێنا لەبن، ئەمجا بە ئاستەم گوێی بزووت(٢)
گەر قەڵەو بیّ ئەم ئەجننە نێرە تەسخیر ناکریّ
غەیری چەند دەروێشی ڕەففاعی بە زەبری جەلجەلووت
ئەم مەتاعە چاکە هەر لاییق بە حاجی ئەحمەدە
جووتی پیّ بکا تاوەکو چۆن هەردوو لنگی بکا بە جووت(٣)
لاییقی شانی من و شایانی شەئنی تۆ نەبوو
چاوەکەم چیت پیّ بڵێم چارم نییە غەیری سوکووت

---

(١) پێی: (ت، م، خ). خاوەنی ئالیکی ناڵێم پیّ نەداوە موتڵەقا (ت، م، خ).

(٢) ئەم ئەجنە نێرە لێرە تەسخیر ناکرێ: (ت)، ئەم ئەجنە نێرە: (م)، ئەم ئەجننە نێرە: (خ).
(٣) هەروەکو جووت: (ت)، هەروەکو تۆ : (م)، هەروەکو خۆت: (ج)، هەروەکو جووت: (خ).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەقسوور
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)
وەك: "دوش دور از رویت ای جان جانم از غم تاب داشت
ابر چشمــم بر رخ از سـودای دل سیــلاب داشـت"

میر (ع. الامیر): ئەمیر، فەرمانڕەوا. میننەت (ع. المنَّه): منەت. هەناردن (ك.) ناردن، شاندن، ڕەوانەکردن، ڤڕێکرن. سەقەت (ع. السَّقط): پەککەوتە، ئیفتادە، کەنەفت. عەنکەبووت (ع. العنکبوت): جاڵجاڵۆکە، کاکڵەمووشان، پس پسە، پیرۆشك. ئالیك (ع. العلیقة): خوری وڵسات. موتڵەقا (ع. مطلقا): هەر بەجارێ، هەرگیز. قووتی لایەمووت (ع. قوت لایموت): خوری نەمر و نەژی. حەڵوا (ع. الحلوی): هەڵوا، لە شەکر و شیرنی چێکری. پەڵۆشە (ك.): سووتەنییەکی دڕکنە، پۆلووی لێ دەکەوێتەوە، ڕەنگی ڕەشە. مانەند (ف. مانند): وەك، مینا، مینان. حووت (ع. الحوت): نەهەنگ. لەڕ (ك. ف.): لاواز، لەغەر، فارسییەکەی "لاغر"ە. ڕێش (ف. ریش): بریندار، ڕووشاو. عەنزەڕووت: بەعەرەبیکراوی ئەنزەرووتی یۆنانی. ئەنزەڕووت، ماددەیەکی بنێشتەکییە، سوور و زەرد و سپیی هەن. تامی تاڵە. لە درەختێکی دڕکاوی دەردەهێندرێ. ڕەنگە کەتیرە بێ و لە گوێنی گەوەن دەربهێندرێ. مەسڵەحەت (ع. المصلحة): چاك، پێویست، قازانج. دەفعە (ع. الدَّفعة): کەرەت، جار. قووت (ع. القوت): ئەوهەندە خورەی نەمر و نەژی پێی بژیەی. مەیتەر (ف. ك. مهتر): خزمەتکاری ئەسپ و ماین. حوججەت: تەوژم، نهێم. ئاستەم (ك.): کەمۆکەك، بەحاڵ. ئەجننە: جندۆکە، دێو. تەسخیر (ع. التَّسخیر): دەستەمۆ، دەساژۆ کردن. ڕەفاعی: ئۆلێکی دەروێشیی عەرەبانە. دەروێشیان سەریان گەرمە و مار و دووپشك و ئاور دەخۆن. جەلجەلووت: جەلجەلوتییە. دوعای بەپرتەپرتی جادووگەر و کوڵەنانی. لە دیوانەکاندا "تەسخیر ناکرێ" نووسراوە. ئەگەر بەم جۆرە بێ صیغەکە دەبێ (مبنی للمجهول) و فاعلی ناگەرەکە، بەڵام لە غەیری چەند دەروێشی ڕەففاعی، لە ئیعرابدا وەك نەحوییان دەڵێن بەبێگانە دەمێنێتەوە و مانای نابێ؛ "تەسخیر ناکرێ" دەبێ کێ تەسخیریکابێ" مەتاع (ع. المتاع): کەلوپەل، شمەك. لاییق (ع. اللائق): شیاو، شایان، شایستە، لێوەشاوە، لنگی پێ بکا بەجووت: بیتۆپێنێ. یا... شان (ع. الشَّأن): ئەمر،

شکۆ، گەورەیی. سوکووت (ع. السکوت): کپبوون، بێ دەنگ بوون.

(١١) تێ

## تەخمیسی شێخ ڕەزا لەسەر غەزەلی حافز
## بۆ هەجوی مەلا مەعرووف کاتبی بیدایەت*

مەعرووفی بێ دیرایەت گووت کردە ناو بیدایەت
چیت پێ بڵێم قوڕمساغ هەردوو گونم بە دایەت
گونمی بە تر شەهید کرد کێرم ئەکا ڕیعایەت
(زان یار دلنوازم شکریست با شکایەت
گر نکتەدان عشقی خوش بشنو این حکایت)
مەعرووف کە حیزی وەك خۆی نەبوو لە نەسلی ئادەم[١]
ئازاری مەقعەدی بوو، بۆم ڕاکشا لەسەر دەم
مردم ئەوەند سواربم، خۆم کوشت ئەوەندە پیا دەم[٢]
(بی مزد بود و منت هر خدمتی کە کردم
یارب مباد کس را مخدوم بی عنایت)
خاشاکی دەوری دوبری لێم بوون بە ماری هەیجا
کێرم بە سەد مەشەقەت ڕۆیی، گونم نەگونجا
کێرم لە پەشمی پاشی دانەی گونی ترنجا
(در زلف پر شکنجش ای دل مپیچ کانجا
سرها بریدە بینی بی جرم و بی جنایت)
ڕووم کردە سەمتی سمتی، یەعنی مەکانی مەعهوود
ئەرزێکی پڕ نەجاسەت دەشتێکی شەهوەت ئالوود
ڕانیم فەرەس چەپ و ڕاست ڕێگەم نەبردە مەقسوود
(از هر طرف کە راندم جز وحشتم نیفزود
زینهار ازین بیابان وین راه بی نهایت)
دەرمانە سمتی ئەمما نەرمانە وەك بەری دەست
هەر مەنزڵێکی سەد میل، هەر میلە سێ سەد و شەست

(ایـــن راهـــرا نـــهـــایت صورت کـــجـــا تـــوان بست
کش صد هــــزار مــــنــــزل بــــیش است از بــــدایت)
باوکی پیاوێکی چاك بوو، دایکیشی زۆر موقەددەس(٣)
خۆی پـوشت و داکـی خـۆگـێ هـەتـا خـودا بـڵـێ بـەس(٤)
بـۆ نـەخـتـێ ئـاوی شەهـوەت جـەرگـی بـووە بـە قـەقـنـەس
(رنــــــدان تشنــــــه لب را آبـــی نـــمـــی دهـــد کس
گـــویـــا کـــه دل شنـــاسان رفـــتـــنـــد ازیـــن ولایت)

..........................................................................

(١) حیزی وەك ئەو: (ت. خ)، حیزی وەك خۆی: (م).

(٢) مردم ئەوەند سواربم و: (ت)، مردم ئەوەندە بیگێم: (م)، مردم ئەوەند سواربم: (خ). ئەوەندە پیادەم:

(م) ئەوەند پیادەم: (ت، خ).

(٣)باوکی پیاوی چاك بوو: (ت، م)، باوکی پیاوێکی چاك بوو: (خ)، پیاوی چابوو: (م..). زاتێکی: (ت)، دایکیشی: (م).

(٤) خۆی پوشت و: (ت)، خۆی حیز و: (م، م. م)، پوشت و: (خ).

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن موخەللەع

(مستفعلن فعولن مستفعلن فعولن)

وەك: "ای کامکار سلطان انصاف تو بە کیهان

مسعود شـهریـاری خورشید تاجـداری"

دیرایەت (ع. الدارية): زانستن، دەرککردن. ئاوەز، فام. دەویت: گەوواد. گون: خایە، باتوو. ڕیعایەت (ع. الرِّعاية): دڵ ڕاگرتن، بەتەنگەوەهاتن. زان یار دلنوازم و هتد... دەڵێ: سپاسی ئەو یارە نازی دڵ ڕاگرەم بەسکاڵاوە دەکەم. ئەگەر وردزانی ئەشقی ئەم حیکایەتە باش بزانە: لەبەر وەی دڵ گری بۆیەت سپاس دەکەم، بەڵام هەر وەك لە دێڕی دووەمدا بەدیار دەکەوێ، مەبەستی ئەوەیە، کە. لە سۆنگەی وەی هیچ جۆرە خزمەتێکی لەبەر چاو نییە، قەدری هیچ خزمەتێکی ناگرێ، گازنی لێ دەکەم، ئەگەر لە وردەکاریی ئەوین دەگەڕێی، ئەم حیکایەتە باش ببیە" چونکە سپاس و سکاڵا و گازن دوو وشەی لێك دووفاقن، ئەو (ی)ەی لە "شکریست"دایە، لە بۆ تەنکیرە، نەك لە بۆ وەحدەت. واتە سپاسێکی سپاس ئاسایی نەك یەك سپاس. دیارە

هـاوپێوەندیی شێخ ڕەزا دەگەڵ مەعرووفی بێ دیرایەتدا وەك هـاوپێوەندیی ئـاشق و ماشووقێك لە قەڵەم دراوە و ماشووق قەدری ئەو هەموو بۆ تێخستن و بۆ تێبرینە لەبەر چاو نییەو نانکوێرە و لە کاتی گاییندا ڕەحمی پێ نەکردووە و گونی بە تڕ شەهید کردووە، کەچی ئاشق خاتری وەبان چاو گرتووەو کێری دڵە ناسکەکەی ئەوی ڕاگرتووە و لە کاروانە نەکەوتووە... حیز: ترسەنۆك، ژنی داوێن تەڕ، هەتیوی قووندەر، دوودەکی. تەنیا کورد و تورکمان دەیڵێن لوڕ و فارس بە "خیز"ی دەڵێن. بە "هیز"یش دەگوترێ، وەك "هیزە" وریابە، هیزە نەکەی... نەسل (ع. النَّسل): بەرە، ڕەچەڵەك، تیرە. ئادەم (ئا. ع. آدم): باوە ئایەم، یەکەم بابی سەرلەبەری هەموو مرۆی دنیایە. خوداوەند، هەروەکو دینی کوردان (مسحەفێ ڕەش، جیلوە، تەزکەرەی ئەعلای ئەهلی هەق، کە ئەوانە بەبیر و بڕوای کوردان نووسراون، خودا لە گڵی حەوت کێوانی ڕسکاند. کاتێ خوداوەند فەرمانی بەدروستکردنی حەزرەتی ئایەم فەرموو، نە حەزرەتی جبرائیل، نە حەزرەتی میکائیل، نە حەزرەتی ئیسرافیل، چتاقیان ئەو گڵەیان پێ نەهات، دەستیان بۆ گڵی هەر کێوێ لەو کێوانە دەبرد، هاواری لێ هەڵدەستا: هیزە نەکەی، نامەوێ لە گڵی من قوڕی حەزرەتی ئایەم بگرنەوە، دەزانم ئاکامی بە چ دەگا .. هیزە نەکەی .. ئەوژی لە تاو هاوار و فیغان لێی دەگەڕێ. تا نۆرە دێتە سەر حەزرەتی عیزرائیل، ئەو چوو، گڵی هەر حەوت کێوانی هێناو چ گوێی بە هاتوهاواری کێوان نەدا، ئەوەبوو پەروەردگار، لە پاشان کردی بە گیان کێش، قابیزی ئەڕواحی سەرلەبەری تیرەی مرۆی دنیایە. مەقعەد (ع. المقعد): قوون. قنگ ئەوەند: هێند، ئەوەندە. بی مزد بود و هتد... واتە هەر خزمەتێکی کردم، بێ مز و پاداشت مایەوە، خوایە، کەس ئاغای بێ سەلیقەی نەبێ .. واتە خودایە کەس گەورەی بێ ئیرادە نەبێ، یا کەس مەخدوومی بێ پەرۆش نەبێ، واتە کەس مەخدوومی قەدر نەزانی نەبێ .. بەڵام خەیام دەفەرمووێ "نە خادم کسی و نە مخدوم کسی..." خاشاك (ف. ك. خاشاك): خاشاڵ، چیلکە و چاڵ، پڕوپووش. دوبر (ع. الدبر): کونی قوون. هەیجا (ع. الهیجاء): ئەگەر وشە عەرەبییەکەی نیاز بێ، ئەوە بەمانا "شەڕ"ە، بەڵام پێم وایە حەزیا، ئەژدەها، ماری حەوت سەری مەبەستە... مەشەققەت (ع. المشقّة): سەختی و ئاستەنگ. مەبەست لە گون نەگونجان: نەیتوانیوە بۆی بەرێ. پەشم (ف. پشم): خوری، چۆغەی بووزوو. لێرەدا پیاو وێنەی شەکە بەرانێکی دێتە پێش چاو، کە دووگێکی زەلامی هەبێ:

ترنجان: چوونە نێو شتێ بەگێرە و کێشە و زەحمەت. در زلف و هتد... واتە: ئەی دڵ بەپێچ و تاوی ئەو یارە، کە زوڵفی وەکو کەمەندە، مەگەڕێ، چونکە لە پێچ و تاوی ئەو زوڵفەدا سەری هەزاران بێ گوناه و بێ تاوانان دەبینی. واتە ئەوەی بەو گوزەرەدا بگەڕێ، با لە سەر و گیانی خۆی خۆش بێ .. نەجاسەت (ع. النَّجاسة): پیسی. شەهەوەت ئالوود (ف. شهوت آلود): شەهوەتاوی، خلْتانی شاوەت، بەشاوەت پیس بوو. فەرەس (ع. الفرس): ماین. مەقسوود (ع. المقصود): مەبەست. از هر طرف و هتد... واتە: لە هەر لایەکی دۆڵی جودایی یا ئەشق گەیشتم، جگە لە نامۆیی و هەراسان ی چیی دیکەم زێدە نەکرد، ترس و هەراسانیم زیادی کرد .. هیزە لەم چۆل و ڕێگا بێ سەروبەرە وریابە .. جووت بەقێی هەردوو وێنەکە ئەوەسا: کە ناو بۆشاییی قوونی مەعرووف و دەشتی کاکی بەکاکیی ئەشقی وەکو یەکدی لە قەڵەم داوە .. کوڕە ئەو ڕەزا نارەزایە، چیی کردووە .. پیاو کوو خۆی بەو جۆرە لە هەموو بەندوا رییەك ئەوها رەها دەکا؟! ئەمن پێم وایە ڕەزا لە عوبەیدی زاکانیی زۆر بەولاوەترەوە بردووە... مەنزڵ (ع. المنزل): قۆناخ، هەوار، ئەو جێی کاروانی تێ دەهێورێ .. این راهراو هتد... واتە: کوو دەکرێ تەسەووری کۆتاییی ئەم ڕێگایە بکرێ، کە ئەوە هەر لە سەرەتاوەی لە سەد هەزار قۆناخ پترە. مەبەستی ڕێگای ئەشقە و ئەوە ڕێگایە کە ئاخری نییە و کەسی ناگاتێ "کە عشق آسان نمود ولی افتاد مشکلها". شێخ ڕەزا لێرەدا دوو وێنەی پێکەوە شەتەك داون: یەکەمیان ڕێگای بەدوا قۆناخ گەیشتنی ڕێگای ناو قوونی مەعرووف کارێکی هەستەمە و لە کێش و توان بەدەرە. دووەمیان ڕێگای بەدوا هەوار گەیشتنی ڕێی ئەشقە. ئەتۆ لەم گاڵتە بازاڕییە بڕوانە و پێ بکەنە... ئەمن پێم وایە ڕەزا بڕوای بەهیچ شتێك لەم خەیاڵ بازاڕییەی ئەشق نەبووە. بەڵام سەیر ئەوەیە، کە سەرلەبەری لە دنیا ناهومێد و تەمبەڵ، خەونیشیان بەدوا مەنزڵەوە دیتووە و هەر نەشیگەیشتوونێ ..

### (١٢) تێ
### موديرى تەحريرات*

گـــزر دوائـــر أقـــلامـــى ارقـــەسنـــده دوات
مـــدار أهـــل قـــلـــمـــدر مـــديـــر تـــحـــريـــرات

نـگـفـتـمت کـه حـذر کـن ز تـیـغ نـاطـقـهام
فــإنَّ نـــاطــقــتـــی آفة مــــــن الآفات
لەبەر عەبا كە جەبەم كردی ئەی فەقیری خودا
ئەوە عەباكەتە كێرم بە قنگی خۆت و عەبات

................................................................

(*) كێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصڵەم
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)
وەك: "به خاك پای عزیزت كه عهد نشكستم
ز من بریدی و با هیچ كس نپیوستم"

گزر (ت.): دەگەڕێ. دەخولێتەوە. دوائر (ع. الدوائر): جغز. أقلام (ع. الاقلام): خامە، قەڵەم. دوات (ع. الدوات): مەرەكەبدان. دەڵێ: مەرەكەبدانی لە دووی جغزەكانی قەڵەم دەگەڕێ، واتە قوندەرە و قوونی هەمیشە بەدەور و خولی كێردا دەخولێتەوە. مدار (ع. المدار): خولگە، سوورگە. أهل قلم (ع. أهل القلم): خاوەن قەڵەم، دیارە خاوەن كێر مەنزوورە. مدیر تحریرات (ع. مدیر التحریرات): باشكاتبی موتەسەڕیف. دەڵێ مودیری تەحریرات سوورگەی خاوەن قەڵەمە، واتە قوونی بەدەوری كێری خاوەن قەڵەماندا دەخولێتەوە، كەلام لەسەر حەزفی موزافە، واتە: بەدەوری كێری خاوەن قەڵەمدا .. ئەو مەجازە، وەك "واسأل القریة"، واتە "واسأل أهل القریة" وایە .. نگفتمت: پێم نەگوتی. كە حذر كن: كە وریابە. ز تیغ ناطقەام: لە تێخی زمانم. فإنَّ ناطقتي آفة من الآفات: زمانم بەڵایەكە لە بەڵایان. جەب (ك.): بەخشین، لێ بووردن. لە كن فارس "جباكردن" بەمانای لە ڕووی دۆستایەتییەوە، قاوەیێ، جگەرەیەك بەیەكێ لوتف كردنە .. خۆت و عەبات: خۆت و عەبایەكەت، یا وەك هێندێ شێوەزاری كوردی دەیڵێ: خۆت و ئەبات" .. ئەوجا "عەبات"، واتە: "بابت"

(١٣) جیم*

ئەو دەغڵە كە تەسلیمی دەكا شێخ بە هەجیجی
نوقسانی دەكات هەر لە تەغارێ دە كەویجی
ئەسڵ و نەسەبت دۆمە لە من بووی بە هەجیجی
بێ مروەت و ئینساف و حەرامزادە و بیجی

..............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)

وەك: "گر دست دهد خاك كف پای نگارم

بر لوح بصر خط غباری بنگارم"

دەغڵ(ع.): دەسکەوتی گەنم و جۆ. هەیجیجی: جۆرە کوردێکی کوڵەبنەی کۆسەی ناوچەی هەورامانن، بەرەزەوانی و بەسەر پردی لە توولە مێو ڕاهێڵکراوی باریکدا هاتوچۆکەر نامێن، زۆر زیرەکن، تا بێژی موسڵمانن. هێندێ دەڵێن: نێویان لە "حەجیج"ەوە کەوتووەتەوە، کە کۆی "حاج"ە. تەغار (ت. طغار): بەدەفرێکی درێژووکە لە سواڵەت دەگوترێ، کە ماست و دۆی تێ ڕۆدەکەن. تێ دەکرێ. یەکانە پێوانەیەکە هەمبەر١٠کیلۆ (ئەمەش بەپێی یاسای قازان خانی مەنگۆڵ)... دیارە ئەمەی پاشین مەبەستە. لە موکریان ٤ تەنەکەیە، لە کوردستانی عیراق ٦٤ تەنەکەیە، واتە: سی قسناغە... کەویج: عارەب کردوویە بە "قفیز"، کەویز، کەویژ. بەڵام ئەمە بەدرێژاییی ڕۆژگار پێوانەکەی گۆڕاوە٩٠ڕەتڵی عیراقی دەکا ٨ مەکووکە و هاوکێشی ٢٤ کێلەیە. ئەسڵ و نەسەب (ع. الاصل والنسب): بنەچەکە و ڕەگەما. دۆم: هۆزێکی گەڕۆکی کوردە. هەمیشە بەفێڵبازی نامێن. مروەت (ع. المروءة): جوامێری، پیاوەتی، ویژدان. ئینساف (ع. الإنصاف): لە وشەی "نصف"ی عەرەبیرا کەوتووەتەوە، بەمانا: نیوە. لە ئیمامی عومەریان (د.خ) پرسی: عەدل و داد مانای چەس؟ فەرمووی: "إنصاف"، گوتیان: "إنصاف" چەس؟ فەرمووی "دوونیم کردن". گوتیان: "دوونیم کردن چە؟" فەرمووی: "خەڵك" دوونیم کردن. واسە ئەگەرەکە خەڵکەکەت کرد وە دوو بەشەوە، بەشێکیانت پێ قایل کریا، تۆ عادلی، وە دادی، وە ویژدانی، وە ئینسافی... حەرامزادە (ع. ف. حرامزاده): بەچکەی ناشەرعی، مرۆی بەحەرام لە داك بوو، وە حەرام لە (داڵك) زا. بیج (ت.): بیژوو، بیژی، کەسێکی وە حەرامی لە داڵك و باو بوو.

(١٤) دال

**سەرگوزەشتەی خۆی و هەجوی شێخ غەفوور***

ئــەو ڕۆژە کــە تــۆرام و لــە کــەرکــووك سەفــەرم کــرد

مــانــەنــدی عــەقــاریب لــە ئــەقــاریب حــەزەرم کــرد

گـەردوون سنـکـی کـردم و هـێنـامـیـیـە کـۆیـە[1]
مـیـوانـی لـە کـن مـامـە غـەفـووری لـەجـەرم کـرد[2]
ویستـم کـە بـڕۆم بـۆ سەفـەری ڕۆم بـە سیـاحـەت[3]
نەیهێشت و دوو سەد ئەهلی عەمامەی لە سەرم کرد
دانـیشێ، نـەچـێ مـن کـچـی خـۆم مـارە دەکـەم لـێی
ئـەو تـالـیـبـی دونـیـایـە ئـەوا مـوعـتـەبـەرم کـرد
چـورسا لـە بـەرم جـوبـبـە وو فـیسا لـەسەرم فـێس
نـێ فـێسی لـەسەر نـام و نـە جـوبـبـەی لـە بـەرم کـرد[4]
شەش مانگێ بەم ئەفسانە گلی دامەوە لای خۆی[5]
نـەمـزانـی مـلـم بشکـێ تـیـاچـووم، زەرەرم کـرد
وەڵـلاهـی دەکـەم دەرحـەقـی ئـەو بـەڵـکـو زیـاتـر[6]
ئـەو کـارە کـە دەربـاری ڕەشیـدی پسەرم کـرد
کـارم تـەڕ ئـەبـێ ئـەمـوت ئـەگـەر لـوتـفـی بـبـێ مـام
ئـەی لایـقـی ڕیشی بـە خـودا کـاری تـەڕم کـرد[7]
بۆ مـەجتـەهـیدان گـەرچـی مورەخخـەس نییە تەقلید[8]
مـن مـوجـتـەهـیدم، هـاتـم و تـەقـلـیدی کـەرم کـرد[9]
ئـەی گـووی خـلـە بـەو لـوتـفـە کـە ئـەو کـردی لـەگـەڵ مـن
لـەم مـەرحـەمـەت و لـوتـفـە ئـەوا مـن گـوزەرم کـرد
سەد دەفعە گوتم وەختێ کە دیم نەخوەتی قەلبی[10]
یـاڕەب کـە لـەگـەڵ شێخ عـەلـی بـۆچـی شەڕم کـرد[11]
هـەر دەچـمـەوە لای گـەرچـی بـڵـێ هـاتـەوە دیسان
ئـەو خـوێڕیـیـە بـێکـارە کـە مـن لـێرە دەرم کـرد
هـەرچـەنـدە (ڕەزا) بـاعـیسی بـەدنـامـیـیـە عـەودەت[12]
لـەم سووکـی و بـەدنـامـیـیـە سەرفـی نـەزەرم کـرد

---

(١) کۆی: (ت، م)، کۆیە: (م. م)، کۆیە: (خاڵ). سەبوکی: (ت). کۆیە (کش. مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٢) لەچەر (ديوان). لەجەر (كش. مەلا ئەحمەدى دەكە).

(٣) خوستم: (ت)، ويستم: (م).

(٤) نە فێسى لەسەرم ناو: (ت، م)، نەفێسى لەسەر نام و: (خ).

(٥) شەش مانگە (ديوان). مانگێ (كش. مەلا ئەحمەدى دەكە).

(٦) زياتر (ديوان). زيادتر (كش. مەلا ئەحمەدى دەكە).

(٧) تەڕم كرد: (ت)، ترم: (م)، ترم: (خ). تر: بەئيملاى كۆن بۆ (تڕ) و (تەڕ)، هەردووكيان هەروا دەنووسران... (تڕ) بەم شێوەيە بنووسرێ لەتافەتەكەى تێدايە.

(٨) جەوازى (ديوان). مورەخخەس (كش. مەلا ئەحمەدى دەكە).

(٩) هاتمەوە (كش. مەلا ئەحمەدى دەكە).

(١٠) نەخوەت نجلى (كش. مەلا ئەحمەدى دەكە).

(١١) يارەبى لەگەڵ شێخ من بۆچى شەڕم كرد: (م. م) يارەب، كە لەگەڵ شێخ بۆچى شەڕم كرد: (ت)، يارەبى لەگەڵ شێخ عەلى بۆچى شەڕم كرد: (م).

(١٢) لكن (كش. مەلا ئەحمەدى دەكە).

(*) كێش: بەحرى هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەكفووف مەحزووف

(مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن)

وەك: "اندوه تو شد وارد كاشانەام امشب

مهمان عزيز آمده در خانەام امشب"

تۆرام: زيز بووم، تۆريان، كەسێ لە ماڵە باوى، خزمێكى وەدەركەوێ و نەگەڕێتەوە... ئەم وشەيە لە "تار" ەوەش نزيكە، "تەرە" دەگوترێ... "تار"ە كە بەمانای پەرەوازە، هەج بووە. تەرە بووە: ئاوارە بووە... دەگەڵ "طريدة"ى حارەبانيش ڕەنگە خزم بن... خوا بۆ خۆى دەزانێ. مانەند (ف. مانند): وەك، چون، مينا، مينان. عەقاريب (ع. العقارب): كۆڵاژدم، دووپشك، كوژدمە. ئەقاريب (ع. الأقارب): نزيكان، خزم و خوێش. حەزەر (ع الحذر) سڵ، كۆ، پرينگانەوە، ترس. گەردوون (ف. ك گردون): ئەو هەموو ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ و شتانەى لەو كائيناتە بێ سەر و بێ بنە، كە بێ وچان دەگەڕێن و ناسرەون. كورديش وەك زۆر خەڵكى ديكە بەخاوەنى هەموو هێزێكيان زانيوە و تا ئێستاش بەحيسابى وان نەگەڕاوە... سنك: سەمەندۆك، دار ڕستەى ملى سپە. لەجەر (ك.): لاواز، بنێس، لەغەر، كز. ڕۆم: وڵاتى ئەنادۆڵ، وڵاتى يۆنان و كورد و چەندين نەتەوەى جۆراوجۆرە. سياحەت (ع. السَّياحة): گەشت و گەڕان. ئەهلى عەمامە (ع.

**أهل العمائم)**: سەر سپی، مێزەر بەسەر، مەلا و شێخ. موعتەبەر (**ع. المعتبر**): خاوەن وەج و ئیحتیبار. چورسا: چرووسا: ڕزی، چرووسایەوە. ئەم وشەیەم نە لە هەمبانە بۆرینەی هەژار و نە لە فەرهەنگی (کوردستانی گیوی موکریانی)دا، دیتەوە... جوبە (**ع. الجبة**): ئەوەی مەلا لەسەر بەرگەوەی لەبەردەکەن، لە گەرمیان زۆر لەسەر زارە... خیسا: خووسا، شەی هەڵێنا، گلدانەوە: هێشتنەوە، لە کنە خۆ هێشتنەوە. تیا چووم، زیانم کرد... کورد دەڵێ لە مازییان تێداچووە بەسیچکان تێی دێنێتەوە... چەند ڕێکن، یەکیان بۆ زەرەر و زیان ئەوی دیکەیان بۆ (تعویض)ی مام حارەبە. بەزەرەر (**ع. الضرر**): زیان، تیاچوون... ئەمەکارە؟! دیارە شێخ ڕەزا هەر بۆ خۆی دەزانێ چییە... ڕەشیدی پسەر (کوڕی مامی شێخ ڕەزا): تەڕ: باش، چاك، پا.. ئەگەر ئی دووەمیان بە (تڕ) بخوێنییەوە، مانایەکەی ئەوەیە کە شێخ لە کارەکەی پەژیوانە و نەدەبا بیکا. واتە وەك تڕێکم کردبێ وام بەسەرهات، شەرمەسار و خاکەسەر... ئەوها خوێندنەوەش، (لایقیی ڕیشی) شایەتیی بۆ دەدا. موجتەهید (**ع. المجتهد**): مەلای چاك، کە بۆخۆی ئەحکامی شەرع لە قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەر (د.خ) هەڵدێنجێ، بەقسەی ئەم و ئەو ناکا، لاساییی کەسی دیکە ناکاتەوە... لە کن هەر چوار مەزەبە سوننییەکان بابی ئیجتیهاد دوای پێغەمبەر داخراوە... لە بری (اجتهاد) کە تاکە کەسێکی تێدا سەرپشکە، ژمارەیەك لە مەلای چاك و شەرعزانی پسپۆڕ بۆ هەر گرفتێ، بۆ هەر وەرامێکی شەرعی، کۆ دەبنەوە، یا هەموو لەسەری ڕێك دەکەون، ئەوجا ئەوشتە بەڕەوا، بەحەلاڵ دەزاندرێ... بەڕاستی ئەمن ئەوەی سوننی مەزەبانم پێ سەلامەتترە، دیموکراسییانەیە... هەڵەی کەمتر ڕێ دەکەوێ... بەڵام برایانی دوازدە ئیمامی، لەسەر "اجتهاد" مەرجەعیەت، ویلایەتی "فەقیە" دەڕۆن، "لکلَّ وجهةٍ هو مولیَّها... "دیارە "اجتهاد" مەرجی خۆی هەیە من موجتەهیدم و هتد... دەڵێ ئەمن دوو هەڵەم کرد: یەکێکیان موجتەهید بووم و تەقلیدم کرد، کە موجتەهید نابێ تەقلید بکا، دووەم تەقلیدی نەزانم کرد... خلە: کورتەی خەلیلە. گوزەرم کرد: دەستم لێ شت، خۆم لێ بوارد، تێ پەڕیم. نەخوەت (**ع. النَّخوة**): لووت بەرزی، شانازی بەخۆوە، خۆ بەگەورەزانین، نەفس بڵندی. قەلب (**ع. القلب**): دڵ. شێخ عەلی: برای شێخ ڕەزا. خوێڕی: بێکارە و نامەرد. تورك وشەی (خۆرلاماق Horlamak) بەمانا تەحقیر کردنی یەکێکی دیکە بەکاردێنن، بەنموونە: بەچاوێکی کەم لە کورد دەڕوانن. Hor gozle bakmak، بەچاوی تەحقیر نواڕین... بەدووری نازانم لە وشەی (خوار)ی کوردی و فارسی کەوتبێتەوە... چونکە بەکەم تواشاکردن، بەخوار تواشاکردنە...

باعیس (ع. الباعث): هۆ، سۆنگە، دنەدەر، بەدنامی (ف. بدنامی): نێوخراپی، بەدناوی، نێوبۆسۆیی. عەودەت. (ع. العودة): وەگەڕان. سەرفی نەزەر: وازهێنان.

(١٥) دال

**لە باسی باو و باپیری تا ئەگاتە خۆی***

خودا وەختێ کە حەزکا بەندەیێکی خۆی بکا خۆشنوود
لە ڕێگەی دوورەوە بۆی دێ بەپێی خۆی شاهیدی مەقسوود
لە هندستانەوە شەش مانگەڕێ تا خاکی کوردستان
خودا شێخ ئەحمەدی هندیی ڕەوان کرد بۆ مەلا مەحموود
مەلا مەحموودی زەنگنە یەعنی قوتبی دائیرەی ئیرشاد
لە دەوری مەرقەدی هەردەنگی یاهوو دێت و یا مەعبوود
لە پاش ئەو ئەرشەدی ئەولادی شێخ ئەحمەد لە جێی دانیشت
بیعەینیە وەك سولەیمان جێنشینی حەزرەتی داوود
ئیلاهی سەد هەزار ڕەحمەت لە قەبری والید و مەولوود
بە ڕەحمەت چوون ئەوان، با بێینەوە سەر باسی ئەوڕەحمان
فیدات بم ئەی نەتیجەی دوودمانی ئەحمەد و مەحموود
نەتیجە مەقسەدە تالی و موقەددیم شەرتی تەحسیلە[(١)]
ئەوانەی بۆیە ئیجاد کرد خودا تا ئەم ببێ مەوجوود
ئەمێستاش شێخ عەلی نەجلی کەبیری ساحیب ئیرشادە[(٢)]
ئەمیش وەك باب و باپیری لە زومرەی ئەولیا مەعدوود
ڕەزاش لەو نەسلەیە بیبەخشە یارەب چونکە قەت نابێ
گوڵی بێ خار و بەحری بێ بوخار و ئاگر بێ دوود

---

(١) تالی و موقەددیم: (خ)، تالی موقەددەم: (ت)، تالی وقدم (م).

(٢) کە پیری ساحێب ئیرشادە (خ).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: ″درخشان عاشق آن باشد كه شب با روز پیوندد

ترا گر خواب می گردد نه صاحب درد عشاقی″

خۆشنوود (ف. خوشنود): دڵخۆش. شاهیدی مەقسوود (ع. الشاهد المقصود): پیر، یار، زەنگنە: هۆزێكی كوردە، لە كوردستانی عیراق لە دەوروبەری كفری و ئەم بەری سیروان نیشتەجێن، خان ئەحمەدیان نامێ بوو، وەخت بوو لە شەڕی گڵەزەردەدا بەسەرخانە پاشای بەبەدا زاڵ بێ... بە بەری ڕۆژهەڵاتی ڕوخانەشەوە هەن... خۆی گوندی (خان) هەر لەو ناوەیە... تاڵەبانی زەنگنەن. قوتب (ع. القطب): هەریەك لە دوو كۆتاییی خولێنكی گۆ، تەوەرە. هەمە كارە، هەرخۆی حسێو، خاوەن فەرمان. دائیرە (ع. الدائرة): جغز. ئیرشاد (ع. الارشاد): ڕێنوێنی، ڕێبەدێیی، ڕێنمایی. ئەرشەد (ع. الارشد): كوڕە گەورە. ئەڵبەت (ع. البتة): بەقەتعی، بێ گومان، بێ سێ و دوو. فرزەند (ف. فرزند): كوڕ، ئەولاد. والید و مەولوود (ع. الوالد والمولود): باو و كوڕ... نەتیجە (ع. النتیجة): نەتیژە، نەویرە، دەسكەوت، دوودمان (ف. دودمان): بنەچە، بنەما، ماك، بن ماكە. نەتیجە (ع. النتیجة): ئەو ئاكامەی بەپێی مەنتیقی ئەرەستوو، لە دوو ڕستە (قضیَّة ـ تەرح، تێز، كێشە، جێی بگرە و بەردە، یەكلانەبووەوە) پێك دێ، كە بەتێز (قضیَّة)ی یەكەم، بەرایی (مقدَّمە)ی یەكەم گچكە (صغری) و بەتێزی دووەم، بەرایی (مقدَّمە)ی دووەم و گەورە (كبری) دێتە گۆڕێ... تالی (ع. التالي): لەو تێزەی كە لە پاش مقدَّمەوە دێ. وەك: نەوزاد مرۆیە، هەموو مرۆیەك قسان دەكا، نەوزاد مرۆیە... ″نەوزاد مرۆیە″ تەرحێكە هێشتا گریمان ساغ نەبووەتەوە، پێشی دەگوترێ: ″مقدَّمە″ی گچكە، ″هەموو مرۆیەك قسان دەكا″ پێی دەگوترێ ″مقدَّمە″ی گەورە. هەر ″نەوزاد مرۆیەكە″ بۆ خۆی دەبێتە نەتیجە... بەڵام ئەمە چ كارێكی بەرهەمهێن نییە: چونكە ئەتۆ بورهانی شتێكی دەكەی كە پێویستی بەبورهان نییە، واتە نەزانراوێك بەزانراوێك، یا دوو زانراو دەردەست ناكەی؛ هەر لەبەر هەندێكەشە، بە مەنتیقی ئەرەستوو، مەنتیقی فۆرمالیزم ″ڕواڵەتكاری″ چاوشاركێ كاری، بێهوودە، ئەستێور، دەگوترێ... بەڕاستی ئەم مەنتیقە بەدەوراو پشتی شتی زاندراوی پێویست بەبورهان نەكردداً دەخولێتەوە. واتە: ″تەحسیلی حاسڵ″ە .. وەك بێژی ″ئاو بۆ ئاوە؟″ چونكە ئاوە. ″مرۆ بۆ مرۆیە؟″ ″چونكە مرۆیە.″ هتد..... بەڵام مەنتیقی مادە گەراییی دیالەكتیك وا نییە؛ ئەو مەنتیقە شتان لە هەموو سەرێكەوە لێك دەداتەوە، لە نیشانە ڕواڵەتەكانی، لە نیشانە جەوهەرییەكانی شت بەداوێن درێژییەوە، بەرەگ و ڕیشەوە، لێك دەداتەوە،

واتە نیشانە "خواص"ە سەرەکییەکانی شت بەتەجرەبەی هەست و خوست و پاشان بەئەقڵ، بەکردەوە لێك دەداتەوە، ئەوجا ئاکامگریی لێ وەچەنگ دێنێ... قانوونی "نە لەنەکردن بەکار دێنێ" لە نەکردن لە شتێکەوە بۆ دروستبوونی شتێکی بەڵگەنەویست، تازە و نرت و نوێ هەڵدەکشێ، نەك لە شتێکی ئاشکرا و ڕواڵەت و بەدیهییەوە بۆ شتێکی بەدیهیی دیکە... ئەوتۆ بەئەزموون بۆت ساغ بووەتەوە، کە مرۆ بەئاوەز و کاربەخەرج دان و شت دروستکردن لە گیانلەبەرێکی دیکە هاوێر دەکرێ .. ئەوە چ پێویست بەوە دەکا، هەر ئەوە بۆ خۆی ساغ بکەیەوە، ئەوە بۆ خۆی ساغ بۆتەوە... ئەتۆ ئازاری لە شتێکی "نیس" (منفی) شتێکی "هەس" (مثبت) دەردەست بفەرموو... خار (ف.): دڕوو، سترۆو، دڕك. دوود (ف. دود): دووکەڵ.

(١٦) دال

**کەشوفشکردنی بەگ***

لـە بـەگ وا بـوو کـە مـن مـاتم کشی کـرد
کـە مـن هـەستـام و ئـەو دامـا و فشی کـرد
گەهێ سەیرانی سەر گون بوو گەهێ کێر
حـەقـیـقـەت مستـەفـا بـەگ گـەردشی کـرد
دەبـوو بـاوکـی سەگـی نـاو نـایـە ئـەمما
بـەگـی نـاونـا قـوڕمساغ یـاغـنـیشی کـرد

(١) کە ڕوانی ماتە خۆی داما و فشی کرد: (خ)، کە من هەستام و ئەو داما و فشی کرد: (ت)، کە من هەستام و ئەو مات فشی کرد: (م).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەحزووف
(مفاعیلن مفاعیلن فعولن)
وەك: "چنان در قید مهـرت پای بندم
کـــە گویی آهوی سر در کمندم"

مات (ع. مات): مرد، وشەیەکە بۆ لە کارکەوتنی شای شەترەنجی دەڵێن. واتە: لاچۆ، دەنا، دەتخۆم. داما: نەیزانی چ بکا. فشی کرد: خۆی بەدەستەوە دا (لە شەترەنجدا). گەهـ (ف. گه): گا، جار، کاو. گەردش (ف. گردش): مەسخ بوون، گەشت و گەڕان کردن.

مـەبـەسـتـی ئـەوەیـە، مـاکـی خـۆی تـرازانـدووە، لـە بـاوی نـاچـێ. قـورمسـاغ: جـاکـەش، گەوواد، دەویت. یاغنیش (ت. یاغنش): هـەڵە. ئەوە بەتورکمەنی و ئازەرییە. بەتورکیی ئەنەدۆڵی ″Yanliş″ە.

## (١٧) دال

### سەرو و نەی*

سەرو و نەی چین، کە لەگەڵ قـامەتی تۆ بێنە نەبەرد
شەکەری خواردووە نەی، سەرو سەری داوە لە بەرد
گـەر دەلـیـلـێ وەکـو نـوقـتـەی، دەهــەنت نـەبـوایـە
منیش ئینکارم ئەکرد وەك، حوکەما جەوهەری فەرد
لـێی دەپــاڕێمــەوە ئــەی ڕۆحــی ڕەوانم تــو خــودا
چـیـیـە دەرمـانـی دڵـم، پـێم دەڵـێ، لاچـۆ دڵـەدەرد

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەقسوور
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)
وەك: ″امشب آن نیست کە در خواب رود چشم ندیم
خواب در روضــەء رضوان نکـند اهـل نعـیم″
نوختە (ع. النقطة): پنت، خاڵ. دەڵێ: زاری هێند گچکەیە، هەر دەڵێی نوختەیە، پنتە، خاڵە. سەرو (ف. ك.): داری سەرو، دارێکی ڕاست و بێ بەر و گەڵادەرزییە. نەی (ف. ك. نی): قەمیش. نەبەد (ف. ك. نبرد): شەڕ، کارزار، ڕەزم. شەکەری خواردووە و هتد... دوو مـانـای هـەس: یەکیان ئەوەیە، کە قـەمیش شەکری لێ دروست دەکرێ. وەك شەکری خواردبێ وایە. دووەمیان، واتە: ناماقووڵییە، با لە داخان بڕوا سەری خۆی لەبەرد بدا. دەهەن (ف. دهن): زار، دەم، دەو. جەوهەری فەرد: فەیلەسووفانی کۆن لایان وا بووە کە هەموو شتێ دوایی دێ .. ئەم باوەڕەش دە ڕۆژگارێکدا بووە، کە هێمان زانست هێند پێش نەکەوتبوو، کە ئەوڕۆ بەئەقڵ سەلمێندراوە: هیچ شتێ کۆتایی نایە .. قسەی ″الجزء الّذي لا يتجزّأ″ ڕاست نییە .. مەبەستی ئەوەیە کە مەسەلەی جەوهەری فەرد ڕاستە. دیارە ئەمەی هەر لە بەرچاوی کاڵی ماشووقی

فەرمووە، دەنا زانست ئەمەی لەمێژە ساغ کردووەتەوە، کە وەو تەرحە نییە. دڵەدەرد: دڵ ئێشە.

(١٨) ڕێ

**ستایشی ئەحمەد پاشای بابان***

ڕۆژی یەکشەممە کە مەشهوورە بەڕۆژی پازار
مەن بە غار کەوتمە دومبالی کوڕێکی بوڵغار
کوڕ چ کوڕ لێوی وەکو لالەیی حەمرا ڕەنگین
کوڕ چ کوڕ چاوی وەکو نێرگسی شەهلا بیدار
ئەهلی ئینساف بەخودا ڕەنگە چەنەی بشکێنێ
گەر کەسێ بێت و بکا قامەتی تەشبیهـ بەچنار
لە هەمووی سەرفی نەزەر، سمت و سورینێکی هەبوو[١]
نازك و نەرم و لەتیف، میسلی تەلای دەست ئەفشار
خڕ و مەخرووت و مودەوەر سپی و و نەرم و دوونیم
هەروەکو کۆمەڵە بەفرێ کە شەقی کەی بە مشار
کە بەدیققەت نەزەرم کردە سورێن و کەفەڵی
هەردوو چاوم پەڕییە تەوقی سەرم وەك سەگی هار
دەمەنم گرت و وتم: (مرحمت ایت ألماسم!
بویلە یاندرمە بنی آتش عشقك ایلە زار)
(چشم جادوی سیاهت همە بنداست و فریب
همە نازاست و گرشمە همە خوابست و خمار)
(بنی صید ایتدی سنك دیدەیەء آهو روشك
ای سنك دیدەلرك آهوكبی شیر شكار)
ساعەتێ چاك لەسەر و سوورەتی نەحسم فكری
پێی وتم: (حاجی بابا گیت ایشینە یاغمەمی وار!
صاچمە، لاقردیلرك حاصلی یوق، گیت ایشینە
آقچەسز ایتمە صاقن آرزوی بوس و كنار

من کە یەك پارەیی جڵقم لە ئەزەل شك نەدەبرد[2]
پێم وت: ایشتە کمرمدە دولودر یوز دینار
بن بیوك ذات شریفم، وکلا خواجە سییم[3]
طانیور بندەکزی جملەء شاه و خونکار[4]
ئەلغەرەز هێندە درۆم کرد و فسوونم بۆ خوێند[5]
کەوتە دووم هەروەکو دووی گورگ بکەوێ بەرخی هەژار[6]
موختەسەر خۆشە قسە بردمە مەنزڵگەهی خۆم
گرتم و خستم و لێم برد و گونم کرد بە چوار[7]
مۆڵەتم ساتێ نەدا ئەوشەوە تا وەختی سەحەر[8]
کاری خێرم بە مەزەندە گوزەری کرد لە هەزار
وەختی سبحەینێ کە داوێنی فەلەك ئەتڵەسی بوو
هەر لەجێ ڕاستەوە بوو دامەنی گرتم وەکو خار[9]
چنگی وەك پەنجەیی شاهین لە یەقەم قایم کرد
دەستی کردە جەزەع و ناڵەوو هاوار هاوار
زەبتییەی ئەهلی مەحەللە هەموو جەم بوون لە سەرم[10]
پرسیان: مەلخەبەر ئەی زاهیدی سالووس شیعار
پێم وتن لەم کوڕە بوڵغارە بپرسن کە لە من[11]
چیی دەوێ بۆچی دەناڵێنێ وەکو هەوری بەهار
چاکی کرد پەردەیی ناموس گوتی: ″سیکتی بنی،[12]
ویرمدی پارەسنی بویلەمی قانون کبار؟″
دەیدیلر: ″حاجی افندی چوجوغك آقچەسنی ویر
سر کە فاش اولدی دها فائدە ویرمز انکار
یوقیسە آقچەك اگر مهلتك اوچ گون اولسون
حقنی اوچ گونە دك ویرملیسین أی غدار″
ئەمە دوو ڕۆژە کە حەیران و پەریشان دەگەڕێم[13]
کێم هەیە غەیری وەلی نیعمەتی فەرخوندە شیعار[14]

یـەعـنـی هـەمـنـامـی نـەبـی حـەزرەتـی ئـەحـمـەد پـاشا
فەخری دین، کانیی حەیا، بەحری کەرەم کۆهی وەقار[15]
مـەدحـی ئـیـحسانـی بکـەم، عـەدلـی بکـەم فـەزڵـی بکـەم[16]
بــە خــودا خــاریــجــە ئــەوسافــی حــەمـیـدەی لــە شومــار
کــەفــی زەڕبــەخشی کــەوا مــەنــبــەعــی دوڕ و گــەوهــەرە
مـیسلـی بـەحـریّ کـە نـیّ ساحـیـلـی هـەبێت و نـە کـەنـار[17]
تــەبــعــی جــەوواد و کــەریــم هــەروەکــو قــائــانــی دەڵــیّ
(زر بــە قــنــطــار هــمــی بــخشد و اشتــر بــە قــطــار)
تــا وەکــو دەورە بــکــات و بــگــەڕیّ چــەرخــی فــەلــەك
تـا فـەلـەك دێت و دەچـیّ، بێت و بـچـیّ لـەیـل و نـەهـار[18]
بــە مــورادی بــگــەڕیّ شەمس و قــەمــەر، چـەرخ و فـەلـەك
زەفــەر و فــەتحی قــەریـن، بـەخـتـی مـوعین، تـالـعـی یـار
ڕەئـیـی تـۆ بـاعـیسی تـەنـزیمی ئـومـوراتـە بـەڵیّ[19]
بـۆ کـورەی عـالـەمـی ئـیـمـکـان بـووەتـە قـوتـبـی مـەدار

.............................................................

(١) سرین و سرون هەردووکی بەفارسی هەن، بەمانای زل و "ضخیم" و گۆشتی "ضخیم" دەگوترێ. بەڵام لە چوارپایاندا بەمانای (کفل)ە.

(٢) لیرەیەکم...(کش مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٣) خواجم سیم: (ت، م). تورکی ئەستەمبۆل (خواجە سییم) دەڵێن. (خواجە سیم: خواجە سییەم) شێوەی تورکمانی کەرکووك و ئازەرییە.

(٤) بیلوریر(کش. مەلا ئەحمەدی دەکە)

(٥) بۆ خوێند (دیوان). (کش).

(٦) گورگ نەکەویّ .. (ك).

(٧) بردم و گرتم و لێم خست و گونم کرد بەچوار (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

گرتم و خستم و لێم برد و گونم کرد بەچوار (دیوان).

(٨) موهلەتم (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٩) وەك خار: (ت، خ)، وەکو هار: (م).

(١٠) زەفتییە (ر).

(١١) لەو (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(١٢) گوتی (کش، مەلا ئەحمەد دەکە).

(١٣) ئەمە سێ ڕۆژە کە سەر گەشتە وو حەیران دەگەڕێم (دیوان).

(١٤) تەبار (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(١٥) فەخری دین کاتبی بەحر و کەرەم و کۆهی وەقار (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(١٦) مەدحی ئیحسانی بکەم، عەدلی بکەم، عیلمی بکەم (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(١٧) میسلی بەحرێکە نە ساحلی بێت و نە کنار: (ت، م)ن، میسلی بەحرێکە نێ ساحیلی ببێت و نە کەنار: (خ)، میسلی بەحرێ کە نە وەك ساحیلی بێت و نە کەنار: (م. م).

(١٨) چەرخی فەلەك: (م)، چەرخ و فەلەك: (ت، خ) ئەمەیان باوترە هەرچەندە بەئیزافە ڕاستترە، تا فەلەك دەورە بکات بگەڕێ شەمس و قەمەر (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(١٩) دوور نییە (دەڵێی) بووبێ کە دەبێ بەتشبیهـ بەڵام بەئیستیدلال دەبێ بەمەدح لە سوورەتی زەومدا. وەلێ (دیوان).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصڵەن موسەببەغ.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)

وەك: "دوش وقت سحر از غصّە نجاتم دادند

واندر آن ظلـمت شـب حـیاتم دادند"

پازار (ت. Pazar): پشوو، ڕۆژی یەکشەمە، دیارە لە بۆ چوونە بازاڕ و حەسانەوەڕا هاتووە. دومبال (ف. دمبال): دوا، دوو، لالە (ف. لالە): ڕەبەنۆك، مێلاقە. حەمرا (ع. الحمراء): سوور، ئاڵ. شەهلا (ع. الشَّهلاء): ژنی چاومەڕ، چەم مێش، ژنێك کە چاوی ڕەشێکی شین ئاماڵ و جوان بێ. بیمار (. بیمار): نەخۆش، وەك چاوی نەخۆش. سورێن (ف. سرین): کەفەڵ. تەڵای دەستەوشار: زێڕی دەست وشار. دەڵێن: خوسرەوی پەروێز، چنگێ زێڕی نەرم و نیانی هەبووە، گوشیویە زێڕ لە نێوان پەنجەکانیەوە فیچقەی کردووە و بەسەر خەڵکیدا بەشیوەتەوە، کورد بەمەسەل دەڵێن: کاورا تەڵای دەستەفشاری هەس، هەزێنەی لە بن نایە. لێرەدا مەبەست نەرم و نیانیی سمت و کەفەڵی هەتیوە بولغارییەکەیە... لە ئابیساڵی ١٩٦٩دا سەندیکای مامۆستایانی عێراق لە بەغدایێ، دەلەگەیەکیان لە مامۆستایان پێك هێنا، بەدەنگی بانگهێشتی کۆماری بولغارستانەوە بچین، ئەمنیش بە ١٧٠ دیناری خۆم بەگەڵ دەلەگەی

مامۆستایان کەتم، هەر لە بەغداڕا شەرواڵ و مرادخانییەکم لە مەلا عومەری مەلا ڕەشید خواستەوە، مشکییەکی بازگی زەلامم بەسەرەوە بەست، هەر دەتگوت خانی دزڵیم .. بەفڕۆکە لە بەغداڕا فڕیین چووینە بێرووت، هەر ئەوێ ڕۆژێ لەوێڕا چووینە ئەستەمبۆڵ. پاش دوو ڕۆژ بالیۆزخانەی بولغارستان بەشەمەندەفەری ئەورووپا بەڕێیان کردین. بۆسبەینێ سەعات ۷:۳۰ گەیشتینە سۆفیا. نماینەیەکی زۆری دەزگا پەروەرشتەکان و هونەرەکان بەپیریمانەوە هاتبوون و پێشوازییان لێ کردین. بردینیانینە تالارێکی گەورە و لەوێ میواندارییان لێ کردین، نزیکەی ۳۵ کەس دەبووین، هەشت ـ نۆ مێینگەشمان دەگەڵدا بوون... ژنە نیوە فارس و نیوە حارەبێ فرە شۆخمان دەگەڵدا بوو، ئەمنیش هەر لە ڕێوە، بەفارسییە شڕەی خۆم، خۆم تێ هەڵسوی، زۆری پێ خۆش بوو، چاوێریی بکەم، نێوی ئوم سەلام بوو، تا بێژی بەحورمەت بوو... بەڵام ئاخرییەکەی لە ڤارنا بەزۆر و بەخوایشت دانسێکم هەر دەگەڵدا کرد بەڵام لەشەرمان پێوپلی لێك دەئالا... زۆر جێیان گەڕاندین، کارخانەی ئاسنسازی نەما، دیمترۆفی مومیاکراو نەما، ماڵەکەی و کتێبەکانی نەما، مەزرا نەما، لێڕەواری دار هەزار ساڵ تەمەن نەما، سەیرانی ئەسپ و چارەوێ نەما، گوندی سەر جادە و شارێیان نەما، خۆلاسە بۆ زۆر شوێنیان بردین... هاتینە ڤارنا، دە تالارێکی گەشتوگوزاری سەر دەریای ڕەشدا دامەزراین، ژن بەجیا، پیاو بەجیا، ئەو تالارە ئی سەندیکاکانی کارگەران بوو. پارە و دەسکەوتی بۆ خۆیان دەمایەوە. قەڵتاخێکی فەلەمان دەگەڵدا بوو، ئەو دیلمانمان بوو، ئنگرێزییی خاس دەزانی. ئەمنیش باکم بەهیچ نەبوو، لە هەموو شوێنێ تورکێکی بولغارستانیم وە گیر دەکەوت، مەمەدم هەر لە ساڵی ۱۹۵۵وە لە وارشۆوە دەناسی، دیتمەوە .. زۆری ڕێبەدێیی کردم. کێ سەرپالامانە؟ جەعفەر مەتەر، برای، ئامۆزای، ڕەشید مەتەر. کوڕی چا بوو، ڕۆژێکیان گوتیان مەهداوی تەشریفی هێناوە، بەزۆر ڕەپێچەکیان داین، ئیلکەم و بیلکەم دەبێ بەپێشوازییەوە بچین. ئەمنیش نەمکردە نامەردی، چ هەوەسم بەوە نەبزووت، مانم گرت، گوتم ئەمن نایەم .. هەتیوێکی چەقۆکێشی گەڕەکی بابوششێخم لێ ڕاپەڕی:

ــ لیش ما تجي؟

ــ کێفي.

ــ ماکو کێفەك.

ــ لعەد آني أروح لغير مكان...

قسەیەك لە من، قسەیەك لەو، بوو بەشەڕمان. ئەمنیش چوومە كن "كانێف"ی جووی بولغارستانیی چاوساخمان، پێم گوت، لەو برادەرانەم قوتاركە .. مانێفیش جوامێرانە، وەی گەڕاندمە تالارە زەرد. هەر یەكسەر تەلەفۆنم بۆ مەمەد كرد:

ــ وەرە، فریام كەوە، مام حارەب خەریكن دەمخۆن... مەمەد هات، گوتم ئەگەر پێت دەكرێ سەردانێكی دەلی ئۆرمانم بۆ ڕێك ئێخە، زۆر تامەزرۆی ئەو ناوچەیەم، كە شێخ بەدرەددینی كوڕی قازیی سیماڤنا، شۆڕشی لێ لە دژی سولتان محەمەدی چەلەبی هەڵایساند .. دەشمەوێ بزانم ئەو بولغارانە چییان بۆ توركی بولغارستان كردووە؟ مەمەد زۆری پێ خۆش بوو. بۆ سبەینێ دەگەڵ وەزیری هونەر و ڕۆشنبیریدا ڕێك كەوتبوو، ئوتومبیلێكی مەرسیدسی ڕەشیان دەگەڵ شۆفێرێكی توركیزانی گاگاوزدا بەگەڵ ئێخستم، نزیكەی ٧٠٠ لیڤایان دامێ... بەڕێ كەوتین بۆ دەلی ئۆرمان. ئەم ناوچەیە، نازم حیكمەتی شاعیری توركیش گەشتێكی چاكی تێدا كردبوو، داستانی شێخ بەدرەددینی بەهەوای وێندەرێوە نووسیوە. وڵاتێكی سەیر بوو. جووشی زۆر لێ بوون .. حەكایەتی گوندییە دەروێشەكەی شێخ بەدرەددین و بوێركلوو مستەفا و تۆرلاق كەمال و عەرەب شا و عاشق پاشازادە و نەشری و ئیدریسی بدلیسی و دۆكاشی مێژوونووسی یۆنانی و سولتان محەمەدی چەلەبی و بایەزید پاشا و چوارمێخەكێشانی بوێركلوو مستەفا و شێخ بەدرەددین و هاوەڵانیم سەرلەبەر، وەك داستان لە خەڵكەكە بیستەوە .. دیارە سەرهەڵدانەكەی شێخ بەدرەددین وەك لە كتێبی "واردات"مدا خوێندووەتەوە جۆرە سۆسالیزمێكی سەرەتاییانەی سەدەی ٨ی كۆچییە. شتێك بووە لە گوێن "هەقە"ی كن خۆمان .. بڕوای بەزیندووبوونەوەی ڕۆح هەبووە، دەگەڵ مووسەوییەت و عیسەوییەتدا مۆزاییكێكی سەیری پێك هێناوە. بوێركلوو مستەفا، مەسیحی و تۆرلاق كەمال جووبوون.. نازم حیكمەت ئەم سەربوورەی شێخ بەدرەددینەی كردووە بەداستانێكی شیعری، بەندە كە وەختی خۆی لە حەفتایەكاندا كردوومە بەكوردی، تابلۆی زۆر جوانی عابدین دینۆی كورد، ڕازندوویەتیەوە. كۆمۆنیستانی توندڕۆی توركی ئەو سەروبەندە، لە نازم كەوتوونە لیچ و لێوخواردكرنەوە، گۆیا: تووشی بیروبڕوای نەتەوەگەراییی بەرتەسك هاتووە. خوێندەی بەڕێز، پێت وا نەبێ بەندە زۆرم كەیف بەنازم حیكمەت دێتەوە، ئەمن بۆ خۆم دیتوومە، لە ساڵی ١٩٥٥دا لە وارشۆ، لە

فێستواڵی لاوانی جیهاندا لەگەڵ جەنابی مام جەلالمدا دیت .. شیعرەکەی مام هەژارم لەگەڵ د. نوورەددین زازا و قەدری جاندا لە شام کرد بەتورکی، دامێ. زۆری کەیف پێ هات... مام هەژار گوتوویە:

کوردێکم دەوێ چاپك و پتەو
سەفەرێك هەیە بۆم بکا بەشەو
نەهێڵێ تورك و عەجەم بزانن
داگیرکەرانن لە کوردستانن

نازم حیکمەت خوێندیەوە، گوتی: تورك کوردستانی داگیر نەکردووە، ئەوە حوکوومەتی تورك داگیری کردووە... بەڵام پاشان بۆم ساغ بووەوە کە حوکوومەت بەدەستی کێ و بەچەك و بۆمبا و ئاوری کێ کوردی کوشتووە و دەکوژێ؟ ئەدی ئەوە سەدان ساڵە کوردی بێ تاوان بەدەستی خەڵکی گوندیی تورك و عارەب ناکوژرێن؟ ئەدی ئەوە سپای عێراق، خۆ چەپیشیان تێدا زۆر بوون، بۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان مانێکیان نەگرت؟ جارێکیان لە کەربەلا بە د. ڕەحیم عەجینەم گوت: لۆ بە ئەفەسەری هەواخوازانی حیزبی شیووعی ناڵێن، لە دژی ئەو مەرگەساتە مان بگرن؟ فەرمووی ئەمە مەترسیی بۆ "کیانی سپای عێراق هەیە!". کابرایەك دەناسم، خزمی وەسفی تایەر و زەکی خەیریی مەندەلاویی زڕە تورکمان بوو، ئەفسەر بوو، گوارەی کیژۆڵە کوردی لە نێو ژیلەمۆی ئاوری ناپاڵم هەڵگرتبووەوە، دە گوێی کیژەکانی خۆی کردبوون، گوتم، ئەوە چییە؟ گوتی، مال کراد، فۆلکلۆر.... بەڵێ، ئەو برایانە کوردیان بەشایی و ڕەشبەڵەکی کوردان و لەبەن ئەربیل و هاوینە هەوارەکانی کوردستاندا بەبیر دەهاتەوە... مەرحەمەت ایت الماسم (ت. مرحمت ایت): ڕەحمێکم پێ بکە، ئەڵماسەکەم! بویلە یاندرمە بنی و هتد... واتە: بەو جۆرەم بەئاوری ئەشقەوە مەسووتێنە، هاوارم بگاتە کاکێشانی فەلەك. بەند (ف. بند): زنجیر، قەید. فریب (ف. فریب): فریو، خاپاندن، فێڵ کردن. گریشمە (ف. گریشمە): ناز، غەمزە. خواب (ف. خواب): خەو. خومار (ع. الخمار): کەسێ کە مەست بێ و چاوی وەك چاوی خەواڵوو بچێ. بنی صید ایتدی: ڕاوی کردم. سنك دیدەی آهو روشك: دیدەی مامز ڕەفتاری تۆ. ای سنك دیدەلرك هتد... واتە: ئەی ئەو کەسەی کە چاوەکانت وەکو ڕاوکەری شێرانە. نەحس (ع. النَّحس): شووم، بەدووم. فکری: بیری کردەوە. کیت: بڕۆ. ایشتە جاجی بابا یاغمەمی وار؟ چما حاجی بابە تالان و بڕۆیە؟! خۆ بە بەلاش نییە.. صاچمە لاقردیلرك: قسەی بێ سەر و پێ بلاّو مەکەوە، قسەی بێ سەروبەر هەڵمەڕێژە. حاصلی

یوق: بێ هوودەیە. آقچە کتیر: پووڵ بێنە. آقچەسز ایتمە صاقن هتد... بێ پارە و پووڵ، وریابە، ئارەزووی ماچ و خۆ تێ هەڵسوین مەکە. جەلق: قەڵب. ئەزەل (ع. الأزل): بێ سەرەتا، هەر هەبوو. ایشتە کمرمدە هتد... واتە: ئەوەتا پشتێنەکەم پڕە، سەد دیناری تێدایە. وکلا خواجەسییم هتد... واتە مامۆستای وەزیرانم. طانیور بندەکزی هتد... واتە سەرلەبەی شا و سوڵتانان بەندە دەناسن. ئەلغەرەز (ع. الغرض): خولاسە، مەبەست، درێژەی نەدەمێ. فسون (ف. فسون): سیحر. موختەسەر (ع. المختصر): بەکورت و کرمانجی. مەنزڵگە (ف. ع. المنزل): ماڵ، خانە. هەردوو گونی کرد بەچوار: کاکە لاسی لە قون ڕاکردووە و هەردوو گونی هەتیوەکە و گونی خۆی بوو بەچوار. مۆڵەت (ع. المهلة) مۆڵەت: دەرفەت، ساتێ: سەعاتێ. سەحەر (ع. السَّحر): بەرەبەیان، تاریك و لێڵە. کاری خێر: جووتبوون. گوزەری کرد: تێ پەڕی، داوێنی فەلەك ئەتڵەسی بوو: ڕۆژ بووەوە. کینایەتێکی جوانە. بەڵام تەرجەمەی تورکییە. دامەنی گرتم وەك خار: لێم ڕاپەڕی وەك دڕووی نووسنەك بەداوێنمدا نووسا. چەنگ: چنگوڕك. یەقە: بەرۆك. جەزەع (ع. الجزع): نیگەرانی دەربڕین. زەفتییە: (ع. الضَّبطيَّة): پۆلیس. باڵباز، حەیتە. ئەوانەی شیرازەی بەند و نەزمان لە نێو شاری دەپارێزن. جەم بوون: خڕبوونەوە. مەحەللە (ع. المحلة): گەڕەك، تاخ. ما الخبر (ع. ما الخبر): چ باسە، چ هەرایە، چ خەبەرە. زاهید (ع. الزَّاهد): لە دنیا دەستبەردار. سالوس شیعارە: درۆشم و نیشانەی ڕیایی، دووڕوو، مونافیق. چاکی کرد: دای دڕی. سیکتی بنی: گامی. ویرمدی پارەسنی: پارەی گانەکەی نەدا. بویلەمی قانون کبار؟ چما قانون ئەوهایە، مەزنینە. دیدیلر: گوتیان. چوجغك حقنی ویر: هەقی منداڵەکە ئاداکە، پووڵەکەی بدەیە. سر کە فاش اولدی: سر کە ئاشکرا بوو. دها فائدە ایتمز انکار: ئیدی پێ لێ نەنان کەڵکی نییە. یوق ایسە پارك مهلتك اوچ گون اولسون: ئەگەر پووڵت نییە، مۆڵەتت سێ ڕۆژ بێ. حقنی اوچ کونەدك ویرملیسك ای غدار: هەقەکەی دەبێ تا سێ ڕۆژی دیکە بدەی. سەرگەشتە (ف. سرگشتە): تووشی سەرە خولی هاتگ. فرخندە شعار: درۆشم پیرۆز، مبارەك. وەلی نیعمەت (ع. ولي النعمة): کەسی نان بدە، ئەوەی مافی بەخێوکردنی بەسەر یەکێکەوە هەیە. هەمنام (ف. همنام): هاونێو، نێو وەك یەك. نەبی (ع. النبی): پەیامبەر. ئەحمەد پاشا: ئەحمەد پاشای بابان. کان: کانگا، سەرچاوە. کوە (ف. کوه): کێو، چیا. مەدح (ع. المدح): پەسن، وەسپ. احسان (ع. الاحسان): چاکە و پیاوەتی. علم (ع. العلم): زانست. فەزڵ (ع. الفضل): ئەوەی لە

خەڵکی دیکەدا نییە، زێدە، ئەردەو. خاریجە لە شومار: لە حەد بەدەرە، لە عەد بەدەرە، لە ژمارە نایە. ئەوسافی حەمیدە: ئاکارە پەسندەکانی. کەف (ع. الكف): بەری دەست. زەرپەخش (ف. زربخش): زێڕبەخش، مەنبەع (ع. المنبع): سەرچاوە، کانی. مثل (ع. المثل): وەك. مینا. بەحر (ع. البحر): دەریا. ساحیل (ع. السَّاحل): قەراخ، گوێ، ڕۆخ. تەبع (ع. الطبع): تەبیات، زگماك، خۆڕسك. جەواد (ع. الجواد): دڵاوا، دەهندە، سەخی تەبع. قائانی: میرزا حەبیب موتەخەللیس بەقائانی، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٢٢ی مانگیدا، واتە لە سەروبەندی فەرمانڕەوایەتیی فەتحعەلی شا، لە شیراز لە دایك بووە. باوی، میرزا محەمەد عەلی شاعیر بوو نازناوی گوڵشەن بوو. بەبنەچەکە لە تیرەی زەنگنەن، کە لە عیراق و فارس هەن. قائانی یەکەم شاعیرێکی ئێرانییە کە فەرنسزیی خوێندووە لە دوای سائیب، ناسراوترین شاعیرانی سەروبەندی سەفەوی و قەجەرە. شیعری بەوەسفی خۆڕسك دەست پێ کردووە:

"بنفشه رسته از زمین بطرف جویبارها
و یا گسسته حور عین ز زلف خوش تارها
ز سنگ اگر ندیداست چسان جهد شرارها
به برگهای لاله بین میان لالەزارها
که چون شراره می جهد ز سنگ کوه سارها"

قنطار (موعه. یۆنانی): پۆستی گای، کە لە زێڕ تەژە کرابێ. ١٢٠٠ ئوقییەیە .. یا ١٢٠ ڕەتڵ. اشتر (ف. ك. اشتر): حوشتر، وشتر، قەتار (ع. القطار): ڕیزی بارەبەر، قافڵە وشتر، کاروان، قەتار، هەمی بخشد: دەبەخشێ. لەیل و نەهار (ع. اللیل والنَّهار): شەو و ڕۆژ. زەفەر (ع. الظَّفر): سەرکەوتن، زاڵبوون. فەتحی قەرین: وڵات گریی دەگەڵدا جووت بێ، سەرکەوێ. بەختی موعین: بەختی هەمیشە یاریکار بێ. تالعی یار: یەغباڵی یار بێ، خۆی پیادە و بەختی سوار نەبێ. تەنزیم: ڕێکخستن. ئوموورات: حاڵ و باڵی دنیا. کوڕەیی عالەم: گۆی زەوین. قوتبی مەدار: تەوەرەی خولگە.

## (١٩) ڕێ

## ئازاییی عەشرەتی تاڵەبانی*

بـارەکـەڵـڵا ئـافـەریـن ئـەی عـەشرەتـی نـوسرەت شیـعـار
مـەردی مـەیـدان شێری جـەنـگـاوەر هـوزەبـری کـارزار

چـوار عـەشیـرەت: کـاکـەیـی و وەنـد و جـەبـاری و داودە
ئـیـتـتـیـفـاقـیـان کـرد و هـاتـن چوار سەد و پـەنجا سوار
هەر بە ئەووەڵ حەملە چەندتان کوشت و چەندتان سەربڕی
چەندی کەیشیان لێ بەجێ ما، بوونە توعمەی موور و مار
ئـێستـەکـەش لـەو دەشتـە شەڕیـانـە لـەسەر لاشەی ڕزیـو[1]
کـەرگـەس و شاهین و گـورگ و مـامـەڕێوی و کـەمـتـیـار
بـەیـنـی بـەیـنـەڵـلا عـوبـەیـدی فـیـلـەتـەن کـارێکـی کـرد
هـیـچ کـەسێ نـایـکـا مـەگـەر حـەیدەر بـەزەربـی زولـفـقـار[2]
هـەر سوارێ فـیـرقـەیـێکـی ڕاڕفـانـد و دایـە پـێش[3]
کـەوتـە سەر کـوێخـا مـەخـۆل عـەبـدولـوەهـابـی نـامـدار
لێی خوڕی وەك شێری غوڕڕان، سا مەڕۆ، ڕاوەستە بۆم[4]
ئـەی تـڵـیشی دایـە ڕێزاورت بـە ڕیشی "یـادگـار"[5]
چـەکـمـەیـێ سووری لـە پـێدا بـوو بـە جـارێ زەردی کـرد[6]
تس لـە مـلـیـۆن تـێ پـەڕی کـرد تـڕ گـەیشتـە سەد هـەزار[7]
یـەك لـەیـەك ئـازاتـرن تـەعـریـفـی کـامـێکـتـان بـکـەم!
دەك فـیـدای دەست و تـفـەنـگت بم سولالـەی شێخ ستـار
شاسوارێکـی وەکـو تـۆمـان هـەبـا بـاکـمـان چـیـیـە[8]
تـۆش لـە حـەقـقـەتـدا سوارێکـی وەکـو ئـەسفـەنـدیـار
ئـەم قسانـە گشت مـەجـازن گـەر حـەقـیـقـەتـتـان دەوێ
بـەزلـی نـان و هـیـمـمـەتـی پـیـرانـە بـۆتـان کـەوتـەکـار
جـائـیـزەم مـەتـڵـووبـە ئـەم مـەدحـەم بـە خـۆڕایـی نـیـیـە
هـورتمانـیش بـێ (ڕەزا)م گـەر هـیـچ نـە نـێرن یـا ستـار!

---

(١) ئیستەکەش (دیوان) وێستەکەش (کش).

(٢) نای کا (دیوان) ناکا (کش).

(٣) ڕاڕفاندو (دیوان) ڕاڕفاندوو (کش).

(٤) غوڕڕان (دیوان) غوڕڕە (کش).

(٥) ئەی تلّیشی دایە ڕێزبارت یاریکار (کش).
(٦) بە جاریّ (دیوان) بە جارێك (کش).
(٧) تس لە ملیۆن دان: تڕ گەیشتە سەد هەزار (کش).
(٨) شەهسوارێکی وەکو تۆم هەبا باکمان چییە.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەقسوور.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان).
وەك: "باز بـالای تو مـا را در بلا خـواهد نهاد
دود زلفت آتشی در جان ما خواهد نهاد"

بارك الله: خودا پیرۆزتان کا، مبارەك بێ، بەرەکەتتان تێ ئێخی. ئافەرین: بتڕەژم، دەسخۆش. نوسرەت شیعار: دروشم هەمیشە سەرکەوت. هوزەبر (ف. هزبر): شێر. کارزار: شەڕ. حەملە (ع. الحملة): هەڵمەت. کەلەش: کەلاك، لاشە. توعمە (ع. الطُّعمة): چەشکە، چەش، خۆراك. کەرگەس: سیسارکە کەچەڵە، سەرگەڕ. حەیدەر: ئیمامی عەلی (د.خ). زولفەقار: شیری دووفلیچقانەی ئیمامی عەلی. غوڕڕان: بەنەعرەتە لێدان. تلّیش: پارێکی دادڕاو، پارچەیەك. ڕێزوار: لە پیرە مێیینەکانی کاکەییانە. چەکمە: جزمە، پێڵاوی تا ئەژنۆ. وشەکە تورکییە. زەردی کرد: لە ترسان گووی بەخۆدا کرد و چەکمەکەی زەرد کرد. تس: فس، بایەکی کە لە سۆنگەی باوبژی زگەوە لە قوونڕا دێتەدەر، بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەس .. تڕ: براگەورەی تسە. ئەسفەندیار: پاڵەوانی نامێی ئێران. واتە: بەپیرۆزی ڕسکاو. کوڕی گوشتاسب، پادشای کەیانییان. بەزلی نان: نان بدەیی. یا ستار! یا واتە یا شێخ ستار، یا هەڕەشەیە، واتە خوا هاوار!

## (٢٠) ڕێ

### هەتیوێکی سنەیی*

دوێنێ شەو بۆ دەفعی حاجەت چوومە حەممامی غەفوور
سادەڕوویـێکـی تـیـا بـوو سمت و ساقـی وەك بـلـوور
جێیـەجێ هەر وەك موهەندیس دامە بەر مەددی نەزەر
هەر لە تەوقی سەریەوە تا نووکی پەنجەی خوار و ژوور
وەك سەگی برسی بەحەسرەت سەیری دووگی مەڕ بکا
سمتی سیمینیم بەچاوگرت تێی فکریام دوور بەدوور[١]



شوکور مستەفا (٥)

عـاقـیـبـەت شەوق و هـەوەس پـەردەی حیـجـابـی پـارەکرد
خـۆم کـوتـا دێوانـە ئـاسا بـۆ سەراپـەردەی حـوزوور
هـەر کـە فـەرمـووی مـەردمـی شاری سنـەم، یـاربـابـلـم
هـاتە گەردش بێ تەوەققوف وەك عەموودی لەندەهوور

..............................................................

(١) تێی فکریم (ت). فکریام: سنەییانە و گەرمیانانە و جافانەیە...

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەقسوور.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)

وەك: "من ز گوش او بدزدم حقلەء دیگر نهان

تا نداند چشم دشمن ور بداند گو بدان"

دەفع: پاڵ پێوەنان، لابردن. واتە: دەست بەئاو گەیاندن و سەراوکردن. حاجەت: پێداویست. کینایەتە لە دەست بەئاو گەیاندن. حەممام: گەرماو. سادەڕوو: لووس، بێ تووك. سمت: لاقوون، ئەستوورایی بەر کەمەر. ساق: بەلەك، لە موکریان بەپووزەوانە دەگوترێ، پووز. بللور: وشەیەکی لە یۆنانیرا بەعەرەبی کریاگە. جۆرە شووشەیەکە، لە ئامێتەی سلیکاتی دوو پۆتاسیۆم و سلیکاتی دوو پلەمپ پێك هاتبێ، نەینکی ساف و بێ گەرد. موهەندیس: ئەندازە گر، دەڵێن: ئەم وشەیە لە ئەندازەی پەهلەویرا هاتووە، بەمانای پێوانە، میقیاس، میعیار، عەیارە، یا هەر شتێکی وەك گەز، مەتر، میل، فـەرسەخ و هـتـد... هـاتـووە و عـەرەب "هندسة"ی لـە ئـەنـدازە وەرگـرتـووە... یـا بەپێچەوانەوە؟! مەددی نەزەر: هەتەری چاو، مەودای دیتن. تەوقی سەر: تەپڵەسەر، نووك، دوا پنتی هەر شتێکی وەك ڕاستە و هێڵ و نووکی قەڵەم، نووکی نێزە، نووکی ڕمب و هتد... خوار و ژوور: سەراپا. حەسرەت: عەزرەت، ئەڵها، تاسە، حەز، تامەزرۆ. دووگ: دونگ، دمی مییەر، مەڕ، مێش، مێشن. سەمت: لا، ئال، تەرەف. حیجاب: هەر شتێك کە ببێ بە لەمپەر لە دیتنی شتێکی دیکە، پەردەدار. پارەکرد: لەت لەت کرد، دادڕی. شەوق و هەوەس: ئارەزوو. خۆم کوتا: تەکانم دا. دێوانە ئاسا: وەك شێت، سەراپـەردە: دیـوانـخـانـەی فـەرمـانـڕەوا. حـوزوور: لـە حـەرەمسەرادا حـازر بـوون، بەحوزوور گەیشتن. مەردم: خەڵك. یاربابل: ئەوەی جوان نییە ناوی بێڕی. گەردش: بزووت، هەرەکەت. تەوەققوف: وەستان. عەموود: ئەستووندەك، مرۆی درشت ئەندام و کەتە و بالآبەرز.

(٢١) ڕێ

## هەجوی کاکەیی*

بـابـان بـاشنـده بـر بـاطـمـان یشیل وار
إمــام الــقــوم في تـقسیـم شلـوار
هــەتــانــە هــەروەکـو بـیستـوومـە بـەزمـێ
لــە ساڵــێکــا شەوێ یــارانــی دیــنــدار
دەبـەستن حـەلقـەیـێ وەك عیـقدی پـەروین
لـە جـێگـایـێکـی خـاڵـی لـەیسە دەیـار
بـە چـۆکـا دێ قـوتـەی مل نێرکـە کـاردوو
وەکـو بـولـبول ئـەخـوێنـێ وەعز و گوفتـار
دەخوێنێ مـەرسییـەی مـالۆسی مەحرووم
یەکانەی گون ڕەش و گاحوولی شاخدار
وەکـو بـاران بـەکـلـکـی پـیـرە سەگـدا
بـە ڕیشیـدا دەچـۆڕێ ئـەشکـی خوونـبـار
لە پاش ئیکمالی ڕەسم و ماتەم و شین
وەڕین دەس پێ دەکا وەك کەلبی هەوشار
مـەعـازەڵـلا، دەڵـێ: "یـاأیـهـا الـقـوم!"
درۆیــە حـەشر و نـەشر و جـەنـنـەت و نـار
لە گوێ مەگرن قسەی ئاخوندی سووننی
بـە ئـاشووبـن مـەلای سەر لـنگـەدەستـار
غـەرەز لـەم جـرت و پـرت و فـاکـوفـیـکـە
ئـیـتـاعـەی ئـەشقـیـا بـۆ دەفـعـی ئـەشرار(١)
حـولـوولـی مـەزهـەبێکـە بـێ گرێ و قـۆرت
تــەنــاسوخ ڕێگـەیـێکـە ڕاست و هــەمـوار
بـیـحـەمـدیـللا نـەمـا کـاك ئـەحـمـەدی شێخ
زەهاوی مرد و گۆڕی گوم بوو چاومار

ئەگەر بێ شێخ عەلیش دەفعولبەلابێ
ئیتر دنیا دەبێتە عەینی گوڵزار
بمێنێ یا نەمێنێ چیی لەدەس دێ
بە تەنها شێخ ڕەزاکەی هەرزەگوفتار
ئەگەر مشتە و مشاریش بێ زمانی
عیلاج ئەکرێ بەمشتێ پڕ لە دینار
بە دیناری عیلاج کەن یا بە سمتی
بلووریین کوودەکێکی سادە ڕوخسار
عەزیزان مەزهەبی یارانی جەم جەم
لەسەر سێ ڕوکنە: ئەووەل تەرکی ئازار
دووەم ئیکرامی زەیف و شەرتی سالیس
لە هەردوو عومدەتر کیتمانی ئەسرار
ئەمانەش جوملە پەشمن، ئەسڵی مەقسەد
چوارن پێت بڵێم ئەی پیری هوشیار
شکستەی جەوز و تووڵی سەوز و کەڵبەی
بەرازی بۆز و کەڵبەی خووگی مردار
ئەگەر دەرچێ لەسەر ئەم دینە ڕۆحت
دەچێتە قاڵبێکی شۆخ و نازدار
زەعیف بێ خوا نەخواستە ئیعتیقادت
بە ئاین و بە ئەرکان و بە ئەتوار
نەکەی تەرسێ بە ڕیشی خەلفە باپیر
نەدەی گانێ لە ڕێگەی باوە یادگار
شیاکەی گاوی حوول نەگری لە ڕیشت
نەچیتە ژێر کولێنی دایە ڕێزوار
قەپۆزت دانەپۆشێ بەرسمێڵت
بەسەر ملتا نەیێ وەك یاڵی کەمتیار

لـه قـیـبـلـەی (مـوستـەفـا) ڕوو وەرنـەگێڕی
لــە ڕێگـەی شـەرعــا نــەمـری گــونــاهـکــار
لــە پـــەشمـــی ریــخــنــاکــی بــەر سمـێڵت
نـەڕێسن سـەرکـەلـە و دەسبـەند و هـەوسار
کـە مـردی نـەقـڵ ئـەکـا ڕۆحـی خـەبـیست
لــە ئـیـنسانــی دەچـێتـە شکـڵـی سەگسار
وەرن یـــاران شـەوی مـــیـــعـــادە ئـــەمشەو
لــە پـــێ دەرپــێ فـرێ دەن یـار و ئـەغـیـار
شەواڵی زەرد و سوور وەك خەرمەنی گوڵ
لەسەر مافووری زەڕ ڕۆکەن بە خەروار[٢]
شەواڵـــی خـــامـــەك و زەربـــەفت و خـــارا
لـەسەر یـەك دابـنـێن وەك مـاڵـی توجـجـار
کـەنـیـز و خـانـم و خـاتـوون و خـادیـم
فـــەقـیـر و مـونـعـیـم و دەروێش و سالار
نـــەدیـم و نـۆکـەر و ئـاغـا و ئـەفـەنـدی
لــە دەوری دانـیشن وەك خـەتـتـی پـەرگـار
لــە نــەزمـی بـەزمـی جـەم ساقـی بـگـێڕێ
شەراب و لـێ بـدا مـوتـریب لـە مـیـزمـار
نەبیز و شەربەت و نوقڵ و مەزە و مەی
دەف و تەمبوور و ساز و بەربوت و تار
دەبـێ ئـەم بـەزمـە هــەر بـەم نـەزمـە بڕوا
هـــەتـا دوو حیسسە ڕابـووری لـە شەوگـار
کـە دنـیـا بـوو بـەڕووی قـەیـمـاسی زەنگـی
سرەی بـــەشکـرنـــی شەڵـــوارە ئـەمـجـار
بە قورعەی مەعدەلەت یەکسان بەشی کەن
مەپرسن ئەقرەبا و قەوم و کەس و کار

مەپرسن دایك و پوور و خوشك و خوارزا
لەژێر كوڕكەی بەرن بێ قەول و گوفتار
بــە قــەولــی بــاوە بــاوە و مــیــرە مــیــرە
میسالی كێر و گون هەروەك كون و مار
بــە شەرعــی مــەزدەك و ئــایــنــی بــابــەك
دوخــوولــی جــائــیــزە ئــیسمــی كــونــادار
فــــهــبــوا سادتـــی لـــلـــوطء والـــنَّــیك
لـــقـــد عـــلَّـــمـــتـــكـــم تـــقسیـــم شلـــوار
چــرا پــف لــێ كــەن و شێرانــە هــەستــن
شەقێ هەڵدەن لە پەردەی عیسمەت و عار
سەرو دەرپێ بــەرن بــێ فــەرق و تــەمــیــیز
مەپرسن ئەقرەبا و قەوم و كەس و كار
شەواڵی هەركەسێ بەر هەركەسێ كەوت
ئــیــتــر فــەرقــی نــەكــا بــیــگــرێتــە بــەركــار
كــە ئــەم وەعــزەی تــەواوكــرد پــیــرە ئــاخــوند
ئیتر هەریف لە شەمعە و تف لە حەیتار
ئیتر هەر ئەتكی دین و كەسری ناموس
ئیتر هەر تەركی شەرم و عیففەت و عار
ئــیــتــر هــەر كــێر دەبــێتــە بــاسكــی هــەوجــاڕ
ئــیــتــر هــەر گــوومــەزەی سمــتــە دەسووڕێ(۳)
بە سوورەی سەرخڕا وەك چەرخی دەووار
ئــیــتــر هـــەر لــێبــڕیــن و لــێخــوڕیــنــە
بـــەرەو ژوور و بـــەرەو ژێر و بـــەرەو خـــوار
ئــیــتــر هــەر دایــكــە پــیــرە و هــەڵــئــەنــیــشێ
بــە كــەلــلــەی كــێرەوە وەك ورچــی سەردار
ئـــیـــتـــر هـــەر پـــاوەنـــەی زیـــوە و زڕەی دێ

لـەبـەر کـوت پـێوەدان دەخشێ لـە دیـوار
ئـیـتـر هـەر خـەپـڵـەیـە وەك جـاوی گـازر
بـە مـەتـرەق دەیـکـوتـن ساداتـی ئـەبـرار
ئیتر هەر جێگە ماچە و خوێن ئەوێستێ
لەسەر گۆنای سپی وەك سێوی خونسار
ئـیـتـر هـەر نـاوگـەڵـی خـووبـانـی بـیـکـرە
لە خوێندا سوور دەبێ وەك بەرگی گوڵنار
ئـیـتـر هـەر کـێرە وەك پـەیکـانـی گۆشتین
بـە ژێر بـنـیـا دەچـێ وەك پـەڕڕی سووفـار
ئـیـتـر یـا خـوا نـەسیـبـی دژمـنت بـێ
بـریـنـی نـێزە وو نـووزەی بـریـنـدار
عـەمـوودێکـم هـەیـە وەك تـووڵـی داوود[٤]
کـوتـامـە ژێر بـەلـۆکـەی دایـە ڕیـزوار[٥]
تسێکـی کـەنـد بـە ڕیشی سەی بـراکـە
تـڕێکـی دا بـە یـادی بـاوە یـادگـار
لـە وەسفـی کـاکـەیی گەر سەرفی عومرم
بـکـەم، نـاکـەم بـەیـانـی عوشری میعشار

---

(١) ئیتاعەی ئەشقیایە و دەفعی ئەشرار: (ت)، ئیتاعەی ئەشقیا بۆ دەفعی ئەشرار: (م). دوور نییە پیاو ئیتاعەی ئەتقیای بەبیردا بێ، بۆ دەفعی تناقض کە لە نێوان ئەشقیا و ئەشراردا هەیە، بەڵام شێخ ڕەزا مەلاوشێخی سوننیی بەزمانی کاکەییەوە بە ئەشقیا داناوە، کە واتا وای لێ دێتەوە هەرچییەکی دەیکەن لەوە دەچێ ئەشرار بە ئەشقیا دەفع بکەن.

(٢) لەسەر هۆڕ و بەرە ڕۆکەن بە خەروار (م)، لەسەر مافووری زەڕ ڕۆی کەن بە خەروار: (ت).

(٣) گومبەد: (ش).

(٤) ئەم دێرە و سێ دێرەکەی دوایی لە هەردوو چاپەکەدا لە سەرەتای قەسیدەکەوە لە پاش

چوارەم دێرەوە هاتوون... هێنانە ئێرەشیان وە نەبێ بەپێی بەڵگەیێك بێ...

(٥) کورکە (م).

(*) کێش: بەحری هەزەجی موسەددەس مەقسوور

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)

وەك: "بیا ای مونس جانهای مستان

ببین اندیشه و سودای مستان"

بابان باشنده بر باطمان یشیل وار: باتمانێ سەوز وەسەر باوەتەوە هەس. امام القوم فی تقسیم شلوار: لە دابەشکردنی شەرواڵاندا خۆی سەرپشکە. بەزم: شادی و کەیف. توولی داوود: داوود پاڵەوانی جوهوودانە، بەقۆچەقانییەك جالووتی زەبەلاحی کوشت. توول: شوورك، شووڵ، تێڵا. کورکە: قیتکە، میتکە، بەلۆکە، جووجەڵە، نێوەر، چیلکە، ماشەڵڵا نێوی زۆرن... دەڵێن: حارەب بۆ شتان نێویان زۆرە، جا چ بوو، وەك بیستوومە لە هیندستان بەمیلیۆن خەمشەپەرست و یاربابل پەرست هەن! کاکە سەرچاوەی گووران و رسکانە، لۆ سەر دەلەقێنی؟! دایە رێزوار: یەکێکە لە پیرانی مێیینگەی کاکەییان. مامە جەلالەشیان هەس... قەورەکەی باوەم لە قەورسانەکەی خەلیفە باپیر نێژریاگە .. بۆ خۆی خەڵکی گەرەکی سەرشەقامە. داڵکیشم خەڵکی باوەمەردەی خوار سلێمانییە، نەوە و نەویرەی خاڵوانم لەوێ زۆرن .. عیقدی پەروین: کۆ، سورەییا، تەشبیهێکی فرە نازدارە .. لیس دەییار: قسێکی حارەوییە، ئەسڵەکەی لیس فیها دەییارە .. واتە کەسی تیا نیس. ئەم وشەیە لە قورئانی پیرۆزدا، بەمانا: ساکن، نیشتەنی هاتووە... بەچۆکا دێ: چۆك، تورك فیعلی (چوکمك)یان لێ داتاشیوە. بەڵام وشەکە کوردییە، واتە ئەژنۆ، بەچۆکدا هاتن، روکووع بردن، بەسەر ئەژنۆدا هەڵکورمان. قوتە: زرنگ و وریا و سڵۆك. مەبەست ئاخوندی کاکەییە. مل نێرکە کاردوو: کینایەتە لە رەپ و زۆپی و رەش و مۆریی ملی ئاخوند. وەعز: پەند و ئامۆژگاری دادان. گوفتار: وتار، ئامۆژگاری. مەرسییە: شیننامە، سەربوورەنامە. ماڵۆس: بەرازی مێینگە. مەرحووم: خودا لێخۆشبووگ. مەبەستی دایە رێزوار و پیرانی مێینگەی کاکەییانە. یەکانە: کەڵە بەراز، نێرە بەراز. گاحوول: حوول: سوور، سورخن، ئاماڵ سوور .. وەختی خۆی سامیری گاحوولێکی لە زێر دروست کردبوو، داوای لە جوهوودان کردبوو، ئەو گاحوولە بپەرستن، لە قورئانی پیرۆزدا باسی هاتووە... ئەو رۆژگارە حەزرەتی مووسا (د.خ) بۆ میسر چووبوو، کە گەرایەوە، لە

سامیریی پرسی ئەو زێڕەت لە کێندەر هێنا؟ گوتی لە پڕیشکی ناڵی ئەسپەکەی حەزرەتی جبرائیل. پێی گوت ئەوە بەتاڵە، وازی لێ بێنن. دەبێ ئیدی لەمەویاش "ئەدونای" بڵێن، نەك "یەهوا". ئەدونای بەمانای گەورە، عەزیزە. تەنانەت، فەرمووشی: ئەو ئەدونایە خواوەندی هەمووانە.. دیارە لەو سەروبەندەدا "ئەخناتوون" لە میسر جارِی یەك خواپەرستیی دابوو. میسرییەکان لەپێشدا بڕوایان بەفرەخودایی هەبوو، تەنانەت نەیاندەزانی هۆی منداڵ لە پسدانی دایکدا گووران چییە؟ هەر لەبەر هەندێ ئەو هەڵۆیەی کە بەسەر دارعاسای پیرۆزی فیرعەونەوە چەقێندرابوو و وەك تیمسال بەسەریەوە هەڵکورمابوو، هەڵۆیەکی مێینگە بوو، لایان وابوو، با دەچتە، بیلامانێ فەرجیەوە و ئەوجا هێلکە دەکا و جووجەڵە هەڵ دێنێ... هەر بۆیەش خواوەند لە قورئانی پیرۆزدا لە مەڕ حەزرەتی مریەمی پاکیزەی فەرمووە: "ونفخنا فیها من روحنا".. ئەوە دیاردییەکە بۆ ئەم بیروباوەڕە. خوا بۆ خۆی دەزانێ. نەك هەر ئەوە، بگرە بەدرێژاییی سەدەکانی پێش لەدایکبوونی عیسا، لە بابلستان، لە ئیلام، لە کن هتیت، میتانی، خۆری، لیدی ئۆرگاریت و زۆر نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانە، دەبوا کیژی نەسمراو، بچتە خزمەتی مووبەدەکانی پەرستگایەکان، لەپێشدا ئەوان لەگەڵیدا جووت بن. کچی هەناسە ساردی وا هەبوون، وارویۆخیان سەرلەبەر دەپێچایەوە دەهاتن، لە پەنا دیوارەکانی ئەشتەرووتدا، بەمانگ، بەساڵ چاوەنۆڕیان دەکرد، تا گەورەی مووبەدان نۆرەیان بداتێ و دەگەڵیاندا جووت بن و ڕێی مێردکردنیان بداتێ. ئەوجا کە مێردیشیان کرد، دەبوا چووبان بۆ یەکێ لە پەرستگایەکان، چەند شەوێکی لێ مابانەوە، تا ماری پیرۆزیان لە خەوندا دەگەڵ دروست با و زگیان پڕبا .. ئاوەزیان بەوەدا نەدەشکا کە هەر جووتبوون دەگەڵ مێرددا ئەوە یۆ خۆی هۆی پس لە پسداندا گوورانە .. ئەوەش لەوەڕا هاتووە، کە مرۆ باوەڕی وا بووە، کە هەرچی کر و کردەوەی مرۆ و مار و مێروو و ئەرز و ئاسمان هەس، گش وە دەس بتە و هێزی نەپەنی و پێوارە .. ئەدی فرۆید لە چیرا هەرچی شتی درێژووکە، ئافرەت لە خەونیدای ببینێ، بەنمای ئارەزووی جۆنبووتی لە قەڵەم داوە.. هەروەها هەرچی شتی خڕ و گرۆڤەری وەك باڵکۆن و کووپە و مەشکە و کوندە و شتی هەڵمساو لە خەونیدا ببینێ، بەنمای ئارەزووی دەگەڵ مێینگەدا جووتبوونی نێرینە لە قەڵەم داوە و پێی وایە بنەمای ژیان، نە ئابوورییە و نە کۆمەڵە، بگرە زایەندە و هەر کۆششێکی مرۆ لە ژیاندا بەخەرجی دەدا، هەمووی لە پێناوی زایەندداییە و بۆ

پاراستنی درێژەپێدانی توخمی مرۆیە... کولەنانی و فاتە بیجەڕێنە و فاڵگرەوە و بەختگرەوە و چەندین جۆرە شەعبەکاری ئەورۆ، کە ڕەنگە تا ئەورۆش لە کوردستان هەر مابن و بۆ زاوا بەستران، بۆ سك پڕبوونی ژنان، بۆ مێردکردن، بۆ دڵی مێرد بەژنەوە ڕاگرتن، بۆ ناحەزی لە نێوان ژن و مێرددا پەیدا کردن، درێژاییی ئەو جۆرە بیر و باوەڕانەن کە تا ئەم ڕۆژگارەش دە مێشکی نەگۆڕاوی خەڵکدا ماونەوە .. خۆ ئەگەر لە عیبارەتی "خذ بهن أبيك" ورد بییەوە بۆت بەدیار دەکەوێ، کە حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ) لە کاتی سەرەمەرگیدا کە داوا لە حەزرەتی ئیسماعیل دەکا دەست بەهەنیەوە بگرێ ئەوجا سوێندی بۆ بخوا، وەسیەتەکانی بۆ بەجێ دێنێ، گرینگیی زایەندت بەتەواوی بۆ ڕوون دەبێتەوە... پیرە سەگ: کینایەتە لە ئاخوندی کاکەییان. ئەشکی خونبار: فرمێسکی خوێناوی. ماتەم: تازیەمانە و سووگواری، پرسە. وەڕین: حەپین. کەلبی هەوشار: هەوشار وڵاتیکە لە کوردستان. سەگی هەوشار، سەگی چاکی کوردەواری . کاك فوئاد عارف، لە بیرەوەرییەکانیدا دەگێڕێتەوە، کە وەختی خۆی چۆن سەگێکی هەوشاری بۆ مەلیك غازی لە پشدەرێرا پەیدا کردووە و دەگەڵ سەگێکی ئاڵمانیدا بەشەڕ هاتووە و هەر وەخت بووە بیخوا. مەعازەڵڵا: پەنا بەخوا، خوا بمان پارێزێ. یا ایها القوم: قەومینە. حەشر (ع. الحشر): خڕکردنەوەی خەڵك، یا خڕکردنەوەی هەر گیانلەبەرێ، بۆ هەق و حەساو لەگەڵدا کردن. نەشر (ع. النَّشر): بڵاوە پێکردن. جەننەت (ع. الجنَّة): بەهەشت. نار (ع. النَّار): ئاور، ئاگر. ئاخوون: مەلای شیعە و کاکەییان. ئاشووب: ئاژاوە، بشێونەیی. لنگە دەستاڕ: تا بەرداشی دەستی. کینایەتە لە مێزەری سەری ئاخوند. غەرەز: مەبەست. جرت و پرت: جرپ و جۆپ، جرت و فرت، هەڵبەز و دابەزی بێهوودە. فاك و فیك: حیلە و حەواڵە. ئەشقیا: یاغی. ئەشرار: نەگریس و پیاو خراپ. حولوولی (ع. الحلولية): باوەڕ بەکلێشەگۆڕی، دۆناودۆن، دۆن بەتورکی جلك و پۆشاکە. بەتایبەت بەدەرپێش دەگوترێ. "شەیتان دۆننە گیرمك": چوونە کلێشەی شەیتانەوە .. واتە: مرۆ پاش وەی دەمرێ، گۆیا ڕۆحی دەچێتە لەشی مرۆیەك، گیانلەبەرێکی دیکەوە. بەعەرەبی (تناسخ الارواح)ی پێ دەگوترێ. ئەم بیروبڕوایە ئی ئەورۆ نییە مرۆی سەرەتایی بڕوای بەمادییەتی ڕۆح وەك سێبەر، خوێن، هەناسە و شتی لەم جۆرە بابەتانە هەبووە. ئاین لای وایە ڕۆح نامرێ و لە پاش ئەوەی کە لە قاڵب جوێ دەبێتەوە، سەربەخۆ لە دنیایەکی دیکەدا هەتا هەتایە دەمێنێتەوە و دەگەڕێ. ڕۆح لە فەلسەفەی ئایدیالیزمدا دەگەڵ سروشتە

جۆربەجۆرەکانی ئایندا یەك دەخرێ. پلاتۆن ڕۆح بەدیاریدەیەکی نەمری هەتا هەتایی لە قەڵەم دەدا. هیگل، بەشتێکی وشیار و بەکاری دەزانێ و دەڵێ سەروکاری دەگەڵ مادەدا هەیە و ڕەنگدانەوەی سرووشە و لە نەویترین پلەی دۆکتۆرینە دوالیستەکان (ئەوانەی پێیان وایە هەموو شتێ لە جەوهەردا دوو شتە: تاریکی و ڕووناکی، ئاهورا و ئەهرەمەن. (الثنويَّة) لایان وایە ڕۆح سەربەخۆیە، بەڵام شتێکە دەگەڵ لەشدا پەیدا دەبێ .. دێکارت، سپنسەر، وند جێمس، ماتریالیزمی پێش مارکسیزم (ماتریالیزمی میتافیزیکی دیمۆکریتۆس) ڕۆح بە هاوسەروکاری لەش دەزانن، بەڵام لەچاو لەش، بەدووهەمی دادەنێ و چالاکیی ڕۆح دەخەنە ئاستی جۆرەکانی "ئەلەمینتار میکانیك" میکانیزمی سروشتان، یا "فیزیکۆ ـ شمیك" کیمیای فیزیکی. فەیلەسووفانی ماتریالیزم زۆر جار مەیلیان بەلای ئەوەشدا بزووتووە کە ڕۆحێکی جیهانگر هەیە. (مطلق، خوا...) "هیلۆزۆئیزم ز". کێشەی ڕۆحی مرۆ بۆ یەکەم جار بەشێوەیەکی زانستانەی ڕاستەقینانە لە لایەن فەلسەفەی دیالێکتیك ماتریالیزمەوە، هەرچی لێکدانەوەی زاتی و زیهنی و خەیاڵی هەیە پووچ کراوەتەوە. لە ئاکامی لێوەکۆڵینی بابەتەکیانە، هەرچی چەمکی لە زانست بەدەر هەس، سەر لەبەری پووچاندووەتەوە. بڕوانە: (سێچێنۆڤ، پاڤلۆڤ). ڕاستیی حولوول لە "الملل والنَّحل"ی شهرستانی و "الفصل فی الملل و الاهواء والنَّحل "ی ئیبن حەزمدا، بە لك و پۆپەوە باس کراوە... هەموار: بێ گرێ و کۆسپ، خۆش. چاومار: مفتی سلێمانی. هەرزەگوفتار: قسە قۆڕ، قسە بێهوودە. مشتە: ئامرازی چەرم کوتینەوەی پینەدۆز (ع. المنشار): هەڕە. مشت: مست. لە کوردیدا "ش" و "س" لە زۆر وشەدا لە جێی یەکدی هاتوون: بڕست، بڕشت، ئاسیاو، ئاشی ئاو، مستەکۆڵە، مشتەکۆڵە. جەم جەم: کۆبوونەوەی پیرانی ئەهلی حەق، کاکەیی. ڕوکن (ع. الركن): سیلە گۆشە. ئیکرامی زەیف (ع. إکرام الضَّیف): میوان پەزێری، میوان دۆستی. عومدە (ع. العمدة): کۆڵەکە، سەرەکی. کیتمانی ئەسرار (ع. کتمان الاسرار): پەنام وەشێردن، نهێنی ئاشکرا نەکردن. پەشم: قسەی قۆڕ. ئەسڵی مەقسەد (ع. أصل المقصد): ناوکرۆکی مەبەست. جەوز گوێز: قۆز، گرتکان. توول: شووڵ، شووڕ. کەڵبە: کەڵپە. بۆز: شینی سپی ئاماڵ... ئەم وشەیە تورك بەتورکیی دادەنێن" هەر بۆیەش خەڵکانی ناوچەی دەشتیان بە "قرە أولوس" و نیشتەنییانی زورگ و هەڵەتیان بە "بۆز أولوس"بەش کردووە .. بەڵام کورد وشەی "بازگ"ی، بەمانای سپی، وەك "سەگە بازگ"، "سپە بازگ" هەیە. خووگ: بەراز،

گاحوول. تەرس: گووی یەکسم: خەلیفە باپیر: پیری کاکەیی، قەورەکەی لە گوندی مامەشەیە. قەورسانەکە لەسەر سێ گردە .. باوەم، حەمەی برام قەومەکەم گش لەوێ نێژریاگن. شیاکە: ڕیخ، گووی تەڕی یەکسم. کولێن: کوڕکە، بەلۆکە. قەپۆز: دم، بێڤل. یاڵ: ئەو مووەی بەملی ئەسپ و مایینەوەیە .. "بژ": ئی تەوقە سەریە "یاڵ" ئی ملی. مستەفا: محەممەدی پەیامبەر (د.خ). پەشم: خوری. ڕیخناك: ڕیخاوی، ڕیخن. سەرکەللە، بەشی سەرەوەی ڕێشمە کە بەدەوری سەر و ژێری تەنگەی یەکسمدا دێ، پێشپەندی یەکسم، دەسەجڵەو. هەوسار: پەت، ئەوی بەملی گۆرە و بزن و هتدەوە... دەبەسترێ. چوستی: خێرایی، یەکسەر. سەگسار: بە سەر سەگ و بە لەش مەیموون .. گیانلەبەری وا هەیە .. کورد، فارس: "گامێش، سەگسار، مارماسی "مار و ماسی" مریشە و ماسیشە. میعاد: وادە، ژووان. دەرپێ: شەواڵ. تنبان. ئەغیار (ع. الغیار): بیانی خەرمەن: خەرمان، کۆ. مافوور (ع.المحفور): جۆرە فەرشێکە، سەججادە، خاڵی، قاڵی. زەڕ: زێڕ. خەروار (ف. ك. خربار): کەربار، خەلاڵ، خەرار. خامەك: زەڕبافت، لە ڕیسی وەك تاڵی زێڕ بافت تەون کریاگە، خام، قەنەوز، سەوز، سوور، بنەوشەیی، زۆری ڕەنگ هەس، ژنان وە سوخمەی ئەکەن. خارا: پارچە قوماشی بەنرخ. خەتتی پەرگار: مەبەست بەڕێکوپێکی لە دەور دانیشتنە. میزمار: (ع. المزمار) بلوێر، زوڕنا... ئەو وشەیە چۆتە نێو کوردیش و عارەبیشەوە، "زمێر" بەکوردیی باکوور بە سروود دەگوترێ. زمێری داوود، سروودی داوود. ئەسڵەکەی: ئارامی ـ سوریانییە. ئەفەندی (یۆ): گەورە. نەبیز (ع. النَّبیذ): شەرابێك کە لە ترێ دروست دەکرێ. نوقڵ: شیرینی. مەزە: سووکە خۆراکێك لە گوێن زەڵاتە و شتی دیکە دەگەڵ مەی و شەرابدا دەخورێن. تەمبوور: بەئارەوی کراوی تەنبووری پەهلەوییە. لە جوور ژێبەندێل دم درازەس .. ساز: ئامێری مووزیك، بەژێدار و فوویینەوە .. بوربوت: (پ. یۆ) (Borbut): یەکێ لە باوترین و گرینگترینی سازەکانی سەروبەندی ئێرانییان و ئارەوە، لە عوودێکی چکۆلە دەچێ: تار: (ف. ك.): داوێکی درێژی زۆر باریك لە موو و ئارمووش و لۆکە و تەونی جاڵجاڵۆکە بۆ ئامێری مووزیك بەکار دەبرێ. حیسسە (ع. الحصَّه): بەش. قەیماس (ت. قایماز): کەنیزەی ڕەش و پیس. زەنگی (ف. زنگ): ڕەش پۆست. سره ت (ت. صره): ڕیز، نۆرە. قورعە (ع. القرعة): پشك هاوێشتن، پشك بەشینەوە. مەعدەلەت (ع. المعدله): عەداڵەت، یەکسانی، داد. باوە باوە، میرە میرە: پیران و گەورە پیاوانی کاکەیی. مەزدەك (پ. مزدك ـ مزدك): کابرایەکی نەسایی بوو،

دەڵێن لە ئەستەخرێ بووە. دوو سەدە لە پێش مەزدەك پیاوێ بەنێوی زەرتوشتی بوندە "بوندی" کوڕی خەرکان، کە خەڵکی یاسا "فاسا" کە مانەوی بوو، ئاینێکی بەنێوی "دەریست دین"ەوە هێنایە گۆڕێ، خەڵکێکی زۆر بەدوو مەزدەك کەوتن، کاورا پیاوێکی کارگوزار بوو، ئەم ئاینەی وە برەو ئێخست. بابەك: بابەکی خوڕەمی، عەبدوڵڵا بابەك، لە لاوێنیدا لە خزمەت گوندییەکدا بەنێوی جاویدان، بەکوشتوکاڵەوە خەریك بووە، لە سەروبەندی مەئموونی عەبباسیدا سەری هەڵدا و پەیڕەوانێکی زۆری لە ئازەربایجان لە خۆ خڕکردەوە، شەڕوشۆڕێکی زۆری لە دژ خەلیفە و هەمەکارانی هەڵایساند. لە ساڵی ۱۰۱ەوە تا ساڵی ۲۲۲ی کۆچی ، خەڵکێکی زۆری لە سپاییانی غەلیفە قڕکرد. دەگەڵ مازیاری فارسدا هاوکار بوو. خەیزەری کوڕی کاوسی بە ئەفشین ناسراو، لە لایەن غەلیفە موعتەسیمەوە چووە سەر و بەتەڵەکە دەسگیر کرا و هێندرایە خزمەت موعتەسیم. موعتەسیم فەرمانی دا بەشێوەیەکی هەر سەخت و دڕندانە و ناپیاوانە بیکوژن، بەڵام بابەك تا دوا هەناسەی، هەر جنێوی بە غەلیفە دا. کونادار: هەرچی کونی هەبێ. هبُوا (ع. ): یاڵڵا، دەی، هەیدێ .. للوطء (ع.): بۆ قوون گاین. والنَّيك: هەر هەمان مانای پێشوو. عیسمەت (ع. العصمة): داوێن خاوێنی. عار (ع.): فهێت، عەیب. شوورەیی. تەمیز: تەمیس. شەمع (ع. الشَّمع): شەم، مۆم. حەیتار: لە حەیدەر، حەیدارەوە هاتووە .. مەبەستی کاکەلاسە. تف لە حەیتار کینایەتە لە حازرکردنی حەیتار بۆ تێخستن. ئەتك (ع. الهتك): سووکایەتی و پەردەی حەیا دڕین. کەسر (ع. الکسر): شکاندن. ناموس: قانوون، یاسا، حەیا. عیففەت (ع. العفّة): دەست و داوێن پاکی. لینگ: لنگ، لاق بوون بە لام ئەلف لا: هەردوو لینگی ئافرەت بەرز کەیەوە. دیارە وەك (لا)ی لێ دێ: باسکی هەوجاڕ ئەوەندە دارەی کە لە کەلەمەی هەوجارەوە بەمژانەوە دەبەسترێ. ئیتر هەر کێرە و هتد... سمت و کەفەڵ وەك گومەز وایە و وەك چەرخ بەدەوری کێردا دەخولێتەوە و چەرخ و فەلەك پێك دێنێ. لێ بڕینە: ئەم ڕستەیە لە حاڵی ئیعرابی (مەحکی)دایە، دەنا دەبوا "لێ بردنە"بێ. دیارە کێشی شیعر ناچاری کردووە. ڕەنگە لەبەر خاتری "لێ خوڕینە"ش بێ .. هەڵئەنیشێ و هتد... تەشبیهێکی تەمسیلیی دەگمەنە. خەپلە: کولێرە. گازر: جلشۆر، خمکەر، بەن ڕەنگکەر. مەترەق (ع. المطرقة): گڵاوکوتك، کوتەك. ساداتی ئەبرار: لە نەوە و نەتیژەی پاکی پەیامبەر (د.خ). کاکەییەکان زۆریان خۆیان بەسەید دەزانن، سەیدییەکەشیان بەلای خۆیانەوە لە بابای عوریانەوە بۆ هاتووە. خووبان (ف.): ئافرەتی شۆخ و

جوان. بیکر (ع. البکر): کونی کوزی نەگایریاگ. بەرگی گوڵنار: پەڕی گوڵهەنار. بەمانای گڕی ئاوریش دێ. پەیکان: تیر، گۆشتین. پەڕی سووفار: جێیەك لە تیر کە ژێی کەوانی لێ گیر دەکرێ. نێزە: کێری مەبەستە.

(٢٢) شین*

کـێر کـە هـەستـا نـە لـە بێگـانـە دەپرسێ نـە لـە خـوێش
گوززی خۆی هەر دەوەشێنێ چ لە پاش و چ لە پێش
هـەمـە کـێرێکـی قـەوی، هـێند بـە کونـی تـەنگـا چووە
سەروچاوی هەموو زامدارە، پەراسووی هەموو ڕێش
تـا مـلـی غـەرقـە لـە چـەرمـا، وەکـو سیـواکـی مـەلا
پـرچـی ئـەفشانـە لـەسەر پشتـی مـلـی وەك دەروێش
پـاڵـەوانـێکـی قـەوی قـۆڵـە لـە مـیـلـبـازیـدا
مـەحـکـەمـە ڕیشە وو بـێخـی وەکو شاخـی گـامێش

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون موسەببەغ
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)
وەك: "دوش وقت سحر از غصّە نجاتم دانند
واندر آن ظلمت شب آب حیاتم دادند"
خوێش: خزم و خوێش، نزیك. گورز: ئامێرێکی سەرئەستووری دەسکداری شەڕە، لە پەڕۆ و پاتاڵی لێك بادراوی ڕەق بۆ کایەکردن و شەڕ دروست دەکرێ. کینایەتە لە کێر. لە پاش و لە پێش: کیایەتە لە کوز و قوون. پەراسوو: دەنە. ڕێش: بریندار، ڕووشاو. وەکو سیـواکـی مـەلا: تـەشبیـهی کێر بـەسیواکی مـەلا، هـەرچـەندە زۆر بـێ ئەدەبانەیە، تەشبیهێکی دەگمەنە .. ئەفشان (ف. افشان): بڵاو، بژ، قەوی و قۆڵ، دەست و بازوو ئەستوور. میلبازی: پاڵەوانبازی .. پاڵەوانانی سەردەمانی کۆن بۆ وەرزشت کردن، میلبازییان دەکرد. ئەمن بۆ خۆم لە بیرمە، تا چلەکانیش جێژنان لە جێ سەیرانەکەی بن قەڵای کەرکووك، لە ئاخوڕ حوسێن، لە حەمامە کۆنێکدا شوکور پـاڵـەوان و فـەخـە، میـلبـازی و زۆرانبـازییـان دەکرد .. کـابرایـەکی سوورەی درێژی

قەڵایيش هەبوو، تەپڵی زۆرانبازیی لێ دەدا. زۆر چاکی لێ دەزانی. ئەو تەپڵ لێدانە، ئێستا، ناوە ناوە لە ڕادیۆ تارانەوەم بەشانامە خوێندنەوە گوێ لێ دەبێ. ڕیشە: ڕەگی ورد. بێخ: بن.

### (٢٣) غەین*

شێخ محەممەد عەلی وو چەند نەفەرێ چووینە ئۆجاغ
گشت بەکەیف و بەنەشات و بەسورووور و بەدەماغ
گەرچی چەند ڕۆژێ بوو تەعلیمی تفەنگبازیی بیجاغ
هەرکە ئەنگاوتی وتم دەك دەس و بازووت نەرزێ
هەرکەسێ پێت نەڵێ ڕۆستەم تەرەسە و قوڕمساغ

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)
وەك: "از تو جز درد دل و خون جگر حاصل نیست
چە کنم جان کە جز این هیچ دگر حاصل نیست"
ئۆجاغ (ت. أوجاق): نێوی شوێنێکە لە ڕێگای لەیلان، پێش ئەوەی بگەیە تەرجیل .. خەڵکی بۆ چاوکرانەوە و زگ پڕبوونی ژنان، بۆ مراز، دەچنە سەری. بەهاران، بۆ سەیرانیش دەچنە سەری. ئەوە ئی کاکەییان بووە.
بیستوومە تورکێکی دەسڕۆی کەرکوکی هەمووی کڕیوە .. بەدەماغ: کەیفساز، شادمان. تفەنگبازی: تفەنگ تەقاندن و نیشان شکێنە. ئاسا: وەك. پارێز: لە نزیکەوە دەرفەت لە نەخچیر هێنان. بیجاغ: (ت. تیللی باجاق): لاق بەتێلی زیڕ و زێو ڕازاوە. ئەوە پەڕەوڵێکە کورد تیتڕواسکی پێ یەژن، زۆر خنجیلانە و جوانە، لاقی درێژە، هەر دەڵێی مەرجانی سوورە .. هێندەی کۆترە باریکەیەك دەبێ.
ڕەنگی کەوە و بازگە، کە دەخوێنێ، دەڵێ: تی تتیتتی، تی تتیتتی. هەمیشە لە گوێ ئاوی بەستان دەژی، ماسیش دەخوا. ئەنگاوتن: نیشانە پێکان، نەخچیر ئەنگاوتن.

(٢٤) قاف

**ستایشی شێخ ستار***

سپــای غــەم دەورەیــان دام دەس بــە مــەتــرەق
لــەپــاش تــەشریـفــی تــۆ دامـیــانــە بــەر شەق
تـــەعـــالـــەڵـــڵا، لـــە جـــەلـــلادی فـــیـــراقت
دەڕێژێ بــێ مــوحــابــات خــوێنــی نــاحــەق
مـــەپـــرسە بـــۆ لـــە هـــیـــجـــرانت نـــەمـــردم
کە من سەگ مەرگم و گیان سەخت و دڵڕەق
کــە زیـنـیـان خستـە پشتـی مـایـنـە ڕەشکـوێت
گـــەڕا چـــاوم لـــە تـــاوان زەرد و ئـــەبـڵـــەق
لــە شەوقــی تــۆ وەکــو مــەنسووری حــەلــلاج
خــەرووسی تــەبـعــی مــن ئــەیگوت: (انــا الـحق)
لـــە بـــەزمـــی خـــوسرەوانـــدا یـــەك زەمـــانـــێ
مـورەخـخـەس بووم وەکو دەستووری موتڵەق
ئـــەمـــێستـــاش تـــاقـــەتـــم تـــاقـــە و پـــەرێشان
خـــەرووسم ئـــەخـــرەسە و حـــاڵـــم مـوفـــەششەق
لـــەبـــەر هـــەیـوانـــی مـزگـــەوت ئـــێستـــە بـــێ تـــۆ
وەهـــا دێم و دەچـــم وەك حـــاجـــی لـــەقـلـــەق
ئـــیـــلاهـــی عـــومـــر و جـــاهت بـــەرقـــەرار بـــێ
عەدووت هەر سەرنگوون بێ، خۆت مووەفەق
سمـــێڵـــی شێخ ستـــار حـــەبـلـــولـــمـــەتـــیـــنـــە
کـــەلامـــی شێخ ڕەزا وەحـــیـــی مـــوسەددەق

................................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەقسوور
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل).
وەك: ″در آن مجلس که جام عشق نوشند
کجـا پـــند خـــردمندان نیوشـــند″

تەعالەڵڵا: قسەیەکە لە گوێن سبحان الله، معاذ اللّه واتە: خوای لە هەموو مانەند و شێوە بەدەر. یا خوا لە شەڕی شەیتانمان بپارێزێ، پەنا بەخوا. جەللادی فیراق: فیراق، لێك جوێبوونەوە، ئیزافەی جەللاد ئەباڵ فیراق یا ئەوەتا بەئیدیعای ئەوە کە فیراق بووە بەسوڵتان و جەللادی هەس، یا فیراق هەر خۆی جەللادە .. موبالەغەی تێدایە .. موحابا: بەلایەکدا داشکاندن، خاترگرتن. بێ عەداڵەتی. هیجران: یار خۆ لە ئاشق تۆراندن و تەرککردن. هەجرکردن .. سەگ مەرگ: کەسێکی کە لە سەرەمەرگدا بێ و لە گیانەڵای سەختدا بێ. وەك دەڵێن: ″ڕۆح لە جێی سەختە و دەرناچێ″، بەڵام بیستوومە، مرۆ پێش وەی بمرێ خوای میهرەبان تووشی حاڵەتێکی دەکا، هەست بەئازاری گیان کێشان ناکا. بەئیستیلاحی بژیشکان ″چۆکی″پێ دەڵێن. ڕەش کوێت: سووری ڕەش ئامال، ڕەشی سورخن. مەنسووری حەللاج: حوسەین کوڕی مەنسووری حەللاج، عارفی نامێ. بەتۆمەتی بیروباوەڕی لە ئیسلامەتی بەدەر دەستگیرکرا و بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە کوژرا. تۆمەتەکەی ئەوەبوو کە لە کاتی حاڵ لێهاتن و جەزبەدا هاواری دەکرد، دەیگوت ″أنا الحق″ خەرووس: (ف. خروس): کەڵەشێر. مەبەست لە خەرووسی تەبع، بانگی ئاشکرای وەك بانگی مەنسووری حەللاج، کە لە حاڵ لێهاتندا ″انا الحقّ دەگوت. بەزمی خوسرەوان: مەجلیسی شەراب و ڕابواردنی شا و پادشایان. شێخ ڕەزا وا دیارە، دیاردیی بۆ سەردەمێ کردووە کە لە هەڕەتی جەوانی و لاوێنیدا بووە و دەسڕۆ و هەر خۆی حسێو بووگە و هەر شتێکی ئارەزوو لێ بووە کردوویە و وەك شای خاوەند هەموو دەسەڵات و دەستووری ڕەها، چیی پێ خۆش بووگە، کردگیەسی.. ئەخرەس: لاڵ، بێ زوان. موفەششەق: شڕوشپڕێو. وا دیارە شێخ لە پاشان هەڕەتی لاوێنیی لە دەست داوە و پیر بووە و دەستی نەڕۆیشتووە و شێخ عەلیی برای و بریکارانی وی بەرەوبڕیی زۆر شتیان لێ کردووە و کەڵەشێری لە کەو چووە و حاڵی شڕ و پەرێشان بووگە. گلەیی لە زەمانە دەکا. تاقەت تاق: تاقەت چوو، تاقەت یەك لۆ بووەوە، بێ هێز. هەیوان (ف. پ. ك.): بەعەرەبی کراوی ″ایوان″. پێشگا، ژوور، داڵان. حاجی لەق

لەق: باڵندەی نامێ، لەك لەك. جاه (ع. الجاه): وەج، حورمەت. عەدوو (ع. العدو): دژمن، نەیار. سەرنگوون (ف. سرنگون): دەمەوڕوو، دەمەوقڵپ. موەففەق (ع. الموفّق): سەرکەوتگ، کارڕاست. حەبلولمەتین (ع. حبل المتین): گوریسی ئەستووری مەحکەم. مەبەستی شێخ ستارە، کە خاوەنی گفتی خۆیەتی. سمێڵ کینایەتە لە نیشانەی بەڵێن بەجێ هاوردن. کورد دەڵێ: ئەم کارەم لە سوێڵەکەی تۆ گەرەکە. سوێل نمای پیاوەتی و جوامێرییە. وەحی (ع. الوحي): سرووش، ئەوەی کە خوداوەند دەیخێتە دڵی پەیامبەر و پیاوچاکانەوە. موسەددەق (ع. المصدّق): تەسدیق کرای، بێ لام و جووم، ڕاست و بێ ئەمسەر و ئەوسەر ..

(٢٥) کاف

**ئەگەر جارێکی تر بچمەوە کەرکووک***

بەم حاڵە ئەگەر جارێکی تر بچمەوە کەرکووک[١]
مەعلوومە بە مەردی نەڕوواوە لە سەرم تووك
بۆچ بچمەوە کەرکووکی قورمساغ کە لەگەڵ من
ئەهلی هەموو ناسازە وەکی ئاوی حەمامووك[٢]
پێم خۆشە لەبەر جەوری براو لۆمەیی ئەقوام
سەد جار لە غەریبی بکەوم موفلیس و مەفلووك
ڕۆژێ بەمورادی منیش ئەڵبەت دەگەڕێ چەرخ
ئەم میچە قەراری نییە، گاهێ جگە گەهە بووك
شاهی کە نەبێ ڕادەبوێرین بە گەدایی
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پلاو خۆشترە داندووك[٣]
شەش مانگە زیاتر کە لەپاش مەرگی پدەر من[٤]
مەغدوورم و مەزڵووم و جەفادیدە وو مەهتووك
تا ساکینی کۆی مامە غەفوورم وەکو فەغفوور
کیسەم پڕە دایم لە زەڕو لیرەیی مەسکووك

پـاپـەنـدی خـەلایـق نـیـیـە تـەبـعـم وەکـو خـەڵـکـی
بـێ کـولـفـەتـم و ڕەنـدم و سەیـیـاحـم و سالـووك
مـن خـواجـەیـی ئـەحـرارم و ئـامـێزشی دنـیـا
هـێشتـاکـە نـەمـیـکـردووەتـە بـەنـدەیـی مـەملـووك[٥]
وەك (لامـیـع)ی شاعـیـر نـیـیـە ئـێستـێ لـە جـیـهـاندا[٦]
شیرین سوخەن و قانیع و خۆش تەبع و (ڕەزا) سووك[٧]

---

(١) بەم هەیئەتە گەر دەفعەیێ تر بێمەوە کەرکووك (نوسخە).

(٢) بە حەمامۆك مەشهوورە، لەبەر قافیەکە وامان نووسیوە.

(٣) داندۆك دەگوترێ، دیارە هەر لەبەر قافیەکە وامان نووسیوە. بەئیملای کۆن ئەم بانێکە و دووهەوایە ڕووی نەدەدا، گرفتەکە بەخوێندنەوە چارەسەر دەکردا...

(٤) شەش ساڵە زیاتر کە لە پاش مەرگی پدر من مەغدوورم و مەزڵووم و جەفا بردەم و مەهتوك (کش مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٥) هێشتاکو (کش مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٦) ئێستا (کش مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٧) قابیل (کش مەلا ئەحمەدی دەکە).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)

وەك: ″گر دەست دهد خاك کف پای نگارم

بـر لوح بصـــر خطّ غبـــار بنـگـارم″

ئاوی حەمامۆك: نێوی ئاوێکی نامێیە لە کۆیە. لەومە (ع. اللّوم): لۆمە، تانووت. ئەقوام (ع. الأقوام): نەتەوەکان، خزم و خوێش. موفلیس (ع. المفلس): بێ پووڵ و پارە. مەفلووك (ع. المفلوك): فەلەك زدە، زەمانە پشت تێ کردگ. چەرخ (ف. ك. چرخ): گەردوون، فەلەك. میچ: جگ، جوو، قاپ، باری لەسەر پشت کەتنی جگ لە جگێندا. بـووك: بك، شاهـی: پـووڵ، پـادشایـی داندووك: داندۆك، دۆینە. لـە هـێندێ ناوچەی کوردەواریدا، ترخێنەشی پێ دەگوترێ. پدەر (ف. پدر): باب، باو، باوك. مەغدوور (ع. المغدور): غەدرلێکراو، بەش لێ زەوت کراو. مەزڵووم (ع. المظلوم): زۆر لێکراو. جەفادیدە: مەینەتی و جەفادیدە. مەهتووك (ع. المهتوك): پەرێشان، ڕووت و

ڕەجاڵ. فەغفوور: نازناوی پادشای چین و ماچین. مەسکووك (ع. المسكوك): لێدراو، پارەی لێدرای. خەلائیق (ع. الخلائق): خەڵکان. کولفەت (ع. الكلفە): ئەرك و ئورك، بارگرانی. ڕەند: زۆرپیاو و جوامێر، بێ پەروا، بێباك. سەییاح (ع. السَّیاح): گەڕۆك. سالووك (ع. السالوك): هەژار، دەروێش. ئەحرار (ع. الاحرار): ئازاد و سەربەخۆ. ئامێزش (ف. امیزش): دەگەڵ دنیادا تێکەڵ بوون. مەملووك (ع. المملوك): کڕراو، خەریدە. لامع: نازناوی شێخ ڕەزا. ئێستێ: ئێستا. سوخەن (ف. سخن): قسە. خۆش تەبع: سەلیقە ڕەوان. قابیل: بە بەهرە. ڕەزاسووك، دوو مانای هەس: یەکێکیان ئێسك سووك، دووەمیان شێخ ڕەزا. مەبەستی بارسووکییە، "کەر کوڵ و بار سووك".

## (٢٦) میم

## هەجوی شوکری*

پـووره شوکـری بـەسیـە بـا نـەتـگـێم و سمـتت لـەق نـەکـەم
دایکـە کـێرخـۆرت هـەواڵـەی سووری سەرئـەبڵـەق نـەکـەم
نـیـیـەتـم بـوو دەفـعـەیـێ خـۆمت پـیـادەم بـاز وتـم
نەقسە بۆ ئەمسالی من با گوێ لە هەر ئەحمەق نەکەم
مـن کـە شەهـبـازی شکـارئـەنـدازی شاهـیـم پـێ دەڵـێن
حـەیفـە بـا ئـاهـەنگـی جەنگی سەرگەڕ و لەقلەق نەکەم
تـۆ بـەجـاریێ وەك ژنـی فـاحـیشە پـێت لـێ هـەڵـبـڕی
نـەء، وتـم خـەیری نـیـیە، چاوێکـی گـەر لـێ زەق نـەکـەم
حـیـزە ساخـۆت بـگـرە، تـا بـۆت بـێمـە مـەیدانـی مـەساف
شەرتـە هـیـچت پـێ نـەڵێم تـا بـن گـونت نـەستـەق نـەکـەم
کـۆنـە حـیـزی شاری بـەغـدا لـێم حـەرام بـێ شاعـیـری
گـەر کـوزی خـۆشکت وەکـو ئـەیـوانـی کـیسرا شەق نـەکـەم
هـەروەکـو مـەستـیـم بـە فـەردێ گـا خـوا ڕۆحـم بـەرێ
مولحیدی کافرمەزەب گەر تۆش بە ئەو مولحەق نەکەم
مـن دەزانـم کـێ لـە خشتـەی بـردویـی ئـەمـما چ سوود
سەیـدە سەیـد قسەی سووکـی دەبـێ دەرحـەق نـەکـەم

پێی بڵێ با مونتەبیهـ بێ، تۆش گەن و گووم بەس بخۆ
بـا سلـێمـانـی بـەجـارێ کـافـری مـوتـڵـەق نـەکـەم
عـەهـدە کـردوومـە لـە خـزمـەت شێخ ڕەزادا ورچـە کـوێر
نـەیـخـەمـە نـاولـنـگـی دایـکت، تـا لـە تـۆی ئـێرەق نـەکـەم

.................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: "یاد می داری که با من جنگ در سر داشتی
رای رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی"
پـوور: خـوشکـی دایك و بـاوك. بـەپـوور نـێوبـردنـی شوکـری فـەزڵـی بـۆ فـراوێتـن و داشۆردنە.. شەمە لەق بوون: ڕۆژی شەمە کە لە کن جووان ڕۆژێکی پیرۆزە، شێوان، چ بـەئـاورکـردنـەوە یـا بـە هـەر کـارێکـی لـەو ڕۆژەدا، کـە جـوو نـابـێ بـیکـا، کـارێکـی ناشەرعییە.. دیارە جووتبوونیش لەو ڕۆژەدا هەر شەمەی پێ لەق دەبێ .. سووری سەر ئەبڵەق: کاورای سەرخڕ... هەرامە، وانێك، هینە. باز وتم: هەمدیس گوتم. شەهباز: بازی سپی، باشووکەی سپی. ئەوە نێوە، بۆ پیاوان. شکار ئەنداز: نەخچیر ئەنگێو. ئاهەنگ: بەزم و ڕابواردن. سەرگەڕ: سیسارکە کەچەڵ. فاحیشە: ژنی داوێن تەڕ، گاندەر. مەساف: شەڕ. نەستەق کردن: جووتکردن. ئەیوانی کیسرا: تاقسەرایەکە لە پاشماوەی ساسانییان، لە تەیسەفوون "مەدائین"، لە گوێ چۆمی دیجلە. دیاردیی بۆ ئەوە کردووە، کە پەیامبەر (د.خ) بەئەنگوستی پیرۆزی شەقی کردووە. مەبەستی: مـەستی ئـەفـەندیی مـەسرەفـە. فـەرد: تـاکـە بـەیـتـی شیـعر، بـەمـانـای تـاکـە کـەوشیش هاتووە. مولحید (ع. الملحد): ناخوا، خوانەناس. کافر مەزەب: بێ مەزەب، مەزەبی، مەزەبی کافرانە. مولحەق (ع. الملحق): پاشکۆ، وەپاڵ دراو، لە خشتە بردن: خـاپـاندن، هـەڵـخـەڵـەتـاندن، فریودان. مـونـتـەبـیهـ (ع. الـمـنـتـبـه): ئـاگـا، وریـا. ئێرەق: ڕەق، کێر هەڵستان، کێر ڕەپ بوون.

### (٢٧) **نون***

مـن بـە ئـاشووبـم، بـە جـارێ خـان و بـانـووتـان ئـەگـێم(١)
ئیبنی مەشهوورتان دەیووس و (پیاوی) بەدخووتان ئەگێم

هـەر لـە کـوڕ تـا کـچ لـە سالّـی سەد هـەتـا دووتـان ئـەگێم
یـەك بـەیـەك هـەمسایـەکـانـی دەوری خـانـووتـان ئـەگێم
حـەوشە وو کـوڵان و بـیـر و دار و پـەردووتـان ئـەگـێم
شەرتـە هـیـچـی دەر نـەکـەم تـاکـو کـەنـووتـانیش ئـەگێم
بـاوکـی مـەعلـوومت نـیـیـە لـەعنـەت لـە زاتت هـەی تـەرەس
گـوو بـەگوێی دایکت چـوزانـم دایـە بـەرکـێ پـێش و پـەس

........................................................................

(١) ئومێد کاکە ڕەش، ئەم شیعرە بەهی شێخ ڕەزا نازانێ، (ڕەنگە ئی شوکری فەزڵی بێ)... بڕوانە ئومێد کاکە ڕەش، ل: ٢٥٥).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فاعلان)

وەك: "هر کە چیزی دوست دارد جان و دل بر وی گمارد

هر کە محرابش تو باشی سر ز خلوت بر نیارد"

ئاشووب: ئاژاوە. بانوو: کیژ. دەیووس: دەویت، گەوواد. هەمسایە: هاوسێ، داروسێ. پەردوو: هەڵاشی بان. ئەوەی لە بن قامیشەوەی دادەنێن. تەرەس: دەویت. کەنوو: کەندوو: کواڕ.

(٢٨) نون

**ئالی بەبە***

سائـیـل بـە غـیـنـا نـائـیـل ئـەکـا بـەخششی کـەمـتـان
ئـالـی بـەبـە یـاخـوا نـەڕزێ دەسـتـی کـەرەمـتـان
هـەرچـەنـد بـەمـەسەل خـەنـجـەری ئـەڵـمـاسە زبـانـم
نابڕێ قەد سەری موویێ لە ئەدای شوکری نیعەمتان
گـیـرفـانـی گـەدای کـردووەتـە کـانـی جـەواهـیـر
ئـیـکسیـری نـیساری زەڕە شابـاشی درەمـتـان
ئـێوەن بـەحـەقـیـقـەت مـەلـیـکـی مـیـللـەتـی کوردان
شایـانـە زیـارەت بـکـرێ خـاکـی قـەدەمـتـان

ئینکاری حوقووقیان لەسەر ئەم میللەتە ناکرێ
ئابائی فەرەیدوون فەڕ و جەمشیدی حەشەمتان

..............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفوف مەحزووف
(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)
وەك: "هرگز نبود سرو بە بالای تو داری
یا مە بە صفای رخ زیبا کە تو داری"
سائل (ع. السائل): خواستار. غینا (ع. الغنی): دەوڵەمەندی. ئەڵماس: (پهـ. یو Ooamas): یەکێ لە بەردە بەنرخەکان، کە لەبەر سەختی و رەقی و درەوشانەوەی و دەگمەنی لە سەرلەبەری بەردە بەنرخەکانی دیکە لە پێشترێیە و کاربۆنی بێ خەوشە. کێشی تایبەتی ٢.٥ تا ٣.٦ و پلەی سەختی ١٠یە. ئەڵماس بەیەکانەی کێشی قیرات دەکێشرێ. ئیکسیر معر. یو. Xerion گەوهەرێکی شت توێنەوەیە و چییەتیی تەن دەگۆڕێ و تەواوتری دەکا بەنموونە جیوە دەکا بە زێو و مس دەکا بە زێڕ. هەموو شتێکی بە کەڵك و دەگمەن. شاباش: ئەو پووڵەی کە بۆ پێدا هەڵکوتن لە شاییدا بەچاوەشان دەدرێ.

## (٢٩) نوون

### شێخ عەلیی تاڵەبانی*

بێگانە هەموو ساحیبی جاه و جەبەرووتن
بێچارە برای شێخ عەلی موفلیس و ڕووتن
ئەی شێخ عەلی وا چاکە وسووقت بە برابێ
باوەڕ مەکە بەم خەڵقە کە وەك توولە لە دووتن
قەومێ کە لە عەهدی پدەرت حەلقە لە گۆش بوون
تەحقیق بزانە بەخودا جوملە عەدووتن
ڕەحمیان نییە دەربارەیی تۆ خزم و ئەقاریب
موشفیقترە بێگانە لەمانە کە عەمووتن
نادان و قوڕمساغ و نەزانن کە ئەمانە
گاهێ لە سەما، گاهێ لە سەیری مەلەکووتن

ئـەم تـەكـيـەنشيـنـانـە، چ دەروێش و چ سۆفـی
هەرچەندە بە دڵ موشتەغیلی زیكر و قونووتن
وەك حاجیی مابەینی سەفا و مەروە بە تەعجیل
بۆ لوقمە ئەمانیش بە مەسەل یوونس و حووتن
جـومـعـانـە بـڕاوە بـە خـودا مـوفـلـیسە لامـیـع
نـیٚ پـوولـی حـەمـامـی هـەیـە نـیٚ پـارەیـی تـووتـن

(*) كێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەكفووف مەحزووف
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ معولن)
وەك: "اندوه تو شـد وارد كاشانەام امشب
مهمان عزیز آمده در خانه ام امشب"

نیٚ: نە. جەبەرووت (ع. الجبروت): توان، توانست، توانایی. وسووق (ع. الوثوق): متمانە. توولە: توولە سەگ. حەلقە بەگۆش (ع. ف. حلقه بگوش): ئالْقە لە گویٚ. كینایەتە لە بەندەگی و كۆیلەیەتییان. موشفیق (ع. المشفق): شەفەقەت، بەزەی باوك. عەموو (ع. العم): مام. نادان (ف. نادان): نەزان. سەما (ع. السَّماء): ئاسمان. مەلەكووت (ع. الملكوت): گەورەیی، شان و شكۆ. تەكیەنوشین: تەكیەنشین. قونووت: دوعای سەفا و مەروە: ئەو جێی حـەزرەتـی هـاجـەر، لـە بـۆ ئـاو ئـەمسەر و ئـەمسەری كـردووە و ئـەوڕۆ حاجییان، هەر بەهەمان دەستوور ئەو یادگارە بەیاد دەكەنەوە. تەعجیل (ع. التَّعجیل): بەلەز، بەهەڵەداوان. یونس و حووت: حەزرەتی یونس و قووتدرانی لە لایەن نەهەنگەوە. جومعانە: مووچەیەك بوو. خەڵك و خوا بەفەقیٚ و دەروێش و مەلایان دەدا، هێندیٚ جار فەقیٚ بۆ خۆی گوندان دەگەڕا، سا ئەوەی خوا بەقسمەتی كردبا، لە گەنم و جۆ و خوری و هەر شتێكی دیكە، كۆی دەكردەوە، بژێوی خۆی پیٚ بەڕێوە دەبرد. ئەمن بۆ خۆشم كردوومە. دەگەڵ كاك مەلا سددیقی ئیلینجاغیٚ، پێكەوە لە ٤٥دا جارێكمان جومعانە كردووە.

(٣٠) نوون

## کچی حەسەن کەنۆش*

حـــەسەن کـــەنـــۆشەن، حـــەسەن کـــەنـــۆشەن
ئـــیـــنـــە کـــنـــاچـــەی حـــەسەن کـــەنـــۆشەن
کـــەلـــلـــەش شڵـــەقـــیـــاو نـــاوگـــەڵش بـــۆشەن(١)
کـــونـــای قـــیـــریـــنش دایـــم وە جـــۆشەن
کـــوڕکـــەش دێوانـــەی کـــەڵپـــووس نـــە دۆشەن(٢)
بـــەلـــۆکـــەش لـــۆلـــۆن چـــوون گـــەدەی مـــێشەن
هـــەر لـــۆیـــێ جـــەوێش چـــل کـــێر نـــە تـــۆشەن
دەلـــۆن هـــەر لـــۆیـــێ سەد کـــێر نـــە تـــۆشەن(٣)
وێنـــەی هـــەر وە فـــاڵ هـــەر وە خـــرۆشەن
پـــەی کـــێر قـــەوی خـــەیـــلـــێ پـــەرۆشەن
بـــۆس و کـــەنـــار و خـــەڵـــوەتش خـــۆشەن

.............................................................

(١) کەڵەش شلەقیاو ناوگەڵش بۆشەن (کش).

(٢) کورکەش دیوانەی کەڵپۆس نەدۆشەن (دیوان). کوڕکەی دیوان کەڵپۆس نەدۆشەن (کش).

(٣) وەخۆش یەکێ ناو گەلش فۆلۆشەن.

هەر لۆیی گش چل کێر نە تۆشەن (کش مەلا ئەحمەدی دەکە).

بۆ زێدە زانیاری بڕوانە ئومێد کاکە ڕەش. ل: ٢٥١

(*) کێش: بەحری ڕەجەز مورەببەع مورەفەل

(مستفعلاتن مستفعلاتن)

ئەم شیعرە کێشەکەی دە بڕگەییی وەك سەرلەبەری شیعرەکانی مەولەویی بەهەشتی و بێسارانیی نەمر، کە لە گوێن: تەرلان تەوارێ تەرلان تەوارێ ـ یە...

ئینە (کۆ.): ئەمە. کناچە: کچ، کەنیشك، کەنی. کەلە: سەر. شڵەقیا: شڵەقاو. ناوگەڵش: ناوگەڵی. بۆشەن: بۆشە. کونای قیرینش: کونی وەك قیری ڕەشی: هەمیشە بەجۆش و خرۆشە. کوڕکەش: میتکەی. دە لۆن: دە لۆیە. نەتۆشەن: تێدایە. وەفاڵ: بەتەڵەب.

وا باوە کە پیرۆزی کچی حەسەن کەنۆش بەم شیعرانەی وەڵام داوەتەوە؟!

ڕەزا وە زەفتم ڕەزا وە زەفتم
هیچ کەس نەکەردە وە تەعدا زەفتم
دەمت وە مابەین چاڵ ئەشکەفتم
بچێ وە چاوتا بەکۆکی چەفتم
ترم تەمەیرە تسم سازت بۆ
گوزم هەفتاوەی دستنمازت بۆ
ئانە چەند وەقتەن ئەحواڵت پرسم
لووتت وە (کون)م دەمت دەمت وە کوسم
وەی عابای دڕیای لا شانتەوە
وەی مایین شێ یاڵ پانتەوە
دشمن سابیقین بۆ خوا بوون شایەت
شەرعمان بکەون وە عورف و عادەت
ڕەزا لەی کارە پەشیمان بوێوە
بە ڕشی ڕەزا بە هاوە کوێوە
هەر لە منداڵی تا ئێستە بویتە
کەلەش خۆت وەبان چەند کێڕێ دیتە
ئیسلامان بۆ خوا، بوون شایەت
شەرعمان بکتەن وە ڕەسم عایەت
بزانن ئێمە دوشمن سابیق نین
سەبەب ئەی ئەشعار بەد فەڕش پەی چین
یەقین جە شوبهـ دەرد هارییەن
ڕەوشت زشت و مەرد ئازارییەن
بوینۆن وە حەق، خەتا جە کامەن
مەعلووم ڕووسیای خەواس و عامەن
ئەومان (پەساو پەس) سواری هەر کەرەن
(خۆڵ و دۆ ڕێز) و لە شار وەدەرکەن

ئەی شێخ دین خاس ئەی شێخ دین خاس
حکاك دانا پسپۆڕی ئەجناس
سەگی دندان گیڕ، ئاشنا نەناس
پەی چییەن دووریی، جە ڕاوڕەسمی ڕاس
تایەفەی شمر شووم ئەلخەنناس
گەماڵی گەورە، جەکێ مەکەی پاس
یازووخەن، تۆ کوڕ (شێخ ئەوڕەحمان)ی
ڕیش چوگەندە مووی (بەر)ی (سۆزانی)
حەیات نەهێڵا پەی تاڵەبانی
وەهەر (چوار مەزەب) لاییق نەمانی
ئای بۆ دەلاکێ سەرت بتاشێ
ڕیشت قوت بکا چون کلکی جاشێ
ڕەزا، لەی کارە پەشیمان بێوە
بزانی ڕەزای خوا ها وەکوێوە
بەخشمەت وە خوا، وەرنە مەتوانم
کەللەت بنێمە ناو جفتەی ڕانم
وێنەی سەگ هار تا نەتخنکێنم
عەهدەن، کەللەتی لێش دەرنەهێنم
من تەقییەی (شێخ عەلی) ئەمگرێ
ئەرنا عیلاجی (ڕەزا)م پێ ئەکرێ
مەعلوومەن (ڕەزا) کونای ئەخورێ
هەر بەم ڕەوشتە، لە خشتە ئەورێ
دەستە لاوێکی ئەنێرمە تەك
(کون) و (کیس گون)ش بکەرۆن وە یەك
تابوێتە پەند، لەی کارە لاچێ
پەی (شێخ عەلی)یەن دەسم تێش ناچێ
(شێخ عەلی) تۆ شێخ نەی شارەی چییە؟
(ڕەزا) ناموس و حەیای لا نییە

عــالـــەم جـــە (ڕەزا) دەروون پـــڕ ئـــێشەن
تـــەحـقـیـق تـۆش جـە ئـــەو دڵت وە ڕێشەن
سەرش پـــانـــکـــەرۆ، چـــون مـــار ژاردار
پـــەنـــد پـــێشیـــنـــەن، شەرع مـــار وە دار

(٣١) نوون

**ئەم سادەڕوخانە***

ئـەم سادەڕوخـانـە لـە مـەلاحـەت کـە تـەمـامـن
دەورت کە دەدەن، تەفرە مەخۆ، قەت مەڵێ ڕامن
گەهـ دۆست و وەفـادار گەهـێ دوژمنی خونخوار
دڵ نـەرم دەبـن گـاهـ و گـەهـێ سەخت کـەلامـن
عـاجز مەبە، نەك بۆ تۆ، وەفـایـان نییە بۆ کەس
مەعلوومە کە ئەم تاقمە وەك تاسی حەمامن

............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).
وەك: "هر گز نبود سرو بە بالا کە تو داری
یا مە بە صفای زیـبا کە تو داری"
سادەڕوخ (ف. سادە رخ): لووس. مەلاحەت (ع. الملاحە): جوانییەکی مەزەدار. تەمام (ع. التَّمام): تەواو، بێ عەیب. تەفرە: فریودان، خاپاندن. ڕام (ف. رام): کەوی، ماڵی، فێر. سەخت کەلام: قسەڕەق. تاسی حەمام: مەبەست بێ بارییە . تاقم (ت. طاقم): دەستە، گرۆ.

(٣٢) واو

**شین بۆ سەرداری ئاکۆ***

ڕووخـانـدی گـەردشی گـەردوون لـە هـەرجێ ئـاستـانێ بـوو
سوتـاندی چەرخی دوون پەروەر لە هەر کوێ ئاشیانێ بوو

وەکو تـەیـیـی سجـیـلـلـی لـیـلـکوتـوب پێچایـەوە گەردوون
لـەهــەر مـیـهـمـانسەرا ئـاساری سفـرە و نـان و خـوانـێ بـوو
بـە حـاتـەم گـەر بکـەی تـەشبـیـهـی ئـەم ئـاغـایـە، بـێ عـەقڵـی
کـە فـەرقـی ئـەم لـە گـەڵ ئـەو ئـاسمـان و ڕێسمـانـێ بـوو
درێغ بــۆ خــانــەدانــی مــارف ئــاغــای سەروەری ئــاکــۆ
کە جێگەی عەیش و عوشرەت، مەنبەعی ئەمن و ئەمانێ بوو
لە جوود و بەخشش و ئینعامی خۆی و قەوم و ئەتباعی
وەکـو شانـامـەیـی ڕۆستـەم لـە هـەرجـێ داستـانـێ بـوو
کەیومەرسی دووەم، جەمشیدی سانی، خوسرەوی سالیس
سولـەیـمـانـی زەمـان، ئـیسکـەنـدەری ساحـێبـقـڕانـێ بـوو
شەوی وەك زوڵفی یار و ڕووی حەسوود و بەختی من تاریك
لـەگـەڵ دەیـجـووری یـەلـدا وا حـیساب کـە تـەوئـەمـانـێ بـوو
بەنامەردی شەهیدیان کرد، وەکو حەمزە و عومەر دوژمن
مـوراد ئـاغـا کـە ڕۆژی جـەنگ و دەعـوا قـەهـرەمـانـێ بـوو
کەسێ ئەم سەروی ڕەعنایەی لە پێ خست گەردنی بشکێ
چ زیـبـا سوورەتـێ یـاڕەب، چ شیـریـن نـەوجـەوانـێ بـوو
(موراد)یان بۆیە ناو نابوو لە وەختی بەخشش و ئینعام
لـە بـۆ بـانـی مـوراد دەستـی کـەریـمـی نـەردەبـانـێ بـوو
لە حەق شێخ و مەلا و دەروێش و سۆفی و سائیل و سەییاح
وەکـو حـاتـەم، شەفـیـق و دڵـنـەواز و مـیـهـرەبـانـێ بـوو
ئـیـتـر نـەتـبـێ لـە مـوڵـکـی ڕۆم ڕەزا ئـومـمـیـدی ئـاسایش
لـە پـێش ئـەم کـارەدا هـێشتـا ئـومـێدی پـارچـە نـانـێ بـوو

---

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).

وەك: "دلا یارا دگر جوستی بدین کار از تو خوشنودم

تو از یاری بیاسودی من از خواری بیاســودم"

گەردشی گەردوون (ف. گردش گردون): سوڕو گوڕی چەرخ. ئاستان (ف. آستان): هاسانە، سەردەرانە. ئاسانە. دوون پەروەر: هەمیشە هەر پەست و نامەرد پەروەر، حیز و گەواد و ئاڵچاخ پەروەر. ئاشییان (ف. آشیان): هێلانە، هێلوون. تەییی سیجیل لیکلوتوب (ع. طيِّ السِّجِّل للكتب): وەك كتێب پێچانەوە، لە دەفتەردا: لە تۆماردا. میهمانسەرا (ف. مهما سرا): میوانخانە. ئاسار (ع. الآثار): ئاسەوار، شوێنەوار. سفره: خوان. حاتەم: کاورایەکی دڵاوا و دەهندەی عەرەو بووگە. ئاسمان و ڕێسمان: دوو وشەن بۆ لێك دووفاقیی دوو شتان دەگوترێ، دەنا هیچ پێوەندییەکیان پێکەوە نییە.. هەر لە دەنگدا هاوکێشن. جود (ع. الجود): سەخاوەت، دەهندەیی. ئینعام (ع. الإنعام): بەخشش دان. شانامە نێوی بڕێ کتێبی پەخشان و هەڵبەستی لیریکین، کە سەربوورەی شایانی ئێرانیانی تێدا باس کراون. شانامەی فیردەوسی لە هەموان نامێترە. لە دەوروبەری ساڵی ٣٧٠ـ٣٧١ڕۆ. م.دا، دەست بەهۆنینەوەی کراوە. فیردەوسی شانامەی بەنێوی سوڵتان مەحموودی سەبوکتەکینی غەزنەوییەوە داناوە. نزیکەی شێست هەزار بەیت دەبێ... کەیۆمەرس (پ. ف. کیومرث): زیندووی فانی، زیندوویەك کە لەناودەچێ و نامێنێ.. بەپێی نەقڵی زەرتوشتیان یەکەم مرۆ، حەزرەتی ئایەمە. بەپێی نەقڵی شانامەی فیردەوسی، یەکەم پادشای ئێرانیانە.. گیومەرز، گیو مەرد، گیومەرس، بەم هەموو ناوانەوە هاتووە. ساحێبقران (ع. صاحب القران): کەسێ کە لە کاتی نوتفە پەیدا بوون، لە کاتی لەدایکبووندا بەیەك گەیشتنێك لە نێوان ستارە گەڕۆکەکاندا ڕوو دەدات، ئەوە بەکاتی ئیقباڵ و دواڕۆژی خۆش لێك دەدرێتەوە.. شەوی وەك و هتد... شەوی وەك زوڵفی یار و ڕووی حەسوود و بەختی خۆی چواندووە. جەمسەر لێکچواندنەکەش ڕەشی و تاریکییە. دەیجوور (ع. الدَّیجور): شەوەزەنگ، تاریك. یەلدا (سو. یلدا): درێژترینی شەوی ساڵ، شەوی یەکەمی پشکی بزن، شەوی چلەی گەورەی زستان. وشەکە بۆ خۆی لە زمانی سوریانیدا بەمانای لە دایك بوونە. لەبەر وەی شەوی یەلدایان دەگەڵ لەدایکبوونی عیسای مەسیحدا جووت گرتوون، بەو نێوەیان نێو ناوە.. یەلدا ناو، لە ناو فەلاندا زۆرن.. تەوئەمان (. التَّوأمان): جمرانە، دووانە. مراد ئاغا: لە ساڵی ١٢٩٣ی ك. دا تەقیەدین و عومەر پاشای دیاربەکر هۆزی ئاکۆیان تاڵان کرد، مراد ئاغای فارس ئاغا و محەمەد ئاغای عەبدوڵڵا ئاغایان گرت و دە زیندانیان هاویشتن. مراد ئاغا لە زیندانی کەرکووکدا مرد. لەسەر خواستی قادری وەستا خدر، شێخ ڕەزا ئەم چامەیەی بۆ گوتووە. ڕەعنا (ع. الرَّعناء): بەمانای ئەحمەق و خۆپەسند و گەمژە و حۆل هاتووە.

بەڵام بەکوردی و فارسی بەمانای گوڵێکی جوانە. لە پێ خستن: لە ناوبردن. گەردن: ئەستۆ. زیبا (ف. زیبا): جوان، نەوجەوان (ف. ك. نوجوان): تازە هەڵچوو و لاو. نەردبان(ف. نردبان): قاڵدرمە، پەیژە، پلیکانە.

(٣٣) واو

**سولەیمانی کە دارولمولکی بابان بوو***

لە بیرم دێ سولەیمانی کەدار و مولکی بابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو
لەبەر قاپیی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهید
مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
سەدای مۆزیقە و نەقارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
درێغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە، ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لە دەوری کانی ئاسکان بوو
بە زەربی حەملەیێ بەغدایی تەسخیر کرد و تێی هەڵدا
سولەیمانی زەمان ڕاستت ئەوێ باوکی سولەیمان بوو
عەرەب ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەڵن، ئەمما
سەلاحەددین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو
قوبووری پڕ لە نووری ئالی بابان پڕ لە ڕەحمەت بێ
کە بارانی کەفی ئیحسانیان وەك هەوری نیسان بوو
کە عەبدوڵڵاهـ پاشا لەشکری والیی سنەی شڕکرد
ڕەزا ئەو وەختە عومری پێنج و شەش تیفلی دەبستان بوو

---

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك: "تو از هر در که باز آیی بدین خوبی و زیبایی
دری باشد که از رحمت به روی خلق بگشایی"

دارولمولك (ع. دار الملك): جێی فەرمانڕەوایی. بابان: بەبنەچە دەچنەوە سەر بابا، باوەکانی ئەهلی هەق. دوا بەرەیان لە دارەشمانە، سەریان هەڵداوە... عوسمانی بەنازناوی هەر بەناو پاشا ئاوڕێکی لێ داونەوە، بەڵام نازیان لەلایەن سوڵتانەوە کەم دەگیرا. پاشایەکانی بەغدا کە هەر یەکە لە تیرەیەکی خوبزەی وەك ئەرمەنی و بۆسنەیی و گورجی و هەرسەکی و کۆسۆڤۆیی و پۆماك و لاز و ئەنجاز و چەرکەس و تەختەچی و یۆنانی و مەکەدۆنی و مۆنتی نیگرۆیی و کورویش و ئەڕنەووت هتد..ی بەزۆر سورمانکراوی عوسمانی بوون، هەمیشە، لە دژیان بە بڕوبیانوو و گزی و فزی بوون، خانە بەگ و عەبدوڕەحمان پاشا و خالید پاشا و مەحموود پاشایان نامێ و هەڵکەوتە بوون... لە ئاکامی دەست لە کاروبار تێوەردانی ئێران و عوسمانی، هەمیشە برا دەگەڵ برا و مام دەگەڵ برازادا، لە کێشە و هەراو دووبەرەکی و لێك خەفتاندا بوون.. لە سای دوژمنی هەردوو لا ، لەشکر لە یەکدی کردن و کورد بەکورد کوشتن، میرنشینی باوان، تەنانەت بۆ یەکسەر دەگەڵ بەغدادا بەڕەسمی هاوپێوەند بوونیش ڕێگە نەبوو، دەبوا جڵەویان بەدەست کۆنە عیسەوییەکانی وەکە ماڵی جەلیلی زادانەوە با. ئەوەی عەبدوڕەحمان پاشا بۆ بەغدای کرد، نەتورکێ نەعارەبێ، بۆی نەکرد. خۆ ئەو نەبا، عارەبی ئەحسایی لە مێژ بوو ئەسڵەن هەر نێوی عیراقیش لەسەر نەخشەی ساختەی ئینگلیز نەدەما، سەیر ئەوەیە لە کاتی قەیرانی بێ پاشایی بەغدایێدا، چەنانێ قسە لەوە دەکرا، عەبدوڕەحمان پاشا ببێ بەپاشای بەغدایێ، بەڵام عارەبی بەغدا و کۆنە عەجەم و بەهەزاران پەت پسێنی لە بەغدا مۆڵ خواردوو، گوتیان کورد پادشاییی لێ ناوەشێتەوە.. ئەدی عەبباس مەحموود ئەلعەققادی بەڕەگەز کوردیش ئەوە نییە فەرموویە: هێندێ جار پیاوی گەورە لە نەتەوەی هەرچی و پەرچیی وەك سەلاحەددینی کوردیش هەڵدەکەوێ... ئەی لەمنت کەوێ، کوڕە باوکلافەدەزوو فرۆشەکە بۆ خۆت و هەستی خۆ بەکەم زانینت... سوخرەکێش: بەبێگار کارکەر. ئالی عوسمان: بەرەی عوسمانەکەی بیابانی تورکستان. گردی سەیوان: گۆڕستانەکەی شاری سلێمانی. جریدبازی: بەسواریی ئەسپ قاشوانێ. کانی ئاسکان: ئێستا گەڕەکێکی زۆر گەورەی ناوشاری سلێمانییە. باوکی سلێمان: واتە عەبدوڕەحمان پاشای باوان. ئەفزەل (ع. الأفضل): چاتر. سەلاحەددین: سەلاحەددین یووسف، نازناو: بە الملك النّاصر کوڕی نەجمەددین ئەییووب کوڕی شادی کوڕی ئەیووب بەکونیەی ئەبولموزەفەر ناسراو، دامەزرێنی

زنجیرەی فەرمانڕەوایانی ئەییووبییان. لە ساڵی ٥٣٢ڕۆ. م.دا لە تكریت لە دایك بووە. بەرەچەڵەك كوردە و زێدی باو و باپیرانی گوندی "دوین"ی لای ڕۆژهەڵاتی هەولێرە. هێندێ دەڵێن: مەبەست لە "دوین" ئەوەكەی لای ئازربایجانە.. سەلاحەددین پیاوێكی زۆر لە خوا ترس بووە، ئەو نەبا شیعەی فاتیمی بڕستیان لە سوننی مەزەبی میسر و جەزائیر و مەغریب و توونس و لیبی و سوریە و لوبنان دەبڕی. ئەو نەبا خاچپارێزان ولاتی شام و فەلەستینیان لە مێژ بوو داگیر كردبوو. با عارەب نانێ بخوا و یەكێ بەسەدەقە سەری ئەو كوردە بكا، كە ئابڕووی لە بۆ كڕینەوە.. ئەوجا هەر سەلاحەددین؟ ئەدی سەرلەبەری ولات گرتنەكانی عارەب و تورك بەدەستی كوردی ئازا و مل لە تێخ سوو سەرویەر نەنراوە.. كورد باب "الأبواب"ی بۆ عارەب وەسەر پشت نەئێخست، كورد گراڤی قەندییە و كریت و قیبرس و بۆسنە و هەرسەك و كۆسۆڤۆ و ئەرنەوتستان و كورویشستان و سربستانی بۆ سوڵتان داگیر نەكرد.. تەنانەت لە شەڕی عارەب و یەزگورددا لە مەدائین كورد لە تاو بۆگەنیی ڕژێمی ساسانی، شەڕیان بۆ شای ساسانی نەكرد. یەزگورد تا بۆ خۆراسان چوو و وەگەڕا، كار لەكار ترازابوو... تفلی دەبستان: قوتابییی سەرەتا.

### (٣٤) واو

### لە وەختی زەرفێندا*

ئەی مەلا تۆ قەت تۆ لە زەرفێندا وەها خێرا نەبووی
یا لە حیزیی بەختی من یا مۆرەكەت مووی پێوە بوو
حاڵ لە سێ خاڵی نییە تو خودا بەڕاستی پێم بڵێ
مووی سمێڵت یا بەرت یا كلكی یابووی پێوە بوو
وا دەزانم مووی ڕزیوی پێستی دەبباغخانە بوو
چونكە ئاساری كەتیرە و جەوت و مازووی پێوە بوو
پەشمی پاشت بۆ مەزەندە چونكە وەختی ڕۆژهەلات
دیققەتم كرد دەور و پشتی زەرفەكان گووی پێوە بوو
مووی سەگی گڕوێش وەها نابێ بەتەخمین سەد هەزار
ڕشك و ئەسپێ و كێچ و كەهلە، كرم و كڕنووی پێوە بوو

ئـەلـغـەرەز دوو پشكـی ڕۆحـم چـوو لـە تـرسان ئـەو شەوە
هـێنـدە دووپشك و هـەزارپـێ و مـار و مـێرووی پـێوە بـوو
قـاوەچی ڕووی سینیـیـەكـەی هـەرچـەند بـەنـینۆك هـەڵكڕاند
قـەلـعـی ئـاساری نـەكـرد هـێشتـا بـەشی تـۆی پـێوە بـوو
زۆر نـەمـا بـوو بـۆنـی سەرگـیـن بمكـوژێ، وا تـێ دەگـەم
تـووكـی بـن كـلـكـی كـەر و بـارگـیـری مـردووی پـێوە بـوو
داوەكـەی مـوویـیـن و گـڕویـنت بـەكـاری هـیـچ نـەهـات
گەرچی هەرلایێ دووسەد ئەفسوون و جادووی پێوە بوو

(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: گل اگـــر یـــك دم بكـــام بلبل شیدا شود
كام دل نگرفتە خاری در میان پیدا شود"

زەرفێن: یاریی سینی و زەرف. ژمارەیەك زەرف لە فنجانی زەرد دروستكراو لە سەر سینییەك دادەنێن، خەڵكێكی لە دەور خڕدەبنەوە، دەبن بەدوو دەستەوە. یەكێك گوستیلكێك دەبن یەكێ لە زەرفەكاندا وەدەشێرێ. دیارە ئەو كاری گوستیلك دەبن یەكێ لە زەرفەكاندا وەشێردنە، لە ژێر پەردەیەك و لە پەناوە سەروبەر دەنرێ. ئەوجا یەكێك لە دەستەی بەرابەر كە لە زەرف هەڵێناندا زۆر شارەزا و لێزانە، دەكەوێتە مەزەنە لێدان و بیركردنەوە و ڕەنگ و ڕوو خوێندنەوەی وەستای بەرابەر، كە گوستیلكەكەی وەشێردووە قامكی كەڵەی بەبن زەرفێك لە زەرفە دەمەوڕووەكاندا دەگرێ زەرفەكانی دیكە زڕ، هەموو هەڵدەڕێژێ و گوستیلك لە بن ئەو زەرفەی قامكە كەڵەیدا دەمێنێتەوە و كایەكە بەم ڕەنگە دەباتەوە.. یا زۆرجار ئەو كارە دووبارە و سێبارە دەكرێتەوە و گوستیلك دەبن زەرفێكی دیكەدا بەدیار دەكەوێ و نابرێتەوە.. ئەو كایەیە لە مانگی ڕەمەزاندا دەكرێ.. موو بەمۆرەوە بوون: شێوانی مۆرەكە مەبەستە. یابوو: بارگین، بارگیر. كەتیرە: ئەو بنێشتەی كە لە گوێنی، گەوەن دەردەهێندرێ. جەوت: قەپێلكە بەڕوو. مازوو، مازی، مازگ. گڕوێ: گەڕ. تەخمین: (ع. التَّخمین): لێكدانەوە، هەڵسەنگاندن. ڕشك: گەرای ئەسپێ. كەهلە: كڕنوو، جۆرە

ئـەسپـێیـەکـی چـنـگـورِك تـیـژە، لـە جێگـای تـووکـنـی وەك بـەر و شوێـنـی لـەم جـۆرە بـابـەتـانـەی مرۆ دەدا.. دیارە ئـەوە لـە ئاکامـی پیس و پۆخـەڵیی لـەش پـەیدا دەبیٚ.. کـەسێك کرِنوو لێی بدا، بۆ حـەوتوویـەك ـ دوو، تووشی کـەم خوێنی دەبیٚ. کورد وەك هـەر شتێکی دیکـەی خراپ کرِنوو لـە لـەشدانیش بـەنیشانـەی هـات و نـەهـات و تـەخت و بـەخت نـابووت بوون و لـەناوچوون لـە قـەڵـەم دەدا. ئـەگـەر کرِنوو سـەربـەرەژێر لـە مرۆ بدا، ئـەوە نیشانـەی نـەگبـەتی و نـەهـامـەتییە، ئـەگـەر سـەربـەرەژوور لێی دا، ئـەوە نـیشانـەی تـەخـت و بـەخـتـی چـاکـە... ئـەلـغـەرەز (ع. الـغـرض): مـەبـەست، خـۆلاسـە. دووپشك: کولاژدم. کوژدم، ئـەقرەو. قـەلـع (ع. القلـع): هـەڵکـەندن، هـەڵقـەنـاندن. ئـاسـار (ع. الآثـار): ئـاسـەوار، شۆپ، شوێن. سـەرگین: شیاکە. موویین و گوویین: مووا‌وی و گوواوی.

## (٣٥) واو

## نینۆکی شێخ رِەزا و کلکی حـەسـەن هـەمزە*

حـەسـەنی هـەمزە لـەسـەر "شـەم" کە چییە تـەفسیری
دەست بـەشمشێر لـەگـەڵم ساحیبی دەعوا دەرچوو
مـن وتم نـاخـوێنـی شێر. ئـەو وتـی کـلـکـی شێرە
لـەسـەر ئـەم لـەفزە بـەسیٚ شوورش و دەعوا دەچوو
گـرەوم کـرد لـە گـەڵـی، چـووم و کـتـێبـم هـێنـا
نـاخـونی مـن نـەبوو کلکی حـەسـەن ئـاغـا دەرچوو

..............................................................

(*) کێش: بـەحری رِەمـەل موسـەممـەن مـەخبوون ئـەصلـەم
(فـاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)
وەك: "صنمـا مردەء آنم کە تو جـانم بـاشی
می دهم جـان کە مگر جهـانم بـاشی"
تـەفسیر (ع. التَّفسیر): لێکدانـەوە و شرۆڤـەکردن. ساحیبی دەعوا: خـاوەند کێشە و داوخواز. نـاخوێن: نینۆك، نووخـان، نـاخوێن.

## (٣٦) هێ
### پاسی تازە*

دەنگی بەزم و سازە ئەمڕۆ تێم گەیێنن چی بووە
وا توجار و نەوکەر و ئاغا دەماغیان گرتووە
کاتیبانی دائیرە و مەئموورەکانی زی شەرەف
زۆر بەکەیفخۆشی ئەبینم خەڵقە چیتان بیستووە
بێ عەبا شان داچەقاو ملحیزەکانی مەملەکەت
وا دەڕۆن و دێن نازانم چییان لێ ون بووە
چوونە کن خواجە مووشێ و و خۆی و ئەتباعی بەکەیف
حەزرەتی مەبعووسی ئەکرەم دەستی یەکیان گرتووە
فایقی تاپۆ، حەمەد بەگ با مودیری تانجەڕۆ
مەزبەتەی ناموسی خۆیان بۆ حوکوومەت ناردووە
حاکمی سوڵح، غەفوور ئاغا، جەنابی بابلێ
فرسەتە هاوار ئەکەن وا پاسی حیزی دەرچووە
ناگەهان جاڕچی نیدای کرد ئەی ئەهالیی موعتەبەر
بێنەوە وا مۆدەیەکی تازەتر پەیدا بووە

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن).
وەك: ″یاد می داری کە روزی جنگ با من داشتی
رای رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی″

دەماغ گرتن، دەماغ کردن: بەمانای کەپوو هەڵپێچانە. دیارە شێخ ڕەزا بەمانای ″کەیفیان ساز بووە″ دەکار بردووە. توجار: بازرگان. نەوکەر: نۆکەر. ئەم وشەیە بەڕەچەڵەك مەنگۆڵی ـ تورکییە. تەنێ بۆ پیاو بەکاردێ. بەمانا نۆ کەریش دێ. قسە قسان دێنێ: کوردێکی لە فێرگەکانی حوکوومەتی ئینگلیس دامەزرێنی عیراقدا میزاج کوردەواری شێواو، وشەی ″نۆکەر″ی بەزمانی حارەبی، بە ″تسعة زمایل″ وەرگێڕابوو... ئەدی ″وکبا بە الدهر″؟ یەکی دی لەو کوردی وحارەبییە سێ

زەردێنەزانانە، ئەم عیبارەتەی بەکەبابی نازانم چی "تەرجەمە کردبوو... زی شەرەف: خاوەن شەرەف، وشەکە (ذو، ذا، ذی) لە ئەسمای سیتتە، یا خەمسەن... وەك (ذو مال، ذا ما، ذی مال)... ملحیز: مل چەوت. وشەی حیز بەمانای ترسنۆك، ژنی سووك، پیاوی چاوباز دێ. لە فەرهەنگە فارسییەکانمدا نەدیتەوە... بەتورکیی ئەنەدۆڵیش ئەم وشەیە نییە. زێتر لە نێو کورد و تورکماندا باوە، تەنانەت کوردی لوڕ و کەلوڕیش دەیڵێن. وەك "داڵك حیز" بەڵام (ح)یەکە دەکەن بە (خ)... تورکمانی کەرکووك، لە ٣٠ ـ ٤٠ کاندا، دیارە لە نێو هەرزەکار و منداڵاندا، ڕکیان لە یەکێك با، لەسەر دەرکەیان دەنووسی: (حیز ٥٨)، واتە پەنا بەخوا، لە هەردوو سەرەوە... حیز ـ بە کوردی: چاوحیز، کوز حیز، ژن حیز، خوشك حیز، داك حیز، زلحیز و هتدمان هەس... بەڕاست بەبیرم هاتەوە، وشەی "زلهێز"، هەرچەند ئەمەم گوێ لێ دەبێ، یەکسەر "زلحیز"م بەبیردا دێ... ون بوون: گوم بوون. خواجە، خواجا: نازناوێکە بۆ جوولەکە و گاوری دەوڵەمەند، بۆ مەلا و مامۆستا و پیاوی خەسێنراو، گون دەرهاتگ وەکار ئەورێ، خاوەن مام. با مودیری: دەگەڵ مودیری. تانجەرۆ: بەستێکە لە خوار سلێمانییەوە... ئاوی سەرچناری پێدا شۆڕ دەبێتەوە. مەزبەتە: عەرزوحاڵی دەستەجەمعی. پاس: ئیجازە، ودم، وشەیەکی فەڕەنگانە... بەمانای ئیجازەدان بەگوزەرکردن. ناگەهان: لە ناکاو، لە پڕ. مۆدە: بەند و باو. حەکایەتی ئەم موزاهەرەیە زۆر نامێیە، ئێرە جێی نییە باسی بکەم، حوکومەتی ئەو سەردەمە ویستوویە، خەڵکی سلێمانیی هەمیشە ئازا و زیرەك، ڕێسەکەیان لێ بەخوری کردوونەوە...

## (٣٧) هێ
## دلبەرانی کۆیە*

شاری کـۆیـە کـە لـەبـا لـەب لـە بـتـی غـونـچـە لـەبـە
گەر فەلەك لێی بگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەرەبە
دلـبـەرانـی بـەمـەسەل هـەر وەکـو ئـەشعـاری مـنـن
کـامـی لـێ ئـەگری ئـەبـێژی ئـەمـەیـان مونتـەخـەبـە
غـارەتـی عـەقـڵـی مـنـی کـردووە زیـبـا سـەنـەمـێ
عـاریـزی ڕەشکی قـەمـەر، قـامـەتـی نـەخلـی ڕوتـەبـە

نەوزەرئاسا و و فەرەیدوون سیفەت و سەلم ڕەوش
شێرمانەند و سیاوەش وەش و خوسرە و لەقەبە
عاریز و غەبغەب و ڕوخسار و زەنەخدان و لەبی
نــازك و تــورفــە وو زیـبـا وو بــەدیــع عــەجــەبــە
دلـبــەر و زەڕکــەمــەر و جـیـلـوەگـەر و عیشوە فرۆش
سەروی سیمین بەدەن و شاهید و شیرین لەقەبە
زالــم و دڵ شکــەن و دۆست کــوژ و خــەسم نــەواز
عـیسەوی دیـن و مـوغ ئـایـن و فــەڕەنـگـی مـەزەبـە
سێوی داناوە لە ژێر لێو، کە ئەمەم گۆی زەقەنە
زیـوی خـڕ کـردووە وەك گـۆ، کـە ئـەمـیشم غـەبـەبـە
خـواستــی لـێی مـاچـێ ڕەزا کـافـرە نـەیـدا و وتـی
ئەی خودا لەم کوڕە شێخ زادەیە چەند بێ ئەدەبە

.............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).
وەك: ″ هرگزم نقش تو از لوح دل و جان نرود
هرگز از یاد من آن سرو خرامان نرود″

لە بالەب: لێواولێو، پڕ. بوت: هەر شتێکی لە شێوەی ئایەم بپەرسترێ. نۆش لەب: نۆش لێو.. لێوان نۆش دەکا، مەجازێکی ئەقڵییە. واتە شاری کۆیە پڕە لە بتی نۆش لێو. عەیش (ع. العیش): ژیان و ڕابواردنی خۆش. تەرەب (ع. الطَّرب): لە ئاکامی گوێ لە ستران و موزیك گرتن، حاڵەتی هەست بەخۆشی کردن. دلبەرانی بەمەسەل و هتد... تەشبیهـ کردنی دلبەرانی کۆیە بەشیعری شێخ ڕەزا: پەسنی هونەری شێخی تێدایە.. وەجهی شەبەهـ ″نخبە″یەتییە، هەڵوژێردایەتییە... واتە: هەموویان جوانن. غارەت (ع. الغارة): یەڵغار، بەسەر دوژمندا دان. زیبا سەنەمێ: سەنەمێکی جوان، کیژێك کە وەك سەنەم جوانە.. جوانیی سەنەم، بەباوەڕی سەنەم پەرستان، پیرۆزییەکەیەتی. عاریز (ع. العارض): ڕوومەت و زڵف. ڕەشك (ف. رشك): ئێرەیی، حەسوودی. قەمەر (ع. القمر): مانگ. قامەت (ع. القامة): بەژن، بالا. نەخل (ع. النَّخل): دارخورما. لە بیرمە

جارێکیان سوعاد سەباح، شاعیری کووەیت، بەدارخورمای عێراقیدا هەڵدەگوت، خۆزیی بەوە دەخواست، شووی پێ کردبا؟ دیارە لەبەر چی، ڕوتەب (ع. الرُّطب): فەریکە خورما، خورمای تەڕ. وەجهی شەبەهـ لە نێوان ڕوومەت و مانگدا، شکڵی وەك داسوولکەییی هەرتکانە و لە نێوان بەژن و دارخورمادا، بڵندی و ڕێکوپێکی و شووشییەت. نەوزەر: ناوی کوڕی مەنوچەهر، پادشای پێشدادی، کە لە پاش وی بوو بە پادشا و بەدەستی ئەفراسیاب گرفتار بوو و بەزی و سەرانی لەشکر کوشتیان. فەرەیدوون: یەکێ لە مەزنانی داستانی هاوبەشی نەتەوە ئارياييیەکانی هیند ـ ئێرانی، لە داستانە ئێرانییەکاندا بەیەکێ لە پادشایانی پێشدادی لە قەڵەم دراوە. فەرەیدوون لە نژادی تەهمووری دێوبەند بوو، کاوێك فەرەیدوون هێمان شیرەخۆرە بوو، زوحاك، ئەستیاك، بابی کوشت. ″فرانك″ی دایکی، کوڕی خۆی هەڵگرت، هەلات، چووە مێرگوزارێك، لەوێ منداڵەکەی بەشیری چێڵ بەخێوکرد. چون ئەستیاك لە ستێرناسانی بیستبوو کە بەدەستی فەرەیدوون لە نێو دەچێ، هەمیشە لە دووی دەگەڕا و منەییی دەکرد بیکوژێ.. داکی فەرەیدوونیش لە ترسی ئەستیاك کوڕەی هەڵگرت، پەنای بۆ چیای ئەلبورز برد. ڕەگ و ڕەگەمای خۆی، لە داکی پرسی. فرانك داستانی جەمشید و ئەستیاکی سەرلەبەر، بۆ وەگێڕا، گوتی: ستێرناسان بەئەستیاکیان گوتبوو کە بەدەستی کوڕێك لەم حاڵە، لەم تەورە، کە فەرەیدوونە، لە ناو دەچێ، ئەستیاك باوی کوشتی و ئەمنیش بە دزییەوە تۆم بەخێوکرد.. ئەستیاك هەمیشە بیری لە فەرەیدوون دەکردەوە، ڕۆژێك بەگەورە پیاوانی وڵاتی گوت: ئەمن دژمنێکم هەس، کە هێمان زارۆکە. جا بۆ لە مەترسی بەدوور بوون، قۆچانێك، قەواڵەیەك بنووسن، کە لە کاری چاك بەولاوە چیی ترم نەکردگە. هەمەکاران لە ترسان ئەستیاك چیی ویست وایان بۆ کرد. پیر و جوان شایەتییان بۆ دا و مۆریان کرد. لەم هەنگامەیەدا کاوەی ئاسنگەر پەیدا بوو، ڕاپەڕی گوتی: ئەمە چتۆ عەدالەتێکە کە تۆ ئیددیعای دەکەی؟ من هەژدە کوڕم هەبوون، تا ئێستا حەڤدەیانت دەرخواردی مارەکانت داون و ئێستەکەش هەژدەمینیان گرفتاری دەستی تۆیە و دەتەوێ ئەوژی بکوژی؟ گوناهی من چییە؟

″یکی بی زبان مرد آهنگرم ز شاه آتش آید همی بر سرم″

زوحاك کوڕەکەی بەرهەڵدا کرد، گوتی: وەرە ئەم قۆچانەم بۆ مۆر کە و شایەتیم بۆ بدە.. کاوە پڕی دایە تۆماری قۆچانەکە دڕی و لەتوپەتی کرد و چووە دەرێ. خەڵکەکەی لە دەور کۆبوونەوە و لە چەرمی بەروانکی ئاسنگەر درەوشی کاویانیی

دروست کرد. خەڵکەکەی وەدوو کەوتن و چوونە ئەلبورز و فەرەیدوونیان بەپادشایی هەڵبژارد. فەرەیدوون هەڵی کردە زوحاك و نەڕاندی: دەست و لاقی وەبەستن... لە کێوی دەماوەندی زیندان کەن. فەرەیدوون سێ برای دەبن، بەنێوی سەلم و توور و شەیدە و ئێرەج. وڵاتی خۆی بەسەریاندا دەبەشێتەوە.. وەجهی تەشبیهـ لە نێوا نەوزەر و فەرەیدوون و سەلم و توور و شەیدە و سیاوەش و خوسرەودا هەر یەکە خەسیەتێکە لە جوانترین خەسیەتەکانی مرۆ... بەڵام ئەگەر فەرەیدوون فارس بێ، چ سەروکاری بەکوردەوە هەس و بۆچی کراوە بە کاوەی ئاسنگەر؟ مێژووناسان ئەمە بەهەڵە دادەنێن. ئەژدەهاك پاشای ماد بووە و فەرەیدوون کورشە... غەبەب: گۆشتی ژێر چەنەی مرۆی قەڵەو. زەنەخدان (ف.): چاڵی چەناگە. لەب (ف. لب): لێو. نازك: ناسك. ترفە (ع. الطرُفة): موتورفە. زیبا (ف. زیبا): جوان، بەدیع، لە خواسایی بەدەر. عەجەب (ع. العجب): سەیر و سەمەرە، واقوڕهێن. دلبەر: دڵڕفێن. زەرکەمەر: پشتێند زێڕ. جیلوەگەر: بەناز و لەنجەولار. عیشوە: ڕەوشتی نازەنینان بۆ وەی دڵی ئاشقان کەمەندکێش کەن.. گریشمە: ناز، غەمزە: سیمین: زیوین. شاهید: مەحبووب، ئەویندار. لەقەب: نازناو. دڵ شکەن: دڵ شکێن. خەسم نەواز: دژمن نازڕاگر، نەیار لاوێن. عیسەوی: مەسیحی. موغ: کەشەی ئاتەشکەدەی زەرتوشتییان. گۆی زەقەن: غەبغەبە، بۆ ناچاری کێشی شیعرەکە "غەبەب"ی گوتووە.

### (٣٨) هی

### **هەجوی ماینەکوێت***

مـایـنـە کـوێت جـاران دەتـوت ڕەوتـی ڕەوتـی ئـاهـووە
ئـێستـە هـەستـانـی لـەسەر ئـاخـوڕ بـە یـاهـوو یـاهـووە
قـەت لـە یـەك قسنـاغ کـەمـی جـۆ نـادەمێ هێشتا لـەڕە
ساڵ دوانـگـزەی مـانگ سواری نـابم و هــەر مـانـدووە
عومقی چاڵی مەقعەدی بێ شك مەسافەی قەسر ئەبێ
درزی دەروازەی کـوزی لـۆچ لـۆچ بـەسەر یـەکدا چـووە
گەر بەئاوزەنگی پەراسووی ئەم سەر ئەو سەر هەڵدڕم
هــێنــدە نــابــزوێ بــزانم مــاوە یــاخــۆ مــردووە

خـاوەنـی پـێشووشی نـازانـێ کـە تـەئـریـخ و سەنـەی
چـەنـدە ئـەمـمـا مـن لـە پـیـرانـی قـەدیمم بـیستـووە
وەختـێ نـادر شا هـوجوومـی کردە سەر ئیقلیمـی ڕۆم
تـازە گـۆیـا ئـەو لـە کـوز دایکـی خـورووجـی کـردووە

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعیلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش"
کوێت: ئەسپ و ماینی ئاماڵ سوور، سورخن. ڕەوت: تەرزی بەڕێوە ڕۆیشتن. کورد دەڵێن، ئەسپەکەم ڕەوتی خۆشە. ڕەهوانە. ئاهوو: مامز، ئاسك. یاهوو: وتەی دەم پیێ فێر بووگی دەروێشان. مەبەست خوایە. قەسناغ (ت. قاسناق): دەفرێکی پێوانەیە، کەویژ، تەنەکەیەك، باتمانێك، شەش وەقە. لەڕ: لەغەر، لاواز. عومق (ع. العمق): قووڵایی. مەقعەد (ع. المقعد): قوون، ژێر قنگ.. سەنە (ع. السَّنة): ساڵ، دوازدە مانگ.. خورووج (ع. الخروج): دەرچوون.

## (٣٩) هـێ
## هەجوی شێخ غەفووری مامی*

مـامـەکـەم قـەحـبـەژنـە دەوڵـەتـی شەددادی هـەیـە
تـالـعـی ڕەهـبـەر و بـەخـتـێکـی خـودادادی هـەیـە
دوو سێ دێی داوەتـێ سوڵـتـان بـەئـیـتـعـامـی تـەعـام[١]
هـەر یـەکـێکـی بـەقـەدەر خـەزنـەیـێ ئـیـرادی هـەیـە[٢]
چ فــرووش و چ زورووف و چ زەیـــاع و چ عـــەقـــار[٣]
لـە هـەمـوو جـیـنسە مـەتـاعـێ سەد و هـەشتـادی هـەیـە
ئـەم هـەمـوو گـەنـج و خـەزێنـەی هـەیـە هـێشتاکو تـەڕەس
نـە هـەوای جـوود و نـە مـەیـلـی کـەرەم و دادی هـەیـە
ڕەسمـی ئـابـائـی کـیـرامـی بـووە ئـاساری سەخـا
نـە لـە ئـابـائـی حـەیـا وو نـە لـە ئـەجـدادی هـەیـە[٤]

گەر سەر و ڕیشی پیاوانەیە باوەڕ مەکە پێی
باتینی جوولەکەوو زاهیری زوهھادی هەیە
خۆی بەهەر سوورەت ئومێدی کەرەمم پێی هەیە لێك
ڕقی زۆرم لە ڕەشیدی کوڕی گەووای هەیە
ڕەنگی کەر، دەنگی بەقەر، هەیئەتی سەگ، خوویی چەقەڵ
چاوی کوێر، مەخزەنی کێر، مەقعەدی پڕ بادی هەیە
زیکر و ئەورادی لەسەر کێر و زەکەر مونحەسیرە
سەیری ئەو حیزە قوڕمساغە چ ئەورادی هەیە
تف لە کوز داکی لەلای خۆی کوڕی هێناوەتە دەر
گوو بەڕیش بابی لە کن خۆی ئەمیش ئەولادی هەیە[٥]
ئەمە گشت باوکی سەرمەشقی لەبۆ داداوە
سەربەخۆ سالیکی ڕەهڕەو نییە ئوستادی هەیە
لە گرووهی حەرەما کارەکەر و دایك و خوشك
فاتم و عاسم و ئامان و پەریزادی هەیە
شەو و ڕۆژ چەپڵە بە کوز لێ دەدەن و هەڵدەپەڕن
فەرجیان تاب و تەبی کوورەیی حەددادی هەیە[٦]
بێ حەیان جوملە خوسووسەن ژنە سووزانییەکەی
ڕەووشی دێڵە سەگ و قەحبەیی بەغدادی هەیە[٧]
من لە کەرکووکەوە دێنێتە کن ئەم قەحبە ژنە
لەگەڵم خەسمە فەلەك نییەتی بێ دادی هەیە
کوونی وو حیز بووە مانەندی ڕەشید تەبعی ڕەزا
هێند لەبەر جەوری فەلەك خاتری ناشادی هەیە

---

(١) تەمام: (ش). یەك دوو دێی داوەتێ سوڵتان پەی ئیتعامی ئەنام (دیوان).

(٢) هەر یەکێکیان (کش. مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٣) چی (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٤) جوولەکەیە (کش، مەلا ئەحمەدی دەکە).

(٥) باوکی (دیوان).

(٦) تاب و تەپی (ت).

(٧) یا: (ل).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك: "شرط مردان نیست در دل عشق جانان داشتن

پس دل اندر بند وصـــل و بند هـــجران داشتن"

شەدداد: بەپێی بەند و باو، "عاد" پادشای عەرەبستانی باشوور، دوو کوڕی هەبوون: شەدداد و شەدید، پاش مەرگی شەدید، شەدداد بوو بەجێنشینی. شەدداد، بەهەشتێکی هەبوو، "ئیرەم"ی پێ دەگوترا. ئیراد (ع. الإیراد): دەسکەوت. فرووش: فەرش، ڕایەخ. زورووف: دەفر و ئامان. زەیاع: مەزرا و کێڵگە. عەقار: خانوو و موڵك. زوهھاد: لە دنیا دەسبەردار. ئەوراد: نزا و دوعا. مونحەسیر: پاوانکراو. سەرمەشق: ڕاهێنان. ڕەهڕەو: ڕێبوار. تاب و تەب: تێن و تاو. حەدداد: ئاسنگەر. سووزانی: ژنی بێ شەرم و سەلیتە. کوونی: قووندەر.

## (٤٠) هێ

### هەجوی شوکری*

شوکـــری لـــە داخت ئـــەمـــە ساڵـــێکـــە وە یـــا دووە
کـــێرم نـــەخـــۆشە، حـــاڵـــی پـــەرێشانـــە، کـــەوتـــووە
جـاریٚ بـپـرسە مـوخـلـیسەکـەت چـۆنـە، چـۆن نـییـە؟
مـــەحسوویـــە کـــۆنـــەکـــەت، عـــەجـــەبـــا مـــاوە، مـــردووە؟
کـوشتـەی فـیـراقـی تـۆیـە، عـیـلاجـی ئـەگـەر نـەکـەی
ئـــۆبـــاڵـــی بـــەو مـــلـــەت کـــە دەڵـــێی نـــێرکـــە کـــاردووە
عـــەمـدەن ئـــەڵـــێم نـــەخـــۆشە، مـوراعـاتـی تـۆ دەکـەم
وەرنـــە دەمـــێکـــە ڕۆحـــی بـــەجـــەنـــنـــەت سپـــاردووە
گـــەر مـــن درۆ ئـــەکـــەم ئـــەوە دایـــکت بـــپـــرسە لـــێی
یـــایـــە بـــەدەستـــی خـــۆی کـــفـــن و دفـــنـــی کـــردووە

شانە و خەنە و حەممامی حەرام کردووە لە خۆی
پاش ڕەحمەتی، حەرامە لە من، سوێندی خواردووە
ئێستەش کراسی چڵکنە، ناولنگی کوڵکنە
وەك دێوەڵووکە تووکی بەری بستێ هاتووە
یایە ئەگەر سەگرمە بەژێر کورکەیا بچێ
هەر وا دەزانێ لاقە مەلێکی پیا چووە
یایە کە مەعبەری دوبری و دیهلیزی کوزی
یاتاغی ئەشقیایە، گوزەرگاهی ئۆردووە
شیعرێ کە تۆ بەچاکی دەزانی شیاکەیە
نەزمێ کە تۆ بەیانی دەفەرمووی گەن و گووە
هەر وەك تسێ کە جەوهەری خۆی دەربخا بە با
ناموسی خۆت بەشیعری سەفیهانە بردووە
بەم شیعرە بێ فەڕانە نابییە شێخ ڕەزا
زەحمەت مەکێشە ئائینە کاری ئەرەستووە

..................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەتوی ئەزلەل.

(مستفعلن مستفعلن مستفعلن فعل).

نموونەم بۆ ئەم شیعرە دەست نەکەوت.

مەحسووب: دۆست، کەسێکی لەسەر یەکێکی دیکە حسێو کریاگ. ئۆباڵ (ع. الوبال): سەختی، ئازار، گوناه. موراعات: (ع. المراعاة): ریعایەت کردن، دڵ ڕاگرتن. وەك چۆن شوان چاوی لە گەلەکەیەتی ئەوڕی وسان... وەرنە (ف. وەرنە، اگر نە): ئەگەر نا، دەنا، ئەگینا. ڕۆحی بەجەننەت سپاردووە: مردووە. یایە: خانمی بەڕێز. وەك کە بە بەهەشتی، دایکی کاکە حسێن و کاکە حەمە و مریەم خانمی بەهەشتیی دایکیانمان دەگوت.. هەزار ڕەحمەتی خودا لە گۆڕێ پاکیان. داك: دایك، داڵك. کفن (ع. الکفن): پۆشاکی مردوو. دەفن (ع. الدفّن): ناشتن، مردوو ناشتن. کوڵکن: تووکن، کوڵك تیسکی لە تووك درێژتر و پڕترە. موو: بۆ سەر، بۆ ڕدێن بۆ ئەندامی دیکەی لەشی مرۆ دەگوترێ. "کورك"یش دەگوترێ. هەرچی لەسەر پێست بڕوێ. کوڵکی لووا، کوڵکی فەروە، کوڵکی تەپلە و هتد... دێوەڵووکە جندۆکەی کورتەبنەی لەش کوڵکن. سەگرمە چیایەکە کەوتووەتە

ڕۆژهەڵاتی باکووری کەرکووکەوە. لە کتێبە تورکییەکاندا :سگرتمە″ نووسراوە. مەل: پەڕەوڵ، باڵدار. مەعبەر (ع. المعبر): شوێنی پەڕینەوە، ڕێڕەو. دوبر (ع. الدُّبر): پاش، قوون. دهلیز: وشێکی بەعەرەبی کراوە، دالان، ڕێڕەو. یاتاغ: مۆڵگە، مەکۆ. وشەیەکی تورکییە (یاتاق).. گوزەرگا: تێپەڕگە. ئۆردوو: لەشکر، قوشوون، قۆشەن. شیاکە: ڕیخ، تەپاڵە. هەر وەك تسێ کە دیار بێخی (تس بۆخۆی بایە) و بەشیعری سەفیهانەی ئابڕووبەر خۆ ئاشکرا کردن، شتی خراپ بەشتی خراپ چارەسەرکردنە.

## (٤١) هێ
## **کەڵەشێری نەقیب***

ئەو بە هەیئەت کەڵەشێرە کە بەهەڵمەت شێرە[١]
کەرەمت کردووە بیستوومە دەسا بینێرە
دوو مریشکیشی لەگەڵدا کە فریشکی نەکەوێ
خرتی چەند ساڵەیە ئەڵبەتە بەمریشکان فێرە
بارەکەڵڵا حەسەن ئاغای کوڕی مەحموود ئاغا
کەفی فەیازە، دڵی واسیعە، چاوی تێرە
نە وەکو شاری سولەیمانییە، کۆیە بە کەرەم
نە وەکو تاووق و کەرکوکە نە وەك هەولێرە
ئەو هەموو شیعرە کە ناردم کەڵەشێرێکی نەنارد
جەددی ئەعلایە، نەقیب زادەیە، خۆی بێ خێرە
دۆستان ئەم کەڵەشێرە وەکو تەعریفی ئەکەن
بۆ ڕەزا لازمە ئەم نێرەکەیە، ئەو نێرە
هەدیەیێ گەر لە تەرەف دۆستەوە بێ شوکری دەکەم[٢]
پێی ڕەزامەندم ئەگەرچی تەرەفێکی کوێرە
قافیەی تەنگە نەزیرەی مەکە شاعیر زینهار
ئەوی لەم قافیە بۆت ماوەتەوە هەر کێرە

---

(١) شێخ ڕەزا جارێك داوای کەڵەشێرێك لە نەقیب زادە ئەکا، بۆی نانێرێ. لەو وەختەدا

خەبەر بۆ شێخ ڕەزا دەچی کە حەسەنی مەحموود ئاغا کەڵەشێرێکی چاوکوێری لەگەڵ دوو مریشکدا حازرکردووە، ئەیەوێت بینێرێت، ئەمجا شێخ ڕەزا ئەم شیعرەی بۆ ئەنووسێ.

(٢) هەدیەیێ کە (نوسخە).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).

وەك: "از تو با مصلحت خویش نمی پردازم

همچو پروانه می سوزم و در پروازم"

فریشك: مەلاژك، مەلاشوو. خرت: شەکەنێرێ، کە سێ بەهاری دیتبێ. شاعیر کەڵەشێرەکەی بە شەکە نێر چوواندووە. ئەڵبەت: هەڵبەت، بێ گومان، کەف: بەری دەست. فەییاز: بەفەیز، بەسەرشاری، بە لێڕژان. واسیع: هەراو، بەرین، فرەوان. نێرەکەی: کەی بەمانای خاوەن و کوێخاش دێ. نەزیرە: شێخ ڕەزا بەچامەی هاوکێش و هاوقافییەی چامەی شاعیرێکی دیکە بەرتەك دانەوە ئەم شیعرەی دەرهەق حەسەنی مەحموود ئاغا گوتووە، کە کەڵەشێریکی کوێری بۆ ناردووە.

## (٤٢) هێ

## کاکە حاجی کوڕی کەریم ئاغا*

شیرین وەکو خوسرەو پسەری هورمزە جافە(١)

چاو مامزە، لێو قرمزە، ئیمانسزە، جافە

چاوی ڕەشی فەتتانی وەکو شب ڕەوی عەییار

دین و دڵ و ئیمانی دزیوم، دزە، جافە

بورهانە لەسەر قودرەتی حەق ئایەتی حوسنی

بۆ دەعوەیی ئیسباتی خودا موعجیزە جافە

ئاشووبی جەهان، فیتنەیی ئافاقە نیگاهی

یەك نەفسە، جەهانێ لە دەسی عاجزە، جافە

بۆ کەشمەکەش و عەربەدە موژگانی سیاهی

وەك لەشکری تەیموور و سپای جنگزە، جافە

تـەنـیـا نـە ڕەزا بـۆی بـووەتـە بـەنـدەیـی فـەرمـان
فـەرمـانـی لـەسـەر شاهـ و گـەدا نـافـیـزە، جـافـە

..............................................................

(١) خەسرەو (نوسخە).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).

وەك: "گر خلق بدانند کـــە من عاشــق مستم

آوازە درست است کە من توبە شکستم"

خوسرەو: خوسرەوی پەروێز. شیرین و خوسرەو لێرەدا بۆ (ئیهام)ە. پسەر: نێرینە، کوڕ. وشەی پس بەزاری کوردیی باکور بەهەمان مانا بەکار دەبرێ، پسمام، کوڕی مام. قرمز: سوور، ئاڵ. (ت. ایمانسز): بێ باوەڕ، کافر، مەبەستی زۆر بێ ڕەحمییەتی.. جافە: مەبەستی ئەوەیە کە جاف زۆر کەللەڕەق و سەرشەق و بێ باکن. فەتتان: زۆر ئاژاوەگێڕ، بشێونە. شەب ڕەو (ف. شبرو): بەزۆر مانا هاتووە: شەوڕۆیی، ئەسپێك کە بە شەو چاك ڕێ بکا. عەییار: تەڕدەست، فێڵباز. دزە، جافە: گۆران هەمیشە جاف بەدز و ڕێگر و تالانکەر دەزانن. دیارە دووفاقیی نێوان دوو کۆمەڵگا، یەکێکیان کۆچەری و ئەوی دییان نیشتەنی و گوندنشین، یەکێکیان پێناو و ئامرازی ڕەنێوهێنان زۆر پاشکەتە و ئەوی دیکەیان لەوان پێشکەوتووتر، ئەمیان هەمیشە بەرهەڵداو بێ بەندوبار و بێ کەوشەن و سنوور، ئەویان خاوەن مڵك و زەویوزار و بەسەرحەد و سنوور، شتێکی ئابووری ژیانەکییە و هەمیشە دووفاقییەکە گەیشتووەتە ڕادەی لێك هەڵەنگوتن و شەڕوشۆڕ و دوژمنکاری... تا ئەم دووفاقییە ئابوورییە ژیانەکییە یەکلا نەبووەتەوە نەیاریی جاف و گۆران هەمیشە هەر درێژای کێشاگە. بەڵام پاش بڕانەوەی ژیانی کۆچەرایەتیی جاف و گوندنشین بوونیان و بوون بەخێوی زەویوزار و مڵك و پێناوی نوێی ڕەنێوهێنان، کێشە چینەکییەکە وردە وردە بڕاوەتەوە.. لە بارەی حەز لە چارەی یەکتر نەکردنی جاف و گۆران. با ئەم نەقڵەتان بۆ بگێڕمەوە: د. حەسەنی کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف بۆی گێڕامەوە، مستەفا بەگی بەهەشتیی برا گەورەی، جارێکیان لە بەغدا دەبێ، ئوتومبیلەکەی لە شەقامی "قەنات"ەکەی بەغدا، پەکی دەکەوێ، ناچار دادەبەزێ، سا بەڵکو یەك دوو کەسێکی فریاکەون، پاڵێکی بۆ پێوە بنێن، ئەنوارێ، بڕێ باخەوان، لەوناوە کاردەکەن،

بانگیان دەکا بێن پاڵی بۆ پێوە نێن. کابراکان لە پاڵ پێوەناندا، یەکێکیان زوانی ئەسووتێ، بەهەورامی یەژێ: "بەنذینی نەماوە"، مستەفا بەگ کە گوێی وەم "بەنذین"ی هەوراميیە دەزرینگێتەوە، ئیمان لە کەللەیدا نامێنی: ناکاتە نامەردی، لێیان ڕادەپەڕێ: هەورامی زوان پس لێرەیش پەیابوون؟ قاویان ئەدا... بەعوزر خوازییەوە بۆ برایانی گۆرانم، کە لە هەموو کوردێ ڕەسەنترن..) بەڵێ پێوەندییە خێڵەکییەکە لە بواری سیاسەتدا هەر بەردەوامە و ماوە... واتە: سەرکۆماری جاف، کە لە ناو کۆمارە ڕەشماڵەکانیدا پشتماڵە و بەرماڵەی هەبووە، کە پاشان بووە بەگوندنشین و خێوی زەویوزار، ئەمجا بووگە وە "بەگ"، دەسەڵاتەکەی دەگەڵ خۆدا ڕاگوێزتووە، جاران پێوەندییەکە خزمایەتیی خوێن بووە، ئێستا پتر پێوەندیی براگەورەی گوند، فیوداڵ، شێخ، و ئاغا و فەلا و وەرزێرە.. وتە: بنەما سەرخانەکەی کۆچەرایەتی کە درێژای پێش هۆز سازبوونە و تا ڕادەیەك پێناوی ڕەنێوهێنانی هاوبەشە، هەر ئەوە بۆ خۆی بووە بە ماکی سەرخانی نیشتەنیەتی؛ لەبەر ئەوە دەبینی ئاغای گوند، ڕەنگ و ڕووی کۆچەرایەتییەکەی هەر پێوە ماوە... ئاکار و ڕەفتاری سەرکۆماریەتی، تا ئەندازەیەك هەر ماون و بگرە شانازیشیان پێوە دەکرێ، بەڵام وردە وردە ڕوو لە نەمان و لەناوچوونە و بارودۆخی ناچارەکیی کۆمەڵگای شارۆکە و شارستانی گەورە: چەرچی، دووکاندار، بازرگانی گەورە، پیشەگەر، وردە وردە پێوەندییە کۆنەکانی ڕەنێوهێنانی دەگۆڕێ و پێناوی دیکە لە جێیان دێنە گۆڕێ.. ئیدی سەرخانە کۆنەکەش دەگۆڕێ و سەرخانی نیوە فیوداڵ و نیوە سەرمایەدار جێی دەگرێتەوە. بورهان (ع. البرهان): بەڵگە. حەق (ع. الحق): خوداوەند. دەعوە (ع. الدعوة): دەعوا، کێشە، موعجیز، موعجیزە (ع. المعجزة): پەرچوو. جافە: وشکە. ئاشووب (ف. آشوب): ئاژاوە. فیتنە (ع. الفتنة) بشێونەیی. ئافاق (ع. الآفاق): هەموو کائینات. یەك نەفەسە (ف. يك نفسه): هێندەی یەك پشوو، بەجارێ. نیزامی گەنجەوی دەڵێ: "لالە گهر سودەء فیروز گل يك نفسە لالە و يكروزە گل" یا وەك شێخی سەعدی دەفەرموێ: "کە مارا در ان ورطەء يكنفس ز تنگ دو گفتن بفرياد رس". کورد دەڵێ: "یەك پشوو. کەشمەکەش (ف. کشمکش) کێشمەکێش. عەربەدە (ع. العربدة): بەد خوویی، ڕەوشت و ئاکار بەدی. موژگان (ف. مژگان): بژانگ، بژۆڵ. تەیموور (مغ. ت): تاغمور، ئاسن، سەردار و پادشای مەزنی مەنگۆڵ (لەدایکبوون و کوژرانی: ٧٣٩ك. مانگی.. چوونە سەر تەختی پادشایی ٧٧١ ـ ك. مانگی ١٣٦٩ز. بەرابەرە بە ٨٧٠ك.

مانگی/١٤٠٤ز) کوڕی ئەمیر تەرغای بوو و لە تورکستان و نێوان تیرەی بەرلاسدا پەروەردە بوو و لە سوار چاکی و تیرهاوێژیدا دەستوبردی وە دەست هێنا. لە لاوێنیدا فەرمانڕەواییی شاری (کش)ی بەرەوڕوو کرایەوە. پاش مارەکردنی کیژی خانی کاشغەر، نێوی کۆیرەکان (کورکان) زاوای لێ نرا. لە شەڕی والی زیستاندا چەند برینێکی کەوتە جەستە و دوو ئەنگوستی دەستی ڕاستی پەڕین و پێی ڕاستی زەبرێکی وای بەرکەوت، کە تا دوادوای تەمەنی، هەر دەلەنگی و لە بەر هەندێ بەتەیمووری لەنگ نێو دەبرا. لە شەڕی ئەنقەرەدا سوڵتان بایەزیدی بەزاند و دە قەفەزی زێڕی ئێخست، دەڵێن کە چووە حوزوور، تەیموور دایە قاقای پێکەنین، بایەزید زۆری لەبەر گران بوو، گوتی، ڕێ و ڕەسمی پادشایان ئەمە نییە، تیز بە پادشایانی دیکە بکا... تەیموور لە وەڵامدا گوتی، تەوهینت ناکەم، بەم دەور و دووکانە پێ دەکەنم، کە ئەو دنیایە لەنگێکی وەك من و چاو خێلێکی وەك تۆ بەسەری ڕادەگەن... دیارە بایەزید، چاوێکی نوقسان بووە... تەیموور زۆر زاڵم و خوێن ڕێژ بووە، بەڵام لەو فەرمانی پەیمان پێدانەدا. دیرۆکنووسی نامێ میرخواند لە رەوزە توسسەفادا، زۆری لەسەر بەتاندا چووە... دەگێڕنەوە یەکێ لە دیرۆکنووسانی هاودەمی، نازانم نێوی چ بووە، ڕۆژێکیان دەگەڵیدا دەچێتە گەرماو. تەیموور، کە پەشتەماڵی گەرماو بە بەرەوە دەگرێ، لێی دەپرسێ: بەچەندم هەڵدەسەنگێنی؟ ئەوژی د بەرسڤدا دەبێژیتێ: بەبایی پەشتەماڵەکەی گەرماوێ. تەیموور دەداتە قاقای پێکەنین، دەڵێ ئەو قسەیەت لە هەمووو قسەکانی دیت ڕاستترە... تەیموور زۆر زیرەکیش بوو، بەرەی شێخ و مەشایەخی تەریقەتی سۆفیانی لاواندووە و نوازشتی کردوون و زورناژەنی بێدادی و تالان و بڕۆیەکانی بوون: جنگز (مغ. چنگیز): بەمانای بەهێز و گەورەیە. نێوی تمووجین و کوڕی یەسووکای بەهادور، سەرۆکی تیرەی "قیات" لە تیرەکانی مەنگۆڵ بوو (لە مەنگۆلستان، لەسەر تەخت ٦٠٠ ـ فارسی ٦٢٤ك. مانگی). پاش مەرگی باوی بەسەر قەویلەی کەرائیتدا زاڵ بوو و نازناوی چنگیزخانی وەرگرت. لە پاشان نەتەوەی ئویغووری قڕ کرد و لە ساڵی ٦١٦دا هەڵی کردە سەر وڵاتانی خوارەزمشاهیی ئێران و لە مەودای دوو ساڵدا شارەکانی ئێرانی داگیر کرد و لە ساڵی ٦١٩دا بۆ مەنگۆلستان گەڕایەوە و لە ساڵی ٦٢٤دا مرد. مەئموون بەگی بەگ بەگ لە یادداشتەکانی ساڵی ٩٤١ك. دا، کە بۆ سوڵتان مرادی سێیەمی نووسیوە، دەڵێ (ئەردەڵان = عادلان)، باپیرە گەورەی ئەردەڵانییان، لە سەروبەندی تالان و

برۆیەکانی چنگیزدا لە کوردستانی ئەنەدۆلێڕا، بەرەو کوردستانی باشوور کۆچی کردووە و بنەماڵەی ئەردەڵان (عادیلان)ن، ئەردەڵانی دەباتەوە سەر عەشەرەی موبەشەرە، ڕۆحم بەگوریان بێ! ئەو کتێبە لە لایەن مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی و بەندەی کولێرە خۆرەوە، لە حەفتاونۆدا کراوە بەعەرەبی.

(٤٣) هێ

**دەوڵەمەندی ساحێب پارە***

خەبەر چوو بۆ میرە سوورە
قوربان شێخ ساڵح مەغدوورە
خۆشی خۆشیی پێ کەوت، وتی:
(ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە)
کەسی فەقیری بێ چارە
گەر عەیبی هەبێ دیارە
دەوڵەمەندی ساحێب پارە
سەد عەیبی هەبێ مەستوورە
ئاگر ئەگەر لە ماڵی چێ
دەڵێن ئاگر نییە، نوورە
نەنوورەیلێ، نەموورەیلێ
شاپڵیتەیلێ، دەرقوونەیلێ
قسەی جوولەکەی مەشهوورە

..............................................................

(*) کێش: بەحری موجتەس مورەببەع مەخبوون
(مفاعلن فعلاتن)
نموونەم بۆ ئەم شیعرە نەدۆزییەوە.

(٤٤) هێ

## ماڵ مودیری*

مـاڵـی مـودیـری کـە خـەڵـکـی هـەولـێرە
هــەروەکــو مــوویــی خــایــە بــێ خـێرە
سوورەت و سیـرەتـی لـە پـیـاو نـاچـێ
ئـــەو قـــورمساغـــە مـــێیـــە یـــا نـــێرە؟
مـن بـەمـەخـفـی کـە چووم و تێی فکریم
بـەزمـی غـەوغـایـە، مـەقـعـەدی کـێرە[۱]
دیم حوسێن کردی قەسدی قەتڵی فەتاح
وەکـــو یـــوونس کـــە دەس بـــەشمشێرە
حـەرەمـی مـوحـتـەرەمی لـەعلی خـان[۲]
خـەرمـەنـی عـیسمـەتـی گـەرای کـێرە
ڕاوی ڕێوی هــەمــوو لــە بــۆ کــەوڵــە
گـورگ لـە بـۆ بـەرخـە دێتـە نـاو بـێرە
بـەحـری ئـاودانـی مـەزرەعـەیی فـەرجی
جووتە گون جۆگەیە، کێریش ئاودێرە[۳]
وتم، ئـەی بـێ حـەیـا تـۆ نـاتـرسی؟
لـە خـودای ڕۆژ و مـانگ و ئـەستـێرە
وتـی، یـا شێخ ئـەمـان، مـەکـە مـەنـعـی
ئـەهـلـی قـوونـیـان بـەقـوونی ئـەو فێرە
نـیـیـە بـاکـم گـەر ئـەو خـەبـیسە بڵـێ
ئــەوە ئــەشعــاری (لامـیـع)ە کـوێرە[٤]

---

(۱) بەزمی غەوغایی (نوسخە).

(۲) موحتەرەمی (نوسخە).

(۳) جووتە (نوسخە).

(٤) (لامیع)ی: (د).

(*) کێش: بەحری خەفیف مەخبوون ئەصلەم.

(فاعلاتن مفاعلن فع لن)

وەك: "آتشی از تو در دهـــام دارم

لێك صد مهر بر زبان دارم"

ماڵ مودیری: ڕشتێكی توركییانەیە، واتە: مودیری ماڵ. هەولێر: ئەربیل، پێتەختی فەرمانڕەواییی كوردستانی باشوور، كە لە ١٩٩٢ڕا دامەزراوە و پارتی دیموكراتی كوردستانی عیراق بە سەرۆكایەتیی كاك مەسعود بارزانیی كوڕی مەلا مستەفای بارزانیی نەمر سەركردایەیی دەكا. شارێكە زۆر كۆنە، تەمەنی بۆ ٤ هەزار ساڵ دەچێ. شەڕی دارای هەخامنیشی ئێران و ئەسكەندەری مەكەدۆنی لە نزیك ئەم شارە دێرینـەیە ڕووی دا و ئەسكەندەر دارای بەزاند و ئیمپراتۆریەتی هەخامنشییانی لەناوبرد. دەڵێن: شوێنەكەی "گۆمەلیلە"ی لای هەولێرە. خایە: گون، باتوو. قورمساغ: جاكەش، دەویت. مەخفی (ع. المخفي): پەنام، پێوار. غەوغا: هەراوزەنا. گەرا: هێكی باتوو. بێرە: ئەو جێی دوور لە گوند ئاژەڵی لێ دەدۆشرێ. بەحری ئاودانی و هتد... تەشبیهی جووتە گون بەجۆگە و كێر بە ئاودێر لە تەشبیهە سەیرەكانی شێخ ڕەزایە! قوونیان: كوونی، قووندەر. لە گەرمیان بەقووندەر دەڵێن: "قوینە"، دیارە قوینە بە نـەسمـڕاویش دەگوترێ... كاك ئومێد كاكە ڕەش بـەمـانـای خـەڵكی "قـۆنـیـە"ی لـێك داوەتەوە... وەجهی تەفسیرەكەیم نەزانی.. لامیع نازناوی شێخ ڕەزایە.

## (٤٥) هـێ

## سمایلی مەلا خالید كە لە سەفەر هاتەوە

## شیخ ڕەزا ئەمەی فەرموو*

هــاتــەوە ئــاشووبــی دەوران، مــەردی مــەیدان هــاتــەوە

شێر یــەزدان، لــەنــدەهــووری ئـیـبـنــی سەعدان هــاتــەوە

بــۆ قــڕانــی لــەشكـری ئـەعـدا لــە نــاكــاو مـیسلـی بــەرق

ئـاسەفـی ساحـێبـقـران، لـەعلـی بـەدەخشان هـاتـەوە(١)

هەوری میحنەت، بارەشی غەم، سەیلی ماتەم بوو تەمام

بەرقی تابان، میهری ڕەخشان، ڕەعدی غوڕڕان هاتەوە

پــاڵــەوانــی پــایــی تــەخــتــی سەفــدەری شێرزاد خــان
تاج بەخشی کیشوەری مەغریب ئەڵب خان هاتەوە[٢]
سەعدی سەفدەر، مالیکی ئەژدەر، هوزەبری پڕ هونەر
بیژەن و گیو، تووس و نەوزەر، پووری دەستان هاتەوە
حـەمـد و لـیـلـلاهـ بـاز لـە بـۆ قـەتڵـی سەری تـوورانـیـان
ڕۆستــەمــی مــازەنــدەران، سامــی نــەریمان هــاتــەوە
ژێردەستــی ئـەسعـەد ئـاغـا بـووین وەکو مـووری زەعیف
بــۆ خــەلاسیــمــان سمــایــل وەك سولــەیمان هــاتــەوە
دۆستان لەب تەشنە بوون ناگاهـ لە فەیزی لوتفی حەق
جۆیی نیل، دەریایی قولزوم، بەحری عوممان هاتەوە
پێی ئەکا ئەتك و سیاسەت هەرکەسێ خۆی حەز بکا
قــاتــڵــی ڕۆحــی حــەمــە و جــەلــلادی وەسمــان هــاتــەوە
(لامیع)ی شاعیر بەهەر مەجلیس بچێ، خەڵکی دەڵێن
بـولـبـولـی دەسـتـان سەرا، مـورغـی غـەزەلخوان هـاتـەوە

---

(١) ئاسەفی ساحێبقڕان (نوسخە). ئەسغەری ساحێبقڕان (کاکە ڕەش).
(٢) ئالوب خان: (ت).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم
عالــمی از عالــم فکــرت بە کـــف می آورم"
ئاشووب: ئاژاوە، بشێوی. لەندەهوور: زەلامی کەتەی زەبەللاح. ئیبن سەعدان: ئەم نێوەم لە فەرهەنگی لغتنامەی "دهخدا" و چەند فەرهەنگێکی دیکەدا چاو پێ نەکەوت. بەڵام بۆ لەندەهوور: بەشی "أعلام"ی فەرهەنگی فارسیی د. محەمەدی موعین، نووسیویە، دەڵێ: پادشازادە و میرێکی هندستانی بوو، کە فرە کەڵەگەت و چەتەوڵ و بەهێز و تەنومەند بووە، تێڵایەکی زەلامی لە شەڕدا بەکاردێنا. ئەم واژەیە بەشێوەی خەڵکی ڕەمەکی بەسیفەتی بەکاردێنن. قڕان: (ت.): ئەم وشەیە لە

زمانی کوردیدا بەمانای شکاندن و بەزاندن و لە ناوبردن و قڕکردن و دوا بڕینەوە بەکاردەبرێ. بەرق: برووسکە. صاحێبقڕان: واژەیە کە لە واژەی ″صاحب″ خاوەن و ″قران″ی عەرەبیڕا کەوتووەتەوە، واتە کەسێکی کە لە کاتی بوون بەنوتفەدا، یا لە کاتی لەدایکبووندا، دەگەڵ یەکدیدا جووتبوونی ئەستێرە گەڕۆکەکان چاوی بەدنیای ڕۆشن هەڵێنابێ. دیارە ئەمەش بەنیشانەی بەختەوەری دادەندرێ. مەبەست: بنەماڵەیەکی نامێی سنەیین، کە دەچنەوە سەر باپیری هەردوو شاعیری گەورەی کورد، کوردی و سالمی ساحێبقڕان. خەفتان: بەمانای جۆرە بەرگێگ بووە کە لە شەڕدا دەبەر دەکرا.. مەبەست ئەوەیە، کە لە شەڕدا بەرگی بە لال ڕازاوەی دەبەر کردووە. لەعل، بریتییە، لە بەردێکی بەقیمەت کە لە یەك سیلیکات و ئیدرانەی ئەلەمینیۆم و مەنیزیۆم پێك دێ، ڕەنگی بەپێی ئەو ماددانەی کە تێکەڵی دەکرێن، دەگۆڕێ و تا بێژی سەخت و ڕەقە.. ڕەنگیشی زۆرن. کاکە ڕەش لەجیاتیی ″ئاسەف″ ″ئەسغەر″ی نووسیوە، ڕێی تێ دەچێ... ئا لە بیرم نەبوو، ئەمن زێتر بەلای ″لەعلی بەدەخشان″دا دەلەنگێم، تۆ بێژی ″ئاسەفی ساحێبقڕان لەعلی بەدەخشان هاتەوە″ نەبێ؟! ئەمەیان باشترە... میهری ڕەخشان: خۆری درەخشان. غوڕڕان: نەعرەتە کێش. سەفدەر: لەشکر شکێن، دڕ بە ڕیزی لەشکردەر. موور: لەب تەشنە (ف. لب تشنە): لێو تێنی. قوڵزوم: دەریای قەزوین.

## (٤٦) هێ

## هەجوی دەروێش نەفەندی*

تحت توقیفە آلندی قوی آلنسون کرتە
خلق ایچون چاهی قزان چاهە دوشر البتە
حبسە القا نە دیمك، بصرەیە سورمك لازم
بصرەدن بومبەیە مِنْ بومبە إلی کلکتە
ناسە عبرەت اولیور إتملیدر وقعەنویس
ترسن ترجمەیی حالنی ثبتِ غزتە
ئاهـ چ خۆشە بە چەقۆ گوێی لە بنا خشت ببڕن
ڕیشی قوت کەن بە مەقەس بیکەنە مەیموونە قوتە(١)

بـــه دەف و دائـــیـــرەو و زەمـــزەمـــەوە دووی بـــکـــەون
لــێ بــدەن چــەپــڵــە بــڵــێن بــێنــەوە کــورگــەل ئــەمــەتــە

---

(١) بیکەیتە: (م، ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.

(فاعلاتن فولاتن فعلاتن فعلن).

وەك: "هر کە در کـوی خرابات مرا یار دهد

بە کمال و کرمش جان من اقرار دهد"

تحت توقیفە آلندی کرتە: ئەو دەویتەیان هێنایە گیروداری گرتن، با بیهێنن. خلق ایچون چاهی قزان چاهە دوشر البتە: ئەوەی چاڵ لە بۆ خەڵك هەڵکەنێ بۆ خۆی دەکەوێتە چاڵەوە. حبسە القا نە دیمك، بصرەیە سورمك لازم: زیندان و گرتنی یانی چی؟ پێویستە بۆ بەسرەی ڕەهەندە کەن. بصرەدن بومبەیە من بومبە الی کلکتە: دەبێ لە بەسرەشیەوە بۆ بەمبە و لەوێشەوە بۆ کەلکوتتەی ڕەهەندە کەن. ناسە عبرت اولمەلی، ایتملیدر وقعە نویس: دەبێ بۆ خەڵك ببێ بەپەندی زەمانە و مێژوونووس دەبێ بینووسێ. ڕۆژنامە سەربوورەی ئەو تەرەسەی سەبت کردووە، چەسپاندووە. خشت: ڕێك، گردەبڕ.

(٤٧) هێ

## هەجوی حەمەی وەستا فەتاح*

هـــەزار ئـــەفسوون و جـــادووی پـــێوە ئـــاویـــزانـــە ئـــەم ڕیشە
عـــیـــلاجـــی گـــەر بـــبـــێ یـــا گـــووزە یـــا گـــوێزانـــە ئـــەم ڕیشە[١]
بـــە تـــەحـــریـــکـــی تـــەڵـــێکـــی سەد هـــەزار نـــەفسی بـــەکـــوشتن دا
ڕەئـــیـــسی حـــیـــلـــەکـــاران شای قـــومـــاربـــازانـــە ئـــەم ڕیشە
بە بای سەرسەرِ لە شوێن خۆی ناجمێ ڕیشی ئەمەند سەختە
بـــە بـــێ حـــیـــکـــمـــەت نـــیـــیـــە گـــەر جـــار بـــەجـــار لـــەرزانـــە ئـــەم ڕیشە
بـــەزاهـــیـــر سافـــە وەك زیـــوی سپـــی، ئـــەمما لـــە بـــاتـــیـــنـــدا
ڕەش و پـــیس مـــولـــووەس وەك بـــنـــی قـــازانـــە ئـــەم ڕیشە

بــه مــه‌کــری ئــه‌مــڕه‌تــێنــێ حــه‌زبــکــا هــه‌ر لــێره‌ تــا مــوکــری
پـــه‌نـــاهـــم ده‌ی خـــودایـــا خـــاوه‌نـــی زۆرزانـــه‌ ئـــه‌م ڕیشه‌
کــه‌ سه‌یــرم کــرد ده‌زانــم شێخ لــه‌ مــن مــه‌سرووره‌ یــاعــاجــز
حــه‌مــه‌ی وه‌ستــا فــه‌تــاح بــۆ حــاڵــی مــن مــیزانــه‌ ئــه‌م ڕیشه‌
هــه‌زار هــه‌وسار و ده‌سبــه‌نــد و گــوریسی لــێ دروست ئــه‌کــرێ
بــه‌سه‌د بــاتمــان خــوری گــه‌ر بــیــکــڕی هــه‌رزانــه‌ ئــه‌م ڕیشه‌[٢]

..............................................................

(١) بکا (نوسخه‌).

(٢) ده‌س که‌وێ: (م، ت).

(*) کێش: به‌حری هه‌زه‌ج موسه‌مه‌ن سال.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وه‌ك: "تو از هر در که باز آیی بدین خوبیُ زیبابی
دری باشد که از رحمت به روی خلق بگشایی"

ئاوێزان: هه‌ڵاواسراو. گووز: تڕ. ته‌ڵ: تاڵ، داو. ناجمێ: نابزوێ. له‌رزان: سیفه‌تی موشه‌بیه‌هه‌ی "لرزیدن"ی فارسییه‌، واته‌ ئه‌وه‌ی که‌ له‌رزانه‌ ده‌کا. باتین: ناوه‌وه‌. قازان: (ت.): مه‌نجه‌ڵ، به‌رۆش. ئه‌مڕه‌تێنێ: له‌ گه‌رمیان ڕه‌تاندن به‌مانای ته‌کان پێدان و به‌ملاوئه‌ولادا ڕاڕفاندنه‌، عه‌لیی حسێن به‌گ، "ئه‌مرفێنێ"ی پێ ڕاستتره‌. موکری: موکریان. هه‌وسار: ئه‌وه‌ی له‌ ملی گوێره‌که‌ و وڵسات ده‌کرێ، په‌ت. ده‌سبه‌ند: ده‌سته‌جڵه‌و. گوریس: ورس. باتمان: ته‌نه‌که‌یه‌ك، شه‌ش وه‌قه‌.

## (٤٨) هێ
## عیلله‌تی قائیممه‌قام*

ڕه‌ببی قــه‌ت تــووشمــان نــه‌هــێنی عیلله‌تی قــائیممه‌قام
ئــێمــه‌ تــابــی حــه‌رب و زه‌ربــی کــێری پــاشامــان نــیــیه‌
هــه‌رکــه‌سێ بیگــێ ده‌ڵــێ ئــه‌ی ئــافــه‌رین سه‌د ئــافــه‌رین
دوژمــنــی ساداتــه‌ قــه‌ت بــاکــی لــه‌ دان و مــان نــیــیه‌
دوو هـــه‌زار کــێری پــیــا ڕۆیــی نــه‌خــارا مــه‌قــعــه‌دی
ئــێمــه‌ مــیرم مــه‌تــره‌قــی وه‌ك سه‌نــگــی خــارامــان نــیــیه‌

بـیـکـوژن کێرخـۆره نـامـووس و حـەیـای کـوردانـی بـرد
قــەت لــە کــوردانــا دەڵـێی پـیــاوێکـی ئــازامــان نـیـیـە

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "زلف سرمستش چو در مجلس پریشانی کند
جـــان اگـــر جـــان نیـــندازد گرنجانی کند"
تات (ف. تاب): تاو، زەبر. ئافەرین (ف. آفرین): وشەی دنەدان و تەحسینە. بە کوردی "بترەژم" دەگوترێ.. دان و مان مانای هەس: دان "گاندان" یا دانی گەنم و خۆراك.
خاران: لە کارڕاهاتن. مەقعەد (ع. المقعد): قوون. مەترەق (ع. المطرق): کوتك. خارا: بەردێکی سەخت و ڕەقە.

## (٤٩) هـێ
## هـەجوی شوکری*

حـیـزێك کـە ئـەگـەر قسە بـبـەسـتـێ بـە ڕەزاوە(١)
بــێ شك بــە حــەڵاڵـی لـە کـوزی دایـکـی نـەزاوە
بێ حیکمەت و بێ قیمەت و بێ جێ نییە شیعری
عــومــری لــە هــەوەڵ تــا ئــاخـری تـێدا ڕزاوە
شوکری گەن و گووخۆری سولەیمانییە ئەموت
هــەر چـەنـدە کـە ئـەمـدی وەکـو لـۆتـی دەگەڕاوە

(١) حیزێکی ئەگەر: (ڕ).
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن مەکفووف مەحزووف.
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).
وەك: "گر خلـــق بدانند کە مـــن عاشم مستم
آوازة درست است کە من توبە شکستم"

(٥٠) هێ

**ئەهلی سنه***

سوپــەری ئــەهــلــی سنــە بــۆ شەڕی بــێگــانــە تــنــە
خــۆ بــەخــۆ شەڕ دەکــەن و ئــەسلــەحــەیــان هــەر بــەتنــە
ڕقــی هـــەڵسا سنـــەیـــی دێ لـــە سولـــەیمانـــی ئـــەدا
ئــافــەریــن ئــەهــلــی سنــە ئــەم ڕقــەتــان هــەر لــە کنــە
ئــەهــلــی ئێمــە کــە چــووە شاری سنــە، حــوکمــە، ئــەکــا[١]
بــە دوو شاهــی و قــەرەپــووڵــێ ژنــی کــامــیــان مــەزنــە

................................................................

(١) حوکمە ئەکا: (م. ح). حوکمە ئەگێ (ل).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).

وەك: "بە خرابات برید از در این خانە مرا

کــە دگــر شراب آمــد و پیــمــانە مرا"

سوپەر: سەنگەر. تن: قوون. شوەی "تنبان" کە تورکمان بەمانای دەرپێی دەکاردەبەن، لە تنەوە هاتگە... ئەدا: لە خەڵك ئەدا، یا گان دەدا. ئەمە ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی هەردوو واژەی "ڕق" و "لە کن" کە جاران بە "ڕق"یش و "کن"یش و "کون"یش دەخوێندرایەوە، هەردوو مانایەکە بگەیەنن.. واتە: ئەم ڕقەتان، ئەم کێنەیەتان، هەر لە کنە، کە لێ ئەدا مانای لە خەڵك دان بی و یا ئەم ڕەقەتان، ئەم دەعبایەتان، هەر لە کونە، کە دەدا بەمانای قووندان بێ... والله أعلم بالصَّواب. شاهی: ئەو دراوەی کە بەنێوی شاوە لێ دراوە. قەرە پووڵ: فلسێکی خوێڕوو..

(٥١) هێ

**شێخ هۆمەر***

هـــەر لـــە نـــاکـــاو زرمـــەیـــێ هـــات، کـــێی کـــورە؟ شێخ هـــۆمـــەرە
شێخـــی چـــی مـــردووت مـــرێ، بـــۆچت نـــەگـــوت جـــاشەکـــەرە

دەردی لـوقـمـەی گـرت لـە نـاکـاو شێخـە تـوهـمـەت کـارەکـە
ئـەو قـیـافـەت حـیـزەکـەی هـەیـئـەت وەکـو کـەمـتـیـارەکـە
قۆخ وەهای لێ کرد، لە جێی قۆخ کاشکی پۆخی خواردبا[١]
شێخـەکـەی، دەم چـەوتـەکـەی، لـچ گـێڕەکـەی، لـێوخـوارەکـە
کـوردە بـێ نـامـووسەکـەی، گـۆرانـە قـوڕمساغـەکـەی[٢]
حـیـزەکـەی، بـێ دیـنـەکـەی، کـەربـابـەکـەی بـێ عـارەکـە

.................................................................

(١) پۆخی دخوارد: (ت، م).
(٢) کوردە بێ ناموسەکەی گۆرانە قوڕمساغەکەی: (م)، کوردە بی ناموسەکەی گۆرانە قوڕمساغەکەی: (ت). هەر لە ناکاو زرمەیێك هات و وتی شێخ هۆمەرە (ك).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "صاحبا گر بندەرا تشریف خاصت از رواست
تا بـدان دامن ز جـیب آسـمان برتر کشد"
لوقمە: نەساغیی گرفت. پۆخ (ت. بوق): گوو. گۆران: کوردی زۆر ڕەسەنی هەورامان، کە هـەر لـە کۆنـەوە، سەبـارەت بـەوە، کۆچـەر نـەبـوون و گـونـدنشین و لـە کـۆچـەر پێشکەوتەتر بوون، دەگەڵ ڕەوەنداندا هەمیشە لە کێشەو هەرای خۆ لە گەڕی جاف و ڕەوەند پاراستندا بوون. خوا یار بێ، کاتێ کۆمەڵگای کوردەواریش وەکو خوا پێداوان پێش دەکەوێ و پێناوەکانی ڕەنێوهێنان و پێوەندییەکانی ڕەنێوهێنان بەنوێتر دەگۆڕێن، هەنگین ئەم مشتومڕە بەسەر دەچێ..

## (٥٢) هـێ
## واقەواقی دڵ*

هـەر واقـەواقـی دڵـمـە بـەدەستـی فـیـراقـەوە
وەك ڕێویـیـێ کـە هـەردوو گونـی بـێ بـەفـاقـەوە
ئیمان لە تەوقی سەرمەوە وەك واشە دەرپەڕی
سمـتـی کـە دەرپـەڕانـد و سەری نـا بـەتـاقـەوە

موتریب لە عەشقی یاری عیراقی بەحەسرەتم
بۆم هەستە وردە وردە لە پەردەی عیراقەوە

..............................................................

(*) کێش: بەخری ڕەجەز مەخبوون مەقسوور مەحزووف.
(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعل).
نموونەم بۆ ئەم شیعرە وەگیر نەکەوت.
ئەم کێشەم لە شیعری فارسیدا نەدیتەوە. واتە: مستفعلن بەخەبن بووە بە (مفاعلن)، مفاعلن بە، قەسر بوو بە (فاعلء = فعولن)، فعولن بەحەزف بووە بە (فعل). کە شتی وا لە کێشی دەکاربراوی مەشهووردا نییە.. واقەواق: قیڕ و هۆڕ. فاق: تەڵە. پەردەی عیراق: مەقامێکە لە موزیك و گۆشەیەکە لە "نەوا" کە لە ئەفشاری و ماهووردا دەکار دەبرێ. لە عیراقدا پلەی چوارەمی گامی نەوادا نۆتی شاهیدە. پلەی سێیەمی "فا" نیو پەردە ژوور هەڵدەکشێ و دەبێ بە دێز، بەڵام لە کاتی نشێوبوونەوەدا دەگەڕێتەوە سەر حاڵەتی ئەسڵیی خۆی. بەڕاستی مەقامی عیراق لە نەوادا لە بنجی "سۆڵ"ی گەورە لێ دەدرێ (خالقی. موزیك ۱۰، ۷ص. ۱)

(٥٣) هـێ

**بەغدا***

گەر بڵێم بەغدا لە جەننەت خۆشترە هێشتا کەمە
چونکە سوکنای غەوس و کەرخی و ئیمامی ئەعزەمە
ئەی برادەر شاری بەغدا، بێ حەسادەت، بێ هەمە
زۆر ئەمین بە لەم حیسابە پێت بڵێم کورتە و کەمە
لەم وڵاتە هیچ وڵاتێ هەر وەکو بەغدا نییە
حاکمی عەدل و عەدالەت زۆر ئەمین و بێ غەمە

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "هرگزم نقش تو از لوح دل و جان نرود
هرگزم یاد من آن سرو خرامان نرود"

غەوس: سۆفی و عارفی گەورەی نامیّ شێخ عەبدولقادری گەیلانی (قدِّس سرُّه العزیز). کەرخی: شێخ مەعرووفی کەرخیی سۆفی و عارفی نامیّ. ئیمام ئەعزەم: ئەبو حەنیفە، نوعمان کوڕی سابیت کوڕی زووتی لە پێشەوایانی گەورەی ئیسلام (ز. کووفە ٨٠ک.م./٦٩٦م. ـ ف. بەغدا ١٥٠ک.م./٧٦٧). بە ڕەگەز ئێرانییە. زووتیی باپیری لە کابوڵ و بە قەولیّ لە نەسا بووە. ئەبو حەنیفە لە بەراییی تەمەنیدا بە زانستی کەلامەوە سەرقاڵ بووە و دەگەڵ زانایانی کەلامدا دەمەتەقێی زۆری بووە. لە سەرێکی دیکەوە لەبەر وەی کوتاڵفرۆش بووە سەروکاری دەگەڵ کاروباری کردەنیی کۆمەڵدا خۆش بووە و لە ڕاستینی بارودۆخی ئابووری و بازرگانیدا ئاگا بووە. وێڕای وەی پشتی بەکوڕانی عەبباس ئەستوور بووە، بەڵام لە ژێرەوە هەواخوازی عەلەوییان بووە. ئەبو یووسف لە شاگردانی وی بووە. ئەبو حەنیفە لە قبووڵکردنی فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا سەختگیربووە. تەنانەت ١٧فەرمایشتی پێغەمبەری قبووڵ نەبوو. لەبەر ئەوە زێتر خەریکی "قیاس" و "استحسان" بووە. ئەبو حەنیفە دامەزرێنی یەکەم ئۆلی شەریعەتی سوننیی ئیسلامە. حەوت ساڵم لە پاڵ ئارمگایەکەیدا، لە ئەعزەمییە. لە بەغدا، لە کوللیەی شەریعەم خوێند. بیّ هەم: بیّ خەم.

## (٥٤) هیّ

## ژنەکەی مەستی ئەفەندی*

لێرە گایان ژنەکەی مەستی ئەفەندیی بەسرە
ئێستە بۆ بەسرە دەچیّ بەعدە خەرابولبەسرە
هێندە گەووادە گەر ئەولادی لە پێش چاوی بگێی
ڕیشی ڕادەگریّ کە ها کێر و گونی پیّ بسرە
عەینی بەغدایە بە خۆی، چونکە لەبەر ئاوی مەنی
مەقعەدی بەحرە، گونی قاییغە، کێری جسرە

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن).
وەك: "صنما مردە آنم کە تو جانم باشی
من دهم جان کە مگر جان جهانم باشی"

مەنی شاوەت، ئەو تۆماوەی کە لە چووکی پیاوەوە دەچێتە منداڵدانی ژنەوە. قاییغ: بەلەم.

(٥٥) هێ

**موسەممەت***

قەومەکان بەو زاتە وا حوکمی لەسەر بەحر و بەڕە
بەرخە نێرێ گەر نەنێرێ هەرکەسێ خاوەن مەڕە
دێم بە گژیا ئەیدڕم، گەر فیلمەسەل شێری نەڕە
با نەقەومێت وا نەزانن ئەم هەموو شوور و شەڕە
گشت لەسەر بەرخێ شەل و کاوڕێ لەڕ و بزنێ گەڕە

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم
عالمی از عالم فکرت بە کف می آورم
بەحر: دەریا، زەریا. بەڕ: بەژ، وشکان. فیلمەسال: بە مەسەل. موسەممەت بە بەیتێك دەگوترێ، کە بکرێتە چوار بەشەوە و دوایی سێ بەشەکەی یەکەم شاعیر پەیڕەویی "سەجع" بکاو لە بەشی چوارەمدا سەروایەك بێ وەك:
"ای ساربان منزل مکن، جز بر دیار من
تایك زمان زاری کنم بر ربع و أطلال و دمن
ربع از دلم پر خون کنم أطلال را جیحون کنم
خاك دمن گلگون کنم از آب چشم خویشتن"
هێندێ لەسەر موسەممت کێشەیانە...

(٥٦) یێ

## کەڵەشێرێکی کرماشانی*

کـــەڵـــەشێرێ بـــە ڕەزا لازمـــە، کـــرمـــاشانـــی
ئـــەژدەهـــا سەوڵـــەت دەم گـــەرم و دڕ و شەڕانـــی(١)
کـەڵـەشێرێ کـە قـەپی گرت لـە بـناگوێی کەڵەشێر
پـــڕ بـــەدەم بـــیـــپـــچـــڕێ وەك سەگـــی هـــەورامـــانـــی
کـەڵـەشێرێ کـە ئـەگەر شێری نـەڕی بێتـە مـەساف
ڕای ڕفـــێنـــێ بـــە شەقـــێ مـــیسلـــی کـــەری تـــالانـــی
بـــۆ حـــەواڵـــەی دوبـــوری ئـــەو کـــەسە خـــۆم ئـــەیـزانم
دوو گونی پێوە هەبێ وەك دوو جەڕەی لەیلانی
بـەدرێژی وەکـو مـەولان بـەگـەکـەی میری بـەیـات
بـــە جـــەسامـــەت وەکـــو کـــوێـخـــا زلـــەکـــەی بـــیـبـــانـــی
جنسی خۆی جووتە مریشکێ بەری حەملەی بگرێ
نـەکـو سوێی بـێتـەوە بـێـچـارە لـەبـەر بـێ گـانـی
ئـــەی نـــەقـــیب زادە، بـــنـــێرە کـــەڵـــەشێرێکـــی وەهـــا
بـــۆ ڕەزاکـــەی سەگـــەکـــەی قـــاپـــیـــیـــەکـــەی گـــەیـــلانـــی

---

(١) ئەژدەها سەوڵەت و دەم گەرم و دڕ و شەڕانی (ن). زیرەك و چابوك (ڕ).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن).

وەك: "نـــازنین عـــیب نبـــاشد کە کـــند نـــاز ای دل

او همی سوزد از عشق و تو می ساز ای دل"

جەڕەی لەیلانی: بە گەورەیی مەشهوورە. بەیات: تیرەیەکە لە عێلی ئینانلوو، لە پێنج تیرەی فارس. هەروەها نێوی مەقامێکی زۆر بەربڵاوی موزیکە، بە "لا" دەست پێ دەکا و بە "لا" دوایی دێ. زۆری مەقامی دیکەی لێ دەکەونەوە.. هەروەها نێوی تیرەیەکیشە لە قەشقایی. لە عیراق بەیاتی تورکمان، عەرەو، کورد، هەن.. سوێ: سووی، داخ، عەزرەت.

(٥٧) یێ

**ستایشی کاك ئەحمەدی شێخ***

مەربووتە حەیاتم بە سولەیمانی و خاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی
ئەو قودرەتی ساداتە کە سوککانی سەماوات(١)
شەڕیانە لەسەر سەجدە ئەبەر مەرقەدی پاکی
ئەو مەرقەدی والایە کە وەك عەرشی موعەللا
مەحفووزە بە زوواری مەلەك دەوری شوباکی
بۆ دەست و عەسا نازەکەکەی داخە دەروونم
قوربانی عەسای دەستی دەبم، سۆل و سیواکی
دنیا لە دوای حەزرەتی شێخ زێر و زەبەر بێ
وەك تاجی کەی و جامی جەم و بەختی زوحاکی
دەرحەق بە حەفیدانی ئەدەب لازمە زینهار
قوربانی حەفیدانی دەبم بابی و وداکی
بەم حاڵە پەرێشانەوە باز ئەشهەدوبیللاه
شیعرت تەرەب ئەنگێزە ڕەزا شاعیری چاکی

................................................................

(١) سەماواتە: (م.ت).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).

وەك: "انرا کە خدای از قلم لطف نگارد

شاید کە بر او زحمت مشّاطە ندارد"

مەربووتە (ع. المربوط): بەستراو، گرێ دراو، پابەند. حەیات (ع. الحیاة): ژیان، ژین. ئەحمەدی کاکی: کاك ئەحمەدی شێخ. قودوەت (ع. القدوة): پێشەنگ، نموونە، ئولگوو. سەجدە (ع. السَّجدة): کڕنووش. مەرقەد (ع. المرقد): ئارامگا، گڵکۆ. والا (ف. والا): بڵند کراوە، گوشاد. مەحفووز (ع. المحفوظ): پارێزراو. مەلەك (ع. الملك): مەلایەکەت. شوباك (ع. الشُّباك): پەنجەرە. عاسا (ع. العصا): دارعاسا، داردەست.

داخ: بەئاگر داخکراو. سۆل: سووکە پیلاوی چەك. کەوشی سووکەڵەی بێ پانی. زێر و زەبەر: ژێر و ژوور. کەی: کەیخوسرەو: پادشای ئێران. جامی جەم (ف. جام جم): جامی جیهان نما، جامی جیهان نوێن. زوحاك: ئەستیاك، ئەژدەهاك، پادشای زۆرداری ماد. کە کاوەی ئاسنگەر کوشتی. حەفید (ع. الحفید): نەوە. زینهار (ف. زینهار): دوورکەوە، وریابە. تەرەب ئەنگێز (ع. ف. طرب انگیز): خۆشی بزوێن، هەوەس بزوێن.

(٥٨) یێ

**سوحبەتی شێخ***

شێخ کە هام سوحبەتی شامار و نەدیمی حەمە بێ
شێخ کە دۆستی مچەڕێژاوی و و ئەحمەد جەمە بێ
شێخ لەبەر جەلبی دڵ و ئایشە کوڕانیی ژنەکەی[١]
شیر بکێشێت و لە ڕووی والیدە دەستەوقەمە بێ
شێخ کە قودسییەتی پیرانی تەریقەت لە کنی
هەموو ئەفسانە وو ئەفسوون، هەموو گاڵتە و گەمە بێ
شێخ کە گەووادی وەکو (خادیمی سوججادە) لە لای
سەیدی حوڕڕ لە سولالەی عەلی و فاتیمە بێ
شێخ کە قەسری حەرەمی گەییە مەقاماتی عولا
سەر بڵند کات و بڵێ، شێخ ئەمە وو قەسر ئەمە بێ
شێخ ئەوا گۆی هونەری بردەوە، کەشکەك سەڵەوات
شێخ ئەوا جێی پدەری گرتەوە، دەستی بەمە بێ

---

(١) دڵی ئایشە کوڕانە (م. ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).

وەك: "بە خرابات برید از در این خانە مرا

کە دگر یاد شراب آمد پیمانە مرا"

هـام سوحبەت (ع. ف. هم صحبت): هـاودەم: دەستەو قـەمە: دەست بـەقـەمەوە. عولا (ع. العلا): بڵندی. گۆی هونەر بردنەوە: کینایەتە لە سەرکەوتن، لە یاریی قاشوانێدا گۆ بردنەوە. کەشکەك سەڵەوات: قسەیەکە بەتیز بۆ کەشکەك لێنان و بە بۆنەی خێری حوسەینەوە (د.خ) دەگوترێ.

(٥٩) یێ

**حەوشە رەش***

حــەوشەیـێکـم هــەیــە بــەقــەدەر لــەپــێ(١)
ڕۆژ عـیــلاجــی نــەکــەم بــەشەو ئــەتــەپــێ
مــەنــفــەز و درز و ئــاودزی هــەرچــەنــد
دەیــگــرم، دەیــکــوتم بــە دەست و بــە پــێ
شەو کــە دێم، دەم دەکــاتــەوە وەکــو هــار
وا ئــەزانــم سەگــە و بــە مــن ئــەحــەپــێ
سەر و ڕیشم پــــڕ لــــە ڕشك و سپــــێ
خــەمــی شاگــردەکــان زیــاتــر ئــەخــۆم
گەورە هەر چاکە، ئاخ لە دەس دەس و پێ
ژنــی وەستــاکــە بــۆ چ نــەگــێم تــوخــوا
ساق و سمت لــووس کــوز پــڕی دەرپــێ

---

(١) حوجرەیێکم (م. ت).

(*) کێش: بەحری خەفیف موسەددەس مەخبوون مەحزووف.

(عاعلاتن مفاعلن فعلن)

وەك: "گر کــنم در ســر وفات سری

ســهل باشد زیان مختصری"

لەپ: بەری دەست. ئەتەپێ: دادەڕووخێ. مەنفەز (ع. المنفذ): دەرەتان. ئاودز: لەبنەوە ئاو چوونە نێو شتێکەوە. ئەحەپێ: ئەوەڕێ. قسڵ: بەردی تایبەتی خڕ و بەستان دێنن، دەیبرژێنن، کە ئاوی پێدا دەکرێ خاو دەبێتەوە و وەکو گەچی لێ دێ و موو و پیوی

تـێکـەڵ دەکـرێ، بـۆ گـونـج و ئـاودەست و سەرشۆرك و شتـی لـەم جـۆرە بـابـەتـانـە چەسپاندن و لەحیمکردن بەکار دەهێندرێ. گەچ: ئەو بەردەی بۆ گەچ دەربرژێندرێ، وەك بەردی قسڵ نییە، نەرمە، زووتر دەبرژێ. لە کەرکووك قایەی پێ دەگوترێ. لە سلێمانی و کۆیە و کفریش هەر ئەو قایەیە بە گەچ دەکرێ. دیارە گەچ لە ماددەی کلس دروست دەکرێ. هەروەها لە لمی بیابانیش دروست دەکرێ. پەلاس: جلوبەرگی شڕ و غاراو. ڕشك: گەرای ئەسپێ. دەس و پێ: خزمەتکار، دەست و پێوەند. پڕدەرپێ: خڕ و پڕ و قەڵەو.

(٦٠) یێ

## شەڕی جەباری و داودە و کاکەیی و تاڵەبانی*

سێ عەشرەت بوون بەیەك تارپشەمان دەرکەن بە عێلجاڕی[١]
جـەبـاری و داوودە و کـاکـەیـیـیـەکـانـی دایـە ڕێزواری
قەسەمیان خوارد بە ڕۆحی سەید براکە و گۆڕی خان ئەحمەد
بە کەللەی خووگ و شاخی گایی حوول و گۆشتی مرداری[٢]
دەبـێ ئـەمـڕۆ بـەجـارێ قـەتـعـی نـەسلـی تـاڵـەبـانـی کـەین
تـەق و تـۆقـیـان کـە هـەستـا گـولـلـە هـەروەك تـەرزە دابـاری
سوارەی تـاڵـەبـانـی دەرپـەڕیـن وەك ڕۆستـەمـی دەستـان
فـیـراریـان ئـیـختـیـار کـرد سەیـدەکـانـی بـاوە یـادگـاری
فـیـراری کـاکـەیـی هـەر نـەیسە ئـەمما گـوێی فـەلـەك کـەڕ بـوو
لـە جـرت و فـرتـی ئـاغـای داوودە و ساداتـی جـەبـبـاری

---

(١) سیە عەشیرەت (ت. م).

(٢) گاوی هۆل: (أ. ك).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: "بتی دارم کە گرد گل ز سـنبل سایبان دارد
بهار عارضش خطی بە خون ارغوان دارد"

عێلجاڕی: عێل (ت. ایل): هـۆز،خێڵ. جاڕ (مەغو. ت. جار): بانگەواز "اعلان"، " انفیر"، واتە: بە دەنگدانی خێڵ و هۆز، بە گەلەکۆمە. جەباری: تیرەیەکن بەچڕ و پڕی لە ڕۆژهەڵاتی باکور و باکوری ناوچەی قەرەحەسەن نیشتەنین. شێخەکانیان سەیدی بەرزنجەیین. مەڵبەندیان تەکیەی جەبارییە، لە پاشان لە جەوز و حەمك و چیمەن هەواریان گرت. بەهەشتی شێخ جەبار و شێخ حوسەینی سەید محەمەدی جەباری، لە چلەکانەوە لە چیمەنیش دادەنیشتن. وەستا مستەفای باوکم، لە سلێمانی چەخماخساز بوو، لە سەروبەندی سەفەربەری یەکەمدا، سەید محەمەدی جەباری خوڵکی دەکا، دەچێتە خزمەتی، لە دێی حەمك دادەمەزرێ. وا دیارە ئەو سەروبەندە حەمك پێتەختی سەییدەکانی جەباری بووە. وەك لە براگەورەکەمم بیستووە، زۆری ڕێز لێ ناوە، باوکم پیاوێکی زۆر لە خودا ترس بووە. پێنج برابوون، ئەحمەد و حەسەن و فەتاح و مستەفا و عەلی. ئەحمەدیان لە شاری بەغدا گیرساوەتەوە و لە کارگەی چەك چاکردنەوە و چەخماخسازیدا کاری کردووە، بۆرە ڕوتبەیەکی سەربازییان داوەتێ، وێنەکەیم لە ماڵی ڕەفیق قامەچیی کوڕی دیت. پێنج کوڕی هەبوون: تۆفیق، ڕەفیق، نازم، عیزەت و شەفیق، لەم دواییانەدا بەماڵی قامەچی نامێ بوون. تۆفیقیان لە سەفەربەری یەکەمدا لە تورکیا نەگەڕایەوە، لە ١٩٥٦دا، چوومە خزمەتی لە ئەستەمبوڵ، وەجاخ کوێر بوو، زۆر سەر و ساختی دەگەڵ عیسمەت ئینونودا هەبووە. ماڵی لە قار تۆپو سوقاق بوو، فەهیمە خانمی خوشکی خێزانی ئەمین شەن دۆغان هێشتا لە حەیاتدا مابوو. ئەمین شەن دۆغان خاڵی مەلا ڕەئووفی سەعاتچییە. دەگەڵ ماڵی د. ئەکرەم قەیماقچی و ئەنوەر قەیماقچیدا خزم بوون، کاك مەجید شەیتان، کە ئێستاش ماوە و لە بەغدایە، ئامۆزایانە. تۆفیق تا پلەی ئڵبای، جەنرال هەوراز هەڵکشا، پیاوێکی لە خوا ترس بوو. حەکایەتی خۆی زۆر بۆ گێڕامەوە. ئەمین شەن دۆغان دوو کوڕی، جیهاد و نیهاد. هەرتکیان سەربازبوون. نیهادیان لە شەڕی کۆریادا هاویەش کرد. ئەمانە لە خوشکێکی دیکەی تۆفیق بوون، ناوەکەیم باش لەبیر نەماوە، ئەمین شەن دۆغان کچێکیشی بەنێوی موزەففەرەوە لە ژنەکەی پێشووی، هەبوو. زۆرتر لە بەغدا گەورە بووبوو، تا ساڵانی شێستەکانیش هەر مابوو، لەو ساڵانەدا یەقەیان گرتم بیهێنم، بە قسمەت نەبوو.. هەرچی حەسەنیان بوو، دەچێتە حللە، لەوێ بەکاری چەخماخچیەتی و شتی لەو جۆرە بابەتانەوە خەریك دەبێ. دوو کوڕ و دوو کچی هەبوون، فەتحی و محێدین و حەمدە

و ئەوەکەی دیکەم نێو لە بیر نەماوە، کچە گەورەکەی دەدا بە ئیبراهیم ئەفەندیی ئەفسەری کورد، کە لە توێریج دادەنیشت، ئەوی دییان نەعیمەی دایکی لەیالی، خێزانی عەبدولخالیق زەنگەنەیە، نەعیمە خانم تا ئێستاش ماوە و لە بەغدا دەژی. لە سەرێکی دیکەوە، ئەم نەعیمەیە خوشکی باوکی سەبیحەلمودەڕیسی خوشکی عەدنانولمودەڕیس، کە هەرتکیان چەندین ساڵ وتارویێژی ڕادیۆی بەغدا بوون. لە دایەرەی وەگێڕانەوەی مافی مەدەنیی وڵاتیان بوو، لە ٥٥دا چوومە کنی بۆ وەگێڕانەوەی مافی مەدەنیم، کە ساڵێکیان لەسەر خۆپیشاندانەکانی ساڵی ٥٩حوکمی هەموو ڕۆژێ چوونە شورتە و ئیمزاکردنیان دابووم، بردمی بۆ کن بەهەشتی عەبدوڕەحمان بەزازی مامۆستام، زۆر پیاوانە کارەکەی بۆ جێبەجێ کردم. دایکی فەتحی و محێدینی ئامۆزام، خزمی شێخ ڕەئووفی حەڵواچی بوو. لە سەرێکی دیکەوە خزمایەتیی لەگەڵ بەهەشتی مامۆستا تۆفیق وەهبی هەبوو. حەمەیەك هەبوو، لە بەنزینخانەکەی سلێمانی کارمەند بوو، زەلامێکی کەتەی زلە بوو. خزمی ویش بوو. باوکی لەیالی بەڕەچەڵەك، وا بزانم مەندایییە. لە حللەماڵی مودەڕیسیان پێ دەڵێن. ئێستاش ماوە. کوڕێکی بەگۆتاوەرۆیەکەی عەزیزی حاجی قولی لە چبایيش لە ناو چوو. سەلاحەدینی نێو بوو، ئەندازیارێکی تازە هەڵکەوتوو بوو. وەستا مستەفای باوکم لە شەڕی شێخی نەمردا، شێخانی ناوچەی قەرەحەسەن سەر لەبەر دەدەنە پاڵ شێخی گەورەمان. ناخۆشی ئەکەفێتە نێوان شێخانی تاڵەبانی و شێخانەوە، گەلەجووتی یەکدییان بەر دەدا. شەو دزیان دەناردە سەر یەکدی و هتد... باوکم حەمە و فەرەج و حەپسە و ئاجیە و ئاسکۆڵی دەبن. عوسمانی حەمە و فەرەج بەڕەشبگر دەگرن، دەیاننێرن بۆ شەڕ... وەستا فەتاحی مامم ڕوو دەکاتە ڕەواندز، لەوێ چەند ساڵێك چەخماخسازی دەکا. دوو کوڕی هەبوون: بەکر و غەفوور. غەفووریان دەرەجەدار بوو، لە شەڕی بارزاندا کوژرا. بەکریان لە پاش سەفەربەری یەکەمدا ئینگلیزەکان بۆ هیندستانیان نارد فێرە ڕاکێشانی هێڵی تەلگرافیان کرد، چەند ساڵێك لە هەولێر کارمەندی تەلگراف بوو.. پاشان نەقڵی کەرکووك کرا. بەکریش و غەفووریش دوو خوشکی ئەحمەد ئاغای چایچییان هێنا، ئەمانە ئێستا لە کەرکووك ١٥،١٠خێزانیان لێ کەوتووەتەوە. کوڕ و کچیان زۆر بوون. زەکیەی کچی غەفوور شووی بەماڵە وەنداوییەکانی هەولێر کردووە. منداڵەکانی دەگەڵ کاك سبیح وەنداویدا ئامۆزا و ئامۆزازان، ناسیارییەکەیان لە حللەڕا دەستی پێ کردووە. غەفوور کوڕێکی بەنێوی شوکری، کە دەکا برای دایکی

فەتحی مەعسوومی زاوای بەهەشتی کاك عەزیز ئاکرەیی، هەبوو. ئێستاش هەر ماوە کوڕێکی زۆر موسوڵمانە. ماڵی ئەحمەد ئاغای چایچی بەخێویان کرد. کوڕێکی دیکەشی بەنێوی یوسف هەیە. کاك فەتحی مەعسووم لە دایکی عەلی شانازی باوکیەوە بابانە. خزمایەتیمان هەس.. مامە عەلیم هەر لە سلێمانی دەمێنێتەوە. لە ٣٨دا هاتە کەرکووك، بۆ ماڵی وەستا فەرەجی برام، ١٠فلسی دامێ. کچێکی هەبوو، بەنێوی عەتیە، دای بە مەلا ڕەئووفی سەعاتچیی باوکی عەتووف و لەتیف. دوایی وازی لێ هێنا، بیستمەوە شووی بە هەڵەبجەیییەك کردووە، دەڵێن دوو سێ کوڕی لەم هەڵەبجەیە هەن، نایانناسم.. لە شەڕی شێخی نەمردا، شێخانی ناوچەی قەرەحەسەن سەرلەبەری دەدەنەوە پاڵ شێخی گەورەمان. وەك گوتم ناخۆشی ئەکەفێتە ناو تاڵەبانی و شێخانەوە، گەلەجووتی یەکدی بەردەدەن، شەو دزیان دەنارده سەر یەکدی و هتد... سەید محەمەدی جەباری یەژێ، وەستا مستەفا، ئیدی ناتوانم بتپارێزم، چاك واسە، بڕۆی، بچیتە پەنای تەها بەگی ساڵەیی، ئاغای گوندی مامەشە (مەحمە شا)... نامەیەکی بۆ دەنووسێ، بار دەکا، دەچێتە دێی مامەشە. لە پاشان دایکم کە بە ئەسڵ لە تیرەی عابابازە و ڕەنگە کۆنە کاکەییی باوەمەردە و قوڵەدەرەسی و باوەگێڵدی بن.. بەڵام کەوتبوونە ناوچەی باداوای ناوچەی قەرەحەسەن. باوکم لە ٤٨ی ك دا، دەمرێ. بەندە لە ٤٨ ك.دا لە دایك بووم. کەسوکارەکەم لەگەڵ ماڵی شێخ حوسەین و شێخ جەباردا زۆر تێکەڵ بوون، تەنانەت یەك دوو ساڵێ حەمەی برام لە مامەشەوە گواستیەوە بۆ دێی چیمەن، کە ئەوسا شێخ جەباری لێ بوو، براژنە نەجمەم کە ئەویش هەر عابابازە و خزمی مەلا عەلی فەتحوڵڵاو دایکمە، کولیچەی کەرکووکیانەی بۆ شاییەکەی شێخ حوسەین بردبوو، خێزانەکەی شێخ حوسەین کچی سەید ئینجەیە. هیوادارم، هەر مابێ و لەگەڵ کوڕەکانیدا، لە کەرکووك بەرقەراربن. ئازادی کوڕی دەناسم، کوڕێکی کوردپەروەرە. دەستیان شکێ کوڕێکی شێخ حوسەینیان لەناو برد. مامۆستا مەلا جەمیل زۆری هەوڵ بۆ دا، سەری نەگرت. دوا دیداریم لە ساڵی ١٩٩٢دا، شەوێك لە کەرکووك دەگەڵ لەتیفی مەلا مەجیدی گلدا بووم. بەڕاستی بەهەشتی زۆری باس و خواسی کەرکووك و ناوچەی قەرەحەسەن و ڕووداوی لەمێژینەی بۆ گێڕامەوە، کەمم لێ دەزانی. زۆرم لەم حەکایەتانە لە شێخ بیستەوە. بەهەشتی مامۆستا بوو... جەباری دێهاتیان زۆرە، تەکیە و جەوز و حەمك و بانگۆل و گۆلە مەو و چیمەن و عەلی مستەفا و ژاژ و نەورۆز

و تاوێربەرز و تەپە سەوز و وەسمانە لەکە و هتد... هەموو بە جەباری لە قەڵەم دەدران. خودا یاربێ لە دەرفەتێکدا شتێك لەبارەی هۆزی جەبارییەوە دەنووسم.. داوەدە: هۆزێکن لە ناوچەی حەوت تەغار نیشتەنین. دارا بەگی نامێ برا گەورەیان بوو. پیاوی چاك بوو. ناوبەناو تفەنگی بۆ کاکم دەنارد، بۆی چاك دەکردنەوە. لە بیرم نەبوو، لە پەنجایەکاندا، وەستا نووریی برازام بوو بەوەستای کاك عەریف حەمیدی بەڕێز، کاتێ پێشمەرگە فیشەکی مەوجوودیان نەدەما، جێ فیشەکی تفەنگەکانی بۆ دەگۆڕین، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا حاجی ئیسماعیل دەیناسی، کە لە ڕووداوی دەسدرێژییەکەی بەغدادا بۆ سەر کاك ئیدریسی جوانەمەرگ، لێی خەفتان و بریندار بوو، وەستا نووری هات بۆ خزمەتی، زۆری خۆش دەویست. جارێکیان پار لە مەسیف، کاك عەریف حەمیدم دیت، بەداخەوە دەرفەت نەبوو، چاك و چۆنیی دەگەڵدا بکەم.. زۆرم بەکۆڵەواری دیت. خوێندەی بەڕێز، ڕەنگە بەم درێژدادڕییەم سەرم ئێشاندبی، بمبەخشە، پیاو شتی چاك نابێ لە بیر بکا.. سی کەسم لەو ناوچەی قەرەحەسەنە ئەنفال کراون. ئێستاش سەر و شوێنیان دیار نییە. کاکەیی تیرەیەکن لە ئەهلی هەق. سەیدەکانیان خۆیان بە سەیدی بەرزنجە دەزانن. پێتەختیان سەلاحییەیە، سەید فەتاح ئاغا زۆر پیاوی چاك بوو. جەمال ئاغاش پیاوی چاك بوو.ساڵێکیان، سەید فەتاح ناردمی ببم بە مەلای کاکەییەکان، وەك لە شوێنێکی دیکەدا باسم کردووە، سەری نەگرت... مەرقەدەکەی ئیمام ئەحمەد خان لە گەڕەکی موسەڵلایە، مەزاری ورد و درشتی خەڵکی کەرکووك بوو. بڕێ کەسوکارم تا ئێستاش بە دەوروبەری مەرقەدەکەیەوەن. خووگ: بەراز. گاحوول: گای سورخن. دەستان: داستان. ئیختیار کرد: هەڵبژارد. فیرار (ع. الفرار): هەڵاتن. هەر نیسە: وتەیەکی تورکییە، واتە: هەر چۆنێ بێ.

(٦١) یێ

**برازا عەزیزەکەم***

ڕووم کـردە بــەزمــی خــاسی بــرازا عــەزیـزەکــەم
ئــەمشەو بــەسەد تــەوازوع و ئـیـخـلاس و سەرکـزی
ڕوانـیـم لـە درزی قـاپـیـیـەوە، خـۆی و تـابـیـعـان
دانــیشتــبــوون دوو ڕیــزە لــە دەوری خــلــەکــەزی

دەتگوت تەمێ کرابوو بە مەخسووسی قاپییەوان
خۆی کرد بەنێرە تورك و وتی: (کیم بیلیر سزی؟)(١)
پێم وت: "منم فلانەکەسم، مامەشێخ ڕەزام
تانمزمیسن (خمیس أفندی) مگر بیزی؟"
ئەم سەددی بابە بۆ منە ئیزهاری کە بڕۆم
یان مەرحەمەت کە، حیزە لە سەرما گونم تەزی
ئەمجا بە کوردی هاتە تەکەللوم، وتی: بەڵێ
تۆ شێخی حیلەساز و قوماربازو کەردزی(٢)
وەختێ کە لەم موعامەلە زانیم غەرەز چییە
دەرحاڵ گەڕامە پاشەوە، ئەمما بە عاجزی

..............................................................

(١) بیلورسزی: (ش) بە تورکی کۆن.
(٢) بۆ شێخی حیلە بازو (م. ت). شێخە قوماربازەکانی (أ. ك): بەستەکە بەمە کەچ دەبێ.
(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەددەس مورەففەل
(مستفعلن مستفعلن مستفعلاتن)
وەك: "عمری تبە کردم بە عشق و آرزویی
چون سرمە در چشمان کشیدم خاك کویی"
تەوازوع (ع. التَّواضع): تەوازوو، بێ هەوایی . ئیخلاس (ع. الإخلاص): دڵسۆزی. کیم بیلیر سزی (ت.): کێن؟ (تەرجەمەی وشە بەوشە: کێ دەتانناسێ؟). تانمزمیسن خمیَّس افندی مگر بیزی؟: مەگەر نامانناسییەوە خومەییس ئەفەندی؟ سەددی باب (ع. سدُّ الباب): دەرکە پێوەدان. تەکللوم (ع. التَّکلُّم): ئاخاوتن.

## (٦٢) یێ
## ماینەکەی کوێخا عەلی*

کێ چوزانێ کووچەڵەی سمتی شکاوە یا ملی
وا لە حاڵی حەلوەلادا ماینەکەی کوێخا عەلی

چـووم بـزانم مـاوە، یـاخـۆ مـردووە وەخـتـێ کـە دیـم
شادەمـــاری سستـــە نـــابـــزوێ ڕەگـــی قـــاچ و قـــولـــی
دام بە سەر خۆمدا گوتم وا حەسرەتا بۆ ماینە کوێت
دەك بـــەمـــیـــراتم کـــەوێ دەسبـــەنـد و هـــەوسار و جـلـــی
نـەبـز و قـاروورەی ئـەگـەر سەدجـا تـەمـاشا کـا حـەکیم
دەردی نـــازانـــێ چـــیـــیـــە تـــاکـــو نـــەکـــا بـــێنـــی سلـــی
گـەر ئـیـمـامـی عـەسکـەری نـوێژی لـەسەر کـا لایـیـقـە
چـونکـە مـوشتـاقـە بـە وەسڵـی نـاڵـەکـانی چوار پـەلی
کەسری ئەنفی دوشمنان و جەبری کەسری دۆستان(١)
هـــەر بمێنـــێ چـــاکـــە بـــەخـــوا شێخ ڕەزا و کـــێری زلـــی

.............................................................

(١) عونقی (م. ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: "شرط مردان نیست در دل عشق جانان داشتن

پس دل انـدر بنـد وصل و بند هجران داشـتن"

کووچەڵە: چالاو. حەلوەلا: پەلەقاژێ لەسەر تۆپین. وا حەسرەتا (ع.): حەیف، مخابن. دەسبەند: دەستەجڵەو. هەوسار: ڕێشمە. جل (ع. الجلّ): فەقێ بووم، ئەو میساله لە کتێبە نەحوەکاندا، بە "الجلُّ للفرس" بۆ مانای موڵکییەت دانی "ل" کە حەرفی جەڕە، دەهێندرایەوە. زۆرم لا سەیر بوو، باسی (جل) و ماین، چما میسال قات بوو؟! ئەو جلە لەبەر سەرما بەسەر پشتی ئەسپ و مایندا دەدرێ. نەبز (ع. النَّبض): دڵ لێدان. قارەورە (ع. القارورة): شووشەی دەرمان، هەر دەفرێکی وەکو گۆزەڵە بچێ. حەکیم (ع. الحکیم): بژیشك، ئەو وشەیە مام هەژار دای هێناوە.. "بژیشکەکەی مام هەژار زۆر لە بارە: چونکە سەروکاری بە "ژین"ەوە هەس.. واتە ئەو کەسەی سەروکاری بەژینی مرۆوە هەیە. ئەحمەدی خانی لە مەم و زیندا واژەی "نۆشدار"ی بەکارهێناوە، پێم وایە، ئەوە زێتر ئەو مانایەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە واژەی "حەکیم" سەروکاری بە "نـۆش"ی گـیـانـەوە هـەیـە. ڕەنـگـە لـەپـێشدا ئـەو واژەیـە، زێتـر سەروکـاری بـە

دەرمانسازییەوە بووبێ، بە فارسی: "نوشدار"ە. واتە دەرمانێك نۆشی گیان بێ، بێنی سل: بۆنی تەرس. ئیمامی عەسکەری: ئیمام حەسەنی عەسکەری (د.خ). کەسری ئەنف (ع. کسر الأنف): لووت شکاندن. لە لووت بەرزیی کەسێك شکاندن. جەبری کەسر (ع. جبر الکسر): شکست گرتنەوە، تێهێنانەوە.

(٦٣) یێ

**بۆچی ئەترسم***

دەرحەقی بۆچی ئەترسم بەخودا تا ئەمرێ
چی لە دەس نایە، مەگەر بێ گونی ئەسپم بگرێ
لە خەبیسی نییە میسلی کە وەکو جەوهەری گوو[1]
مەگەسی پێوە بنیشێ وەکو سەگ پێی دەوەڕێ
پێی بڵێن بەو تەرەسە گەر لە عەلەیهیم بدوێ
بە فەویێ عەزلی ئەکەم، نابێ لەوێدا بتڕێ
پدەری نێرەکەر و مادەری وەك ماچەخەرە[2]
کێ دەڵێ ئادەمە، کەربابە، وەکو کەر دەزەڕێ
وەرە لادە لە شەڕی ئالەتی مەعهوودی ڕەزا
موقتەزای گرتنە تەبعی بەخودا پێت ئەگرێ

................................................................

(١) دا: بە خەبیسی (ن).

(٢) ماچە کەرە (م. ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: "هەرگزم نقش تو از لوح دل و جان نرود
هرگزم از یاد من ان سرو خرامان نرود"

خەبیس (ع. الخبیث): پیس، گەمار. مێش: مەگەز. تەرەس: دەویت، جاکەش، گەوواد. عەلەیهی (ع. علیە): لە دژ. بدوێ: باخێوێ. ماچەخەر: ماکەر. ئالەتی مەعهوود: کاکە لاس. موقتەزا (ع. المقتضی): هۆکار، بەپێی.

(٦٤) یێ

**خادیمی سەججادە***

خـــادمـــی سەجـــادەء پـــێغـــمـــبـــری
کشتـــی جـــود و سخـــارا لـــنـــگـــری
أغـــنـــیـــا خـــواهـــنـــد از انـــعـــام تـــو
سیـنـیـێ شەکـراو، پـلاو دوو لـەنـگـەری
ئەو کەسەی خوانی لە بۆ دێ سوبح و شام
چـیـی لـە ئـێمـە زیـاتـرە غـەیـرەز کـەری

........................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "یشنو از نی چون حکایەت می کند
وز جـــدائیـــها شکـــایت مـی کند"
خادمی سەججادە: بنـەماڵـەیەکن، لە کەرکووك دادەنیشن. کەشتی جود و سخارا لەنگری: ئەتۆ بۆ کەشتیی دەهەندەیی و سەخاوەت لەنگەری، ئەو قورساییەی کە کەشتیی پێ لە نێو دەریادا ڕادەگرن.. سوبح و شام: بەیانی و ئێوارە..

(٦٥) یێ

**ئێستری زیندوو یا مردوو؟***

ئێستری زیندوو، بڵێم بۆم چاکە، یا مردووم دەوێ
ئـیـحـتـیـاجـم زۆرە خـانم، بـا بـڵـێم هـەردووم دەوێ
بێچووەکانم سەر لە سبحەینێ هەموو دەورم دەدەن
ئـەم ئـەڵـێ پـوولـم نـەمـاوە، ئـەو دەڵـێ بێچووم دەوێ
بـا وجـوودی ئـەم هـەمـوو تـەکلیفـە گێژیـان کردووم
کوڕ خەیاڵی ژن ئەکات و کچ دەڵێ من شووم ئەوێ

........................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "شرط مردان نیست در دل عشق جانان داشتن
پس دل اندر بند وصل و بند هجران داشتن"
بێچوو: پارەیەکی کەمی کۆن، لە هندستان (پێسە)ی پێ دەگوترێ. شوو: مێرد.

(٦٦) یێ

## تەخمیسی قەسیدەیێکی غەزەلی
## مستەفا بەگی کوردی*

دڵــی بــردم بــە نــاز و عـیشوە دیسان شۆخــی عــەیـیــارێ
فریبی دام بە سیحری چاوی خۆی مەحبووبی سەححارێ
لـە هـیـجـرانـا تـەقـم کـرد ئـەی رەفـیـقـان کوا مـەدەدکـارێ
(ئــەمــان مـردم عـیـلاجـێ، سا لـە رێی پـێـغـەمـبـەرا چـارێ
ویسال، یا قەتڵ و یا تەسکین، لە هەرسێ بۆم بکەن کارێ)
بـە دەوری نـێرگسی مـەستـی کـەسێ نـەیماوە مـەیلـی مـەی
لـە بـۆ شەهـدی لـەبـی لـەعـلـی دەنـاڵـێنـێ دڵـم وەك نـەی
لـە تـابـی ئـاتـەشی عـەشقـی بکـەم داد و فـیـغـان تـا کـەی
(ئـەوەنـد سووتـاوم ئـەسڵا تـابـی فـەریـادم نـەمـا سا دەی
رەفـیـقــان نـیـوەسووتـن ئـێوە، نـامــەرد عـەرزە هـاوارێ)
لـە رێگـەی عـەشقـدا نـایـانـە پـێم زنجیـرە مـەجـنـوونـی
لـە دەستـم چـوو رومـوزی دانش و فـەهـمـی فـەلاتـوونـی
وەکـو شەخسێ کـە زاری کـا لـە جـەوری دوژمـنـی خـوێنـی
(لە کونجی سینە دەنگی ئای و ئۆیی دڵ دێ بە مەحزوونی
وێران بـێ نـەمـدی ساتـێ لـێی نـەیـێ نـاڵـەی بـریـنـدارێ)
کە چاوی ساحیری دەستی بە غەمزە و ناز و ئیما کرد
مـەتـاعـی عـەقڵ و هـۆش و دەرکـمـی تـاراج و یـەغمـا کرد
کـەسێ نـەیـگـوت دریغـا کـێ ئـەتـۆی وا شێت و شەیـدا کرد

(ئەلای هەرکەس دەچم مەنعم دەکا، خۆت بۆچی ڕسواکرد
دریغ کـوا حـاڵـزانـیٚ ڕەببـی تـووشم بـێنـی بـیـمـاریٚ)
گوتم وەك سورمەیە بۆ چاوی عاشق خاکەکەی ژێر پێت
لە ئولکەی حوسندا گەر لافی شاهی لیٚ بدەی لێت دێت[1]
گـوتـی مـەیـخـانـە بیٚ داییم بـە یـادی چـاوی مـەستم جێت
(سەبـا یـارانـی مـەجـلـیس گـەر هـەواڵـی مـن بـپـرسن لـێت
بـڵـیٚ کـێشاویـەتـیـە مـەیـخـانـە چـاوی بێچووە عـەیـاریٚ)
سەری جەنگی هەیە داییم لەگەڵ من چەرخی دونپەروەر
نـە بـەخـتـم یـار، نـە چـەرخـم یـاوەر و نـە تـالـعـم ڕەهـبـەر
ئەوەند بیٚ ڕەحم و ساحیب کینەیە دەرحەق بە من دلبەر
(لـە نـەزعـا پێی ئـەڵێم، قـوربـان جـەفـا بـەسیـە، دەڵیٚ، کـافـر
ئەریٚ چیت دیگە تۆ سەگ مەرگ کارم ماوە پێت جاریٚ)[2]
نـــەمـــاوە ڕەونـــەقـــی بـــازاڕی عـــەقـــڵ و دانـــیش و وردی
بـە پـوولـیٚ نـایـکـڕم لـەم عـەسرەدا عـیـلـمـی (ئـەبـی وەردی)
لـــە ئـــەشعـــاری ڕەزا پـــەیـــدایـــە ئـــاساری جـــەوانمەردی
(دوڕو یـاقـوت دەبـــاریٚ لـەم کـەلامـی شیـرنـی "کـوردی"
خـــوا ساکـــوا لـــە دنـــیـــادا قـــەدرزانـــیٚ، خـــەریـــداریٚ)

---

(١) کەسرەیەکی موختەلەسە بخە ژێر (ن)ی (حوسن).
(٢) کەسرەیەکی موختەلەسە بخە ژێر (گ)ی (مەرگ).
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك: "دلا یاری دگر جستی بدین کار از تو خوشنودم
تو از زاری بیاســودی من از خواری بیاسودم"
شۆخ: جوانی ڕێکوپێك. عەییار: زیرەك، تەڕدەست. تەقم کرد: شەقم برد. مەدەدکار: فریاڕەس، یاریکار. سا لە زمانی کوردیدا بۆ ئامرازی هاوار، فریا، وەك "استغاثة"ی عەرەبی وایە، یا وەك ئامرازی (ألا)ی "استفتاح" واسە.. وەك: ألا یا ایها الساقي.... شەهد:

هەنگوین. لەبی لەعل: لێوی لال. کینایەتە لە سووری. تاب (ف. تاب): تاو، تێن، توان. فەریاد: هاوار. نیوەسووت: نیوەسووتاو. واژەی سووت، لە شیعری نالیدا هاتووە:

| | |
|---|---|
| سەهم و نەصیبی ئەصڵییە | بەحتی گیاهـ و گوڵ نییە |
| "تووتنە خەرجـــی سووتنە | مۆدنە مــاچی لەب دەکا" |

مــەجـنـوونــی: شێتـی. ڕومـوون: ڕەمـز، نما، نـیشانـە. دانش: کـورد بـەمـانـا ژیـری و فەلسەفەی بەکاردێنن. فەهم (ع. الفهم): تێگەیشتن. فەلاتوونی: وەك ئەفلاتوون. مەحزوون: خەمناك. زاری کا: بگریێ. کونج: سووچ، قوژبن. نووسیاران (الإیمان)ی عەرەبی بەمانا بەچاو، یا هەر ئەندامێکی دیکەی لەش، جگە لە دەست، ئیشارەت کردن، بەکاردێنن. بەڵام کورد واژەی نما، نوێنی هەس.. تاراج: یاغمە، تالآن و بڕۆ. دریّغا: مخابن، حەیف، دریّغ. ئەم ئەلفەی دریّغا، وەك گوتم بۆ هاوار و نودبەی عەرەبی، کورد دەکاری دەبەن. یا بۆ نزا، وەك: خدایا، حضرتا، سرورا، کە لە فارسیدا بەکار دێ، کورد لە شێوەی "خودایە"دا بەکاری دەبەن. سورمە: کل. ئۆلکە: واژەیەکی تورکییە، واتە: وڵات. لێت دێ: دەوەشێتەوە. نەزع (ع. النَّزع): گیانەڵا، سەرەمەرگ. ئـەبـی وەردی: مـحـەمـەد کوڕی ئـەحـمـەدی ئـەبـیـوەردیـی کـووفـنـی. کـووفـنـی یەکێ لە گـونـدەکـانـی ئـەبـیـوەردە. یـاقـوتـی حـەمـەوی یـەژێ: ئـەبـولموزەفـەر، مـحـەمـەد کـوڕی ئەبولعەبباس، ئەحمەد کوڕی محەمەد، ئەبولعەبباس، ئەحمەد کوڕی ئیسحاق کوڕی ئەبولعەبباس، محەمەد ئەلئیمام کوڕی ئیسحاق، کوڕی حەسەن، ئەبولفیتیان، کوڕی ئیبن ئەبو مەرفووعە، مەنسووری کوڕی عوسمان کوڕی عوتبە کوڕی ئەبو سوفیان، سەخری کوڕی حەرب، کوڕی ئومەییە کوڕی عەبد شەمس، کوڕی عەبد مەناف. یاقوت دەڵێ ئەم زنجیرە ڕەچەڵەکەم لە دیرۆکی مەنووچەر کوڕی ئەسەرسیان کوڕی مـەنـووچـەر نـەقڵ کردووە و ئـەمـەش دمـەیـەکـە لـەسەر کـتـێبـی وەزیر ئـەبـو شوجـاع نـووسراوە. کـاتـێ بـە بـاس و خـواسی ئـەبـیـوەرد گـەیشتووە، گوتـوویـە: ئـەو خـەڵکـی ئـەبـیـوەردە و سەرجـەڵـەی نـێوبـراو بـۆ وی ساغ نـەبـووەتـەوە و ئـەو لـە خـزمـەت مـوئـەیـیـەدولمولك کـوڕی نـیزامـولمولکدا دەژیـا و ئـەو سەروبـەندە بـووە کـە گوندی کووفنیی نەخشە کێشاوە. کووفن (یا کوفن) گوندێکە لە نێوان نەسا و ئەبیوەرددا هەڵکەوتووە. کاتێ ئەبیوەردی نامەیەك بۆ خەلیفە دەنووسێ، بەسەردێڕی (الخادم المعاوی"... بڕوانە: لغتنامەی دهخدا، ل: ٦٤، ٦٥، ٦٦، ٦٧و٦٨ حەکایەتەکە دوور و درێژە...

# چوارینەکان

(٦٧)*

شێخ سەعید سەرداره، شێخ مەعروف هەتا حەزکەی نەجیب
بۆ جەوانمەردی و شەجاعەت بەینی بەینەڵڵا نەقیب
گەر ڕەقیب نەبوایە کەی مابەینی ئێمە تێك دەچوو؟
کێر بەکوز داکی موفەتتین، گوو بەڕیش بابی ڕەقیب

............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "آن که نقشی دیگرش جایی مصور می شود
نقش او در چشم ما هر روز خوشتر می شود"
موفەتتین: بشێونە، ئاژاوەگێڕ.

(٦٨)*

ئەهلی عیبرەت بێنەوە با سەیری ناسرشا بکەین
دوو لە دوو سی کەم شەهیی کرد و کشێکی ڕێ نەهات
هاتی وا، سەیری نەهاتی کەن کە صەد تیپ و سوپا
پاسەوانی بوو لە نێو بەستا پیادەی کرد و مات(١)

............................................................

(١) ئەم چوارینەیە لە باسی (ناصر الدین شا)دا لە بەرگی دووەمی مێژووی ئەردەڵاندا ئایەتوڵڵای مەردۆخی بەناوی شێخ ڕەزاوە نووسیویە. میرزا ڕەزای کرمانی کوشتی. ئەم چوارینەیە لە چاپەکاندا نییە.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "یاد می داری که بـــا من جنگ در سر داتی
رای رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی"

ناسر شا: ناسیروددین شای قاجار. کوڕی محەمەد شای قاجار و چوارەمین پادشا لە زنجیرەی قاجارییە. لە شەوی شەشەمی مانگی سەفەر، ساڵی ١٢٤٧دا لە دایك بووە و لە ساڵی ١٢٦٣دا لە تەوریز جێی باوی گرتەوە. نزیکەی پەنجا ساڵ فەرمانڕەواییی کرد. لە ٦٦ ساڵیدا بەدەمانچە بەدەستی دەروێشێك بەنێوی میرزا ڕەزا کرمانی لە ڕۆژی هەینیی ساڵی ١٣١٣ی ك. م.دا لە حەزرەتی عەبدولعەزیم، کوژرا. هەر لەم جێگایەدا نێژرا. لە سەرەتای سەروبەندی فەرمانڕەواییدا، بەیاریکاریی میرزا محەمەد تەقی خانی گەورە (أمیر کبیر) دەستی دایە زنجیرەیەك لە وەڵات چاکردنەوەی هیمەکی و بنەڕەتانە. چەند سەفەرێکی بۆ وڵاتانی ڕۆژاوا کرد. بەهائییەکانی قڕکرد. شایەکی زۆر زاڵم بوو. دوو لە دوو سی کەم شەهیی کرد کشێکی ڕێ نەهات: واتە: پەنجا ساڵی فەرمانڕەوایی کرد و کەس کشی لێ نەکرد، بەرهەڵستیی نەکرد.. مەبەست لە ″دوو لە دوو سی کەم″ بەپێی ئەبجەد، ″دو″ کە جاران وەك فارسی بە یەك (و) دەنووسرا، دەکا ١٠ و لە دوو سی، کە ٦٠ە کەم کەیەوە، ٥٠ی دەمێنێتەوە، کە دەکا مەودای حوکمڕانیی ناسروددین شا. بەندە ئەم حیسابەم، لە پەڕاوێزێکی کتێبێکی قاموسچەی دەسخەتی ئەختەریی پەڕپووتی کۆندا بەم جۆرە دیتبوو: ″دە لە دوو سی کەم″، بەڵام ئەمە فێڵی شاعیرانەی تێدا نییە، ئومێد کاکە ڕەش چاکی هەڵێناوە، ئافەرین! دیارە مەبەست لە ″کش کردن″ وەك زاراوەیەکی کایەی شەترەنج، شا بەگیرهێنانە و خواردنیەتی... ئومێد کاکە ڕەشی بەڕێز سووکە باسێکی میزا ڕەزا کرمانیی فەرمووە، حەز دەکەم، بۆ زێدە زانیاری ئەم نەقڵەی لغتنامەی دهخدا، عەرز کەم: میرزا ڕەزای کرمانی ناسیروددین شای لە ڕۆژی هەینیی ڕێکەوتی ١٧ی زیقەعیدە، ساڵی ١٣١٣، لە حەرەمی حەزرەتی عەبدولعەزیدا بە شەش گوللە کوشت. کرمانی کوڕی مەلا حوسەین و لە پەیڕەوانی توندڕۆی سەید جەمالوددینی ئەفغانی بوو. بۆ خۆی خەڵکی کرمان بوو و لە تاران خەریکی شمەك بە دەستفرۆشی بوو. چەندین ساڵ بەتۆمەتی درۆ و دەلەسەی بەهائییەت بوونی، لە سیاچاڵاندا بەسەر برد.. ئەو دەنگ و باس و هۆیانەی کە بۆ کوشتنی ناسیروددینی دنە دا، بەدەم دادگایی کردنیەوە، بەهۆی خۆی و هاوپێوەندانیەوە کە هەمووی لە ژمارە نۆهەمی ڕۆژنامەی حەوتووانەی ″صور اسرافیل″، ڕێکەوتی ٢٨ی (جماذی الاخرة)ی ١٣٢٥ەوە تا ژمارە ١٧ی ڕێکەوتی ٢٤ی شەووالی هەمان ساڵدا و بەشی لێپرسینەوەی خۆشی بەتەواوی لە مێژووی

″وریابوونەوەی ئێران″، نووسینی بەهەشتی میرزا کازمی کرمانی و تەرجەمەی ئینگلیزیی وی لەو کتێبەدا کە بەسەردێری ″انقلاب ایران″ نووسینی ئەدوارد براونەوە نامێیە ڕوون کراونەوە و لە چاپ دراون. پاش هاتنە سەر تەختی پادشاییی ناسیروددین شا بە دوو مانگ و چەند ڕۆژێك، میرزایان لە سبەینێی پێنج شەمەی دووەمی مانگی ڕبیعول ئەووەلی ساڵی ١٣١٤، لە مەیدانی مەشقی تاراندا لە سێدارە دا و دوو سێ ڕۆژێکیش هەر بەسێدارەوە مایەوە و خەڵك لە هەمووولاڕا بۆ سەیرکردنی دەهاتن و لە ژێر چاودێریی قەرەولاندا، لە دوایی یەکەوە تواشایان دەکرد. پرسە و چلەیان بۆ نەگێڕا. شەوی چلە و ساڵ وەرگەڕانی لە لایەن حاجی شێخ هادی نەجم ئابادی و دوو سێ کەسەوە، بەنهێنی بۆ گێڕدرا. میرزا، کوڕێکی بەنێوی تەقییەوە هەبوو، لە پاش مەرگی باوی، لە دووکانی نانەوایەکاندا نانی تەفتوونیی شاتریی دەکرد.. خەڵك دەستە دەستە دەهاتن، بەنێوی کوڕی بکوژی شاهی شەهید بەیەکدیان نیشان دەدا. تەفتوون: جۆرە ئەستورکێکی ئێرانییانە، لە کەربەلا و نەجەف و کازمییە، ئێستاش هەر ماوە. مەسەلەی کورد بوونی میرزا ڕەزای کرمانی، بەندە بەش بەحاڵی خۆم لە سەرچاوە فارسییەکاندا چاوم پێ نەکەوتووە. کتێبێکم، لە ئەبوو سۆران، کوردی خزمی ئەمیر نیزام گەڕووسی و کتێب فرۆشی بەغدا وەچەنگ کەوت، نزیکی یەکێ لە پەیڕەوانی بەهائەڵلا کتێبێکی بە ئینگلیسیی نووسیوە و کراوە بەفارسی، ناوەکەیم باش لە بیر نەماوە، لەو کتێبەدا میرزای کرمانی بەفارس لە قەڵەم دراوە. ئەو تاکە شیعرەش کە کاك ئومێدی بەڕێز، ئەباڵی داوە، جێی گومانە.. ئەم جۆرە شیعرە، بۆ زۆر کەس گوتراوە. بەعەرەبی، بەتورکی هەیە.. تەنانەت زۆر مانای لەم جۆرە بابەتەشم، لە هێندێ سەرچاوەدا لەمەڕ کەسانی نامێ بەرچاو کەوتوون. ئێرە جێی نییە باسیان بکەم.. مەبەست لە دوو بەیتەکەی ئەم پارچە شیعرە ئەوەیە، کە شا دەگەڵ ئەو هەموو هێزی خۆ پاراستنیدا نەیتوانی خۆی لە چەنگاڵی دوژمنانی بپارێزێ.. دیارە هەموو دیکتاتۆرێك سەرەنجامی هەر ئەمەیە.. دیارە کە جنێو بە حەمەی وەستا فەتاح بدا، جنێو بەژنی شێخ عەلیی برای دەدا.. کاك ئومێد کاکە ڕەشیش دیاردیی بۆ ئەمە فەرمووە.

(٦٩)*

گوو بە ڕیشی تەنکی عەوڕەحمان بەگی قائیممقام
ئەو کە بەینێك بێ زیان بوو، بازیان مەغرووری کرد
تاڵەبانی بوو، کە سفرەونان و خوانێکی هەبوو
دای بە سەریا هەروەکو خەپلەی قنکی خاپووری کرد

........................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم
عالمی از عالم فکرت به کف می آورم"
وشەی "عەبدوڕەحمان" دەبێ بە "عەوڕەحمان" بنووسرێ، دەنا بەیتەکە کەچ دەبێ...
بڕوانە ل: ٢٥٤، ئومێد کاکە ڕەش.

(٧٠)*

شێخ عەلی خۆت و منت ئاوارە کرد و دەربەدەر
چاکە هەجوێکت بکەم، ئەمما موفید و موختەسەر
بۆ حەمەی وەستا فەتاح ئێمەت هەموو ئاوارە کرد
ئەی حەمەی وەستا فەتاح دایکت بەکێری نێرەکەر

........................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "شرط مردان نیست در دل عشق جانان داشتن
پس دل اندر بند وصل و بند هجران داشتن"
لە بارەی ئەم شیعرەوە، کاك عەلیی حسێن بەگی جاف، ئەم نەقڵەی بۆ گێڕامەوە:
ئەگەر ئەم چوارینەیە سەرپێییانە بخوێنینەوە، تووشی سەرسوڕمانێك دەبین، شێخ ڕەزا دەیەوێت هەجوی شێخ عەلیی برای بکا، کەچی جێنو بە حەمەی وەستا فەتاحی فەقیر دەدا! بەڵام لە نەریت و ئوسووڵی شێخایەتی و دەروێشیدا، هەموو دەروێشێك

بەژنی شێخ دەڵێ "دایە"، واتە: هەموویان ژنی شێخ بەدایکی خۆیان دەزانن. جا لەبەر ئەوەی حەمەی وەستا فەتاح دەروێشی شێخ عەلیی برای شێخ ڕەزا بووە، واتە ژنی شێخ عەلی دایکیەتی.

(٧١)*

قــوزی گــازێ ئــەگــەزێ کــێر وەکــو گــاز
بەری عەرسەی پانە وەك دەشتی حیجاز(١)
قیتکەیێکی هەیە وەك گردی دماوەند، ئەعلا
پڕ لە هێلانە کەو و قشقرەو و کۆتر و باز

---

(١) عەرەسەی پان وەکوو دەشتی حیجاز: (م .م). پیرۆز ژنی جەمیل سیدقی زەهاوییە. دیوان.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەخبوون مەقسوور.

(فعلاتن فعلاتن فعلان) بۆ دوو بەیتی یەکەم.

وەك: "با منت کینه و با جمله صفا است

این همه از طالع شوریده ما است"

دوو بەیتەکەی دواییان، کێشەکەی بەم جۆرەیە: ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەقسوور

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان).

وەك: "من نگویم کــه مرا از قفس آزاد کنید

قفسم برده به باغی و دلم شاد کنید"

گازێ: بە قەسەی ئومێد کاکە ڕەش، ژنێکی چاکەکار و خاوەن دیوەخانی سلێمانی بووە و گەرماوێکی بەنێوی خۆیەوە لە سلێمانی هەبووە. ئافرەتێکی یەکجار باڵا بەرز و جوان و پان و پۆڕ و شۆخ و شەنگ و سوور و سپیی چاوشین و موو کاڵ بووە. لە سۆنگەی وەی کە کوڕەکەی خاتوو گازێ یاریدەی شاعیرانی سلێمانیی لە دژی شێخ ڕەزا داوە، ئەویش ئەمەی بەسەر دایکیدا هەڵداوە. کوڕەکەی یەکێ لە نیشتمانپەروەران و ساماندار و کارچاکی سلێمانی بووە و لە سلێمانی و لە شۆڕشی شەشی ئەیلوولدا هاوبەش بووە و زیندان کراوە. بەڵام وا مەشهوورە، شێخ ڕەزا ئەم شیعرەی بەسەر پیرۆزی دایکی جەمیل سیدقی زەهاویدا هەڵداوە.. ئەگەر ئەم فەرمایشتەی کاك ئومێد

بەڵگەی هەبێ، کارێکی چاکی کردووە... تەشبیهی خەمشەی گازێ، یا پیرۆز. بەدەشتی حیجاز، هەرچەندە بێ ئەدەبییەکی تێدایە، موبالەغەیەکی سەیری تێدایە! دەبێ مەبەست لەم هەراوی و پان و پۆڕییە، ئەوەبێ کە ئەم ژنە دڵاوا و خانمە چاکە، هێندەی گان داوە، تا شتەکەی وەکو دەشتی حیجازی لێ بەسەر هاتووە.. قەت باوەڕ ناکەم شێخ ڕەزا، قسەی وا بەخانمێکی وا پڕ و پوختە و «چاکەکار» بێژێ.. زێتر، هەر پیرۆزخانمی مەبەست بووە واللّە أعلم بالصَّواب.. دماوەند: «دنباوند»، دم (تەم ومژ، هەڵم) + اوند= وند، هەڵمدار بەتەم و مژ و بوخار و دووکەڵ. دیارە ئەوەش بەهۆی ئاورپژێنەوە.. کێوی دماوەند، چیایەکە لەزنجیرە چیایەکانی ئەلبورز و کەوتووەتە باکوری خاوەری تارانەوە و ترۆپکی بڵندترینی سەرلەبەری دوند و ترۆپکەکانی ئێرانە و ٥٦٧١ مەتر بەرزایەکەیەتی. کیوی دماوەند سەر بەچوارەم سەردەمی زەوین شناسییە و لە داوێنەکانیدا ئاوی گەرمی مەرتاڵ (مەعدەن)ی هەس. ئاوی گەرمی لاریجان لە هەموویان نامێترە. ئەم تەشبیهەش هەر لە جۆری موبالەغەکەی پیشەوەس.

(٧٢)*

شێخ ڕەزام و بە فەساحەت لە جیهاندا مەشهوور
پسەری پیری نەزەرکردەیی قوتبی لاهوور(١)
شیعری من وەهبییە، کەسبی نییە، هۆشیارەوە بە
خۆت لە من لادە لە سۆراخی قنگت بەم مەخموور

..............................................

(١) تاڵەبانی و نەزەر کەردەیی پیری لاهوور (نسخە).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)

وەك: «دوش وقت سحر از غصَّە نجاتم دادند

واندر ان ظلمت شب آب حیاتم دادند»

نەزەر کەردە: بەر تەوەججوهـ کەوتوو. قوتبی لاهوور: شێخ ئەحمەدی هیندی. وەهبی: (ع. الوهبی):

زگماك، هەر لە خۆڕا، کەسبی نییە، هەر لە خۆڕسکڕایە.. سۆراخ کون. «سلحفات» بەعارەبی کراوی «سراخپای»یە.. واتە نێو دەست کون کون..

(٧٣)*

رەشە ڕەششاشی کـــەری ڕەش بـــە ڕەشت
تـــا ڕەشت مـــاوە ڕەش و سوور بـــە ڕەشت
چڵ و چێوی چـەمـی ڕەشنـەش بـە ڕەشت
بە لەشت، هەم بە بەشت، هەم بە ڕەشت

.......................................................................

(١) مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی لە دەفتەرەکەی مامۆستا خاڵدا نووسیویە: ئەم چوارینەیە لە لاپەڕە ٢٠ی دیوانی سالمدا سەروژێر نووسراوە و نیسبەت دراوەتە پاڵ شێخ رەزا. واتە بەم جۆرەی سەرەوە نووسراوە. بەڵام لای مامۆستای خاڵ بەم جۆرەی خوارێ نووسراوە:

رەشە ڕەششاشی کـــەری ڕەش بـــە ڕەشت
تـــا ڕەشت مـــاوە ڕەش و سوور بـــە ڕەشت
چڵ و چێوی چـەمـی ڕەشنـەش بـە ڕەشت
بە بەشت، هەم بە لەشت، هەم بە ڕەشت

ئەم چوارینەیە و چوارینەکەی دوای ئەمەش لە چاپەکانی پێشوودا نین. سەرواکان ڕێك نین. دەبێ پێش بە «ڕەشت» چوار جار دووبارە بووەتەوە، بەنموونە وشەی (هەش، بەش و هتد سێ جاران دووبارە بێتەوە...

(٢) (کش مەلا ئەحمەدی دەکە).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەخبوون مەحزوون.

(فعلاتن فعلاتن فعلن).

وەك: «بی رخت چون بە چمن راه کنم
سوی گـل بنـگرم و آه کـنم»

ئەم چوارینەیە، هەر وەك کاك کاکە ڕەش فەرموویە، دەبێ قافیەکانی هەروا بۆ نموونـە سەرلـەبـەر: ڕەش، هـەش، ڕەشنـەش، هـەش، بـن... لـە جـیـاتـیـی ″ڕەششاش″ ″مەششاك″یش هەیە، بەڵام زۆری لێ گەڕام، نە لە لغتنامەی دهخدا، نە فەرهەنگی مـعین، نـە مـونجیدی عـەرەبی، هـیـچ سەرەودەرێکم لـێ دەرنـەکرد.. دوور نـیـیـە ″ڕەششاش″ەکە بێ...

*(٧٤)

مـزەی ئـــەوەنــدە نــەبــوو ئــاشەكـانــی جـێشانــەت
بــبــیٚ بــە قــووتــی شەوێكت ڕیــامــە جــیٚ شانــەت
بــەبــیٚ سەبــەب لــە سلـێمـانــی شاربــەدەر نــەكرای
نەكەوتە دەستی عەدووت مەكتەبە و كتێبخانەت

..............................................................

(*) كێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبون ئەصلەم
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلاتن فع لن).
وەك: " بەخاك پای عزیزت كە عهد نشكستم
ز من بریدی و با هیچ كس نپیوستم"

ئەم چوارینەیە لە بەیازێكی بیٚ ناوەوەم وەگیر كەوتووە، كاك ئومێد كاكە ڕەشیش دیاردیی بۆ كردووە.. و گۆیا فڕی لە شێخ ئەحمەد ناوێك هاوێشتووە. وەك كاكە ڕەش دەفەرمویٚ، لە سلێمانی خێوی كتێبخانە بووە... مزە، مز: كریٚ، ئەوهەندە گەنم و جۆیەی كە ئاشەوان لە باری ئاشی لە بری مزی وەردەگریٚ.. لە بیرمە، لە سیییەكاندا كە لە كەوەڵەی شێخ عەبدوڵڵای سەید عومەری خانەقا بووم، زۆر جار باراشم بۆ ئاشەكانی خوار كەوەڵە دەبرد، زڕكوڕێكی ئەمینە فەندیی خەڵكی كەوەڵە ئاشێكی هەبوو، زۆرتر هەر بۆ وێندەرێم دەبرد، نێویم باش لە بیر نەماوە، زڕبرای عومەری پیاوی ماڵی شێخ عەبدوڵڵا بوو، عومەر و سابیر و عوسمان و شوكور لە شەمەی بنەماڵەی قالە جادر بوو، بەڕەچەڵەك وا بزانم عارەب بوون، دەستی چاوەشیشیان هەبوو، خوشكە زازایەكم شووی بە عوسمانی قادر جادر كرد... زۆر جارم باراش بۆ ئاشەكەی لەیلان و ئاشەكانی چەمی ڕۆخانەش بردووە. جێشانە: گوندێكە لە ناوچەی سەرچنار. جیٚ شانەت: ڕیشی مەبەستە.. دیارە "جێشانەت" و "جیٚ شانە"ت، دەگەڵ یەكەیدا هاو ئاهەنگی سەربەسەر و تەواون.

*( ٧٥)

بۆم دەنێریٚ نیسك و نۆك و سووتەنی و خاكە و خەڵووز
لازمــە بـۆ گـۆڕی حـاجـی هــەر بـخـوێنـم قـول ئـەعـووز

حـاتـەمـیش ڕاستت دەویٚ نـاگـاتـە حـاجـی بـۆ سەخـا
مـاهـی ئـەنـوەر کـەی دەبـێـتـە نـەبـیـری عـالـەم فـرووز

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك " آن کــە نقشــی دیگرش جایی مصور مــی شود
نقش او چــشم مــا هر روز خوشتر مــی شود"
خەڵوون: زووخاڵ، ڕەژوو، ڕەژی. قول ئەعوون: " قُلْ أعوذ بربِّ النَّاس و قُلْ أعوذ بربِّ الـفـلـق.." دوو ئـایـەتـی قـورئـانـی پـیـرۆزن. بـۆ خـۆ لـە شەڕی شەیـتـان پـاراستن دەخوێندرێن.. حاتەم: نێوی عارەبێکی بە دڵاوایی و سەخاوەت نامێ. نەبیر: ئەستێرە، خۆر. عالەم فرووز: جیهان هەڵگیرسێن، جیهان ڕوونکەرەوە.

(٧٦)*

هـەروەکو ئـەشکم بـەڕەنگی سووری خویٚ خوێنینە کوز
داستــانــی شاهــنــامــەی خــوسرەو و شیـریــنــە کــوز
ئـیـنشیـقـاقـی هــەروەکـو کـاڵـەك لـەبـەر شیـریـنـە کـوز
هــەر کــەسیٚ نـەیـچـەشتـبـیٚ نـازانـیٚ چـەند شیرینـە کوز

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: " باغبان گر پنج روزی صحــبت گل باید
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش"
ئەشك: فرمێسك، ڕۆندك. سوور: سوور، سوێر. ئینشیقاق (ع. الإنشقاق): شەقبوون، شکان. " سوور" و " سوێر" بەیتەکەی نالیم بەبیر دێتنێتەوە کە دەفەرمویٚ:
" هەر جۆگەو و جۆیباریٚ کەوا سوور و سوێر بیٚ
جـیٚ جـۆششی گـریـانـی مـنـە خـویٚ نـەڕژاوە"
کە " خویٚ نەڕژاوە" یا " خوێنەڕژاوە" بۆ سوێریی خوێش و سووریی خوێنیش دەست دەدا.

(٧٧)*

شۆخـێ بـەئـیـنـابـەت چـووە لای زوهـد فـرۆش
بـۆ ئـەخـزی تـەریـقـەت بـەدڵـی پـڕ لـە خـرۆش
خۆش هـاتە جەواب و وتی حەقتە وەلێ من[١]
ساڵـێکـە فـرۆشتـوومـە ئـیـمـانم بـە قـرۆش

..........

(١) خۆش هـاتە جەواب و وتی تۆ هەقتە وەلێ من (دیوان).

(*) کێش: بەحری هـەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف ئەهتەم.

(مفعول مفاعیل مفاعیل فعول).

وەك: ″ ای فیض بیا که عزم میخانە کنیم

پیمان شکنیم و می بەپیمانە کنیم″

ئینابەت (ع. الإنابة): لە جیاتی، لەبری. زوهد (ع. الزُّهد): لە دنیا دەسبەرداری.

قرۆش: پووڵ.

(٧٨) سین*

کـەسێ بـیـبـێ حـەیـاو و شەرم و نـامـووس
ئـەبـەد نـاکـا ڕەفـیـقـیـی تـاقـمـی لـووس
ئـەگـەر سەد ساڵ بـدەی ڕەنـج و نـەیـانـگـێی
قسەی وات پـێ دەڵـێن خـاریـج لـە قـامووس[١]

..........

(١) قسەی وات پێ ئەڵێ هیچ نەیگرێ قاموس: (م)، قسەی وات پێ ئەڵێن نەیگرێ قاموس: (ت)، قسەی واتە پێ دەڵێن قامووس: (م. م).

(*) کێش: بەحری هـەزەج موسەددەس مەحزووف

(مفاعیلن مفاعیلن فعولن)

وەك: ″ز بـاغ عـافیـت بـوی نـدارم

که دل گم گشت ودلبویی ندارم″

(٧٩)*

ئـەگـەر بـەرزنجەیـی غـەدریش بکـەن هـەر نـەیسە ساداتـن[١]
خـدر ئــاغــای ڕەبــاتــی داکــی خـۆگـێ ئـێوە بـۆ هــاتـن
خەزوورەی شێخ حەمید ئاغای ڕەباتی کۆنە قەڵتاغ شڕ
لـە ئــەسڵ و مــەعـدەنـا ئــەجـدادی ئـێوە دۆم و خــەڕڕاتـن

................................................................

(١) ئەگەر بەرزنجە غەدرێکیش بکەن هەر نەیسە ساداتن. (ن).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.

وەك: ″واز هر در که که باز آیی بدین خوبی و زیبایی
دری باشد که از رحمت به روی خلق بگشایی″

بــەرزەنجە زێدی ساداتــی بــەرەی شێخ عـیسا و شێخ مــووسا. نــەیسە: قسەیــەکــی تورکییە، واتە: هەر چییەك بێ. قەڵتاغ: ئەو چەرمە ڕەقەی کە بە زیندا دەگیرێ. دۆم: تیرەیەکی بەکلاش دروستکردن نامێن، جۆرێکن لە قەرەچیی گەڕۆك: خەڕڕات. (ع. الخراط): قەرەچی و کەسانێك کە لە دار تەشی و کەوچك و کاسە و کەوێڵ و تیرۆك و پنە خرت دەکەن، لە خرتی دەدەن، لێك و لووسی دەکەن. وشەی ″ المخروط″ بەعەرەبی ڕوونە. لێچوواندنی، باو و باپیرانی خدر ئاغای ڕەباتی بە دۆم و خەڕات بۆ تەوهینە.

(٨٠)*

گـەرچـی فـەقـیر و مـوفـلـیسە شێخ مـامـە ساڵـحم
نــەمـدی کــەسێ وەکـو ئــەو ساحـیـبـی کــەرەم
مـیـوانـی بـووم، نــان و کـەرەیـی نـایـە بـەردەمـم
ئێستـاش بـەبێ موداهـەنە مەمنوونی ئەو کەرەم

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون مەقسوور مەحزووف
(مستفعلن مستفعلن مستفعلن فعل).

ئـەم کـێشەش هــەر لـەو کـێشانـەیە کـە لـە شیعری فـارسیدام نـەدیـتـەوە.. مـوداهـەنـە:

مانایەکەی بەڕواڵەت، دووڕوویی دێ بەڵام مەبەستی چەورییە. باشە کەرەی بێ چەوری هەیە؟ ڕەنگە تۆراخی بۆ دانابێ.

(٨١)*

یـا ڕەسولـەڵـلا، دەزانـی تـۆ کـە (شەیـتـان)ە عـەدووت[١]
هەم لە تۆ مەعلوومە، خۆ من، ئوممەتی تۆم هەر چی هەم
کـەی ڕەوایـە، سەروەرا بـۆ تـۆ کـە (خـەیـرولـئـەنـبـیـا)ی
دوشمـنـی خـۆت شاد بکـەی و، ئـوممەتـیشت دڵ بـە غـەم

..............................................................

(١) بڕوانە ئومێد کاکە ڕەش، ل ٢٥٨ .

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صبحت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″

سەروەرا: ئـەم (ا)ی سەروەرا، بـۆ بـانـگـێشتن و نـیـدایـە، بـەکوردی وەك لـە وشەی ″خـودایـە″دا دەبـیـنـی (ـە، ە) بـۆ نـێر و (ێ) بـۆ مـێ، وەك کـیـژێ فـاتـێ خـەجـێ...″ خەیرولئەنبیا″ چاترینی پێغەمبەران.

(٨٢)*

بـا بـکـەم هـەجـوی حـیـمـاری ڕەگـی جـەرگـی ببـڕم
هــەروەکـو جـاوی نـەشۆراو کـوزی دایـکـی بـدڕم
شەهـوەتم هـاتـووەتـە جونبوش وەکو دەریـایی عومـان
لازمـە مـاچـەکـەری مـیسلـی حـیـمـاری بـکـڕم

..............................................................

(*) کێش: ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).

وەك: ″ هر کـە در کوی خرابات مرا بار دهد
بە کمال و کرمش جان من اقرار دهد″

حیماری: هەمزە حیماری، شاعیر بووە.. چاو: شاڵی لە داوەڵووکە، جانگ. جونبوش: هەرەکەت و بزووت. میسلی (ع. المثل): وەکو ماچەکەر: ماکەر. بۆ ئێستریش دەگوترێ.

(٨٣)*

موتەلەووین و میزاجی گووناگوون(١)
موتەسەرریف کێ دیویە بۆقلەموون
موتەسەرریف جگارەکەی لە دەما
دێ و دەچێ وەك مریشکی چیللە بەقوون

................................................................

(١) موتلەوین میزاجی گوناگون: (ن)، متلون مزاجی گوناگون: (م)، متصرف کە دیدە بوقلەموون: (ت)، متصرف کێ دیویە بۆقلەموون: (م).

(*) کێش: بەحری خەفیف موسەددەس مەقسوور.

(فعلاتن مفاعلن فعلان).

وەك: ″ نە خود اندر جهان نظیر تو نیست

کە قمـــر چون رخ منیر تو نیست″

موتەلەووین: زۆر ڕوو، بێبار. گووناوگوون: جووناوجوون، هەر جارە بەڕەنگێ .

موتەسەرریف: پارێزگار.

بۆقلەموون: قەلەموون. وشەیەکی بەعەرەبیکراوی یۆنانییە، بۆیەی وا پێ گوتراوە؛ چونکە پەڕی هەر جارە بە زۆر ڕەنگان دەگۆڕێ. کە دیدە: کێ دیوە.

(٨٤)*

جەنگ گاهی جوکل و مەحموود بەگ شیروانە بوو(١)
ئافەرین مەحموود بەگ لەم جەنگەدا شێر وا نەبوو
وەختێ قاسید هات و لێم پرسی، چلۆن بوو ئەم شەڕە؟
وردە وردە بۆی بەیان کردم کەچی شیرٍ وا نە بوو

................................................................

(١) جێگە جەنگی (ن).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك: "یاد می داری کە با من جنگ در سر داشتی

را رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی"

کاك عەلی حسێن بەگی جاف دەڵێ: لە بەیتی یەکەمدا "شێروانە بوو" واتە شێریش وا ئازا نەبوو، واتە لە شێر ئازاترە. لە بەیتی دووهەمدا کە دەڵێ "شیرِ وا نەبوو" من ئەویش هەر بە" شێر وا نەبوو» ئەزانم و ئەمەش جوانترە؛ چونکە شێخ ڕەزا بۆ کێش و قافیە دانەماوە. ئەگەر مەبەستی "شیرِ" بوایە ئەبوایە بەجۆرێك دای بڕشتایە، بیوتایە کەچی "شیرِ" شێر وا نەبوو نییە، ئەگینا هە شیرِی ڕووت بێ، شیری دوای گونجاو نییە و ئەو ئاشکرایییەی تیادا بەدی ناکرێ.. چونکە ئەگەر شێخ ڕەزا مەبەستی "شیرِ" بوایە، ئەوەی پێشووی لەگەڵدا نەئەگونجان، چونکە وەکو وتمان بۆ قافییە دانەماوە. بەندە دەڵێم: شێروانەی یەکەم واتە: قەڵای شیروانە، بەدەلیلی جەنگگاە. شێروانە دەبێتە خەبەری جەنگگاە. خەبەریش بەمەنتیق دەبێ حەملی مەحموولی ئەبالْ مەوزووع ڕاست بێ. ناگوترێ جەنگ گاهـ شێر بوو، ئازابوو.. چونکە مەوزووع غەیرە عاقیل و مەحموول سیفەتێکە بۆ عاقیل دەگوترێ. شێر وا نەبووی دووەم، واتە شێریش لە ئازایەتیدا بەو جۆرە نەبوو. شێر وانەبوو: واتە شێر نەبوو؛ چونکە کە وردە وردە بۆی بەیان دەکا، واتە باسی ئازایەتی و پاڵەوانیەتیی خۆی دەکا درۆ دەکا (دیارە بەلای شێخ ڕەزاوە)... ئەگەر مانای شیعرەکە بەم جۆرە لێك نەدرێتەوە شێخ ڕەزای بلیمەت هیچی نەکردووە و قسەیەکە زۆر سارد و سڕە.

(٨٥)*

تـف لـە ئـاب و هـەوایـی قـەلـعـەدزە(١)

کـە سەگـیشی لـە عـومـری خـۆی وەڕزە

مـلـی ئـەهـلـی لـەبـەر لـەڕی و چـرچـی

هـەروەکـو کـێری پـیـری پشت لـە کـوزە

---

(١) تف لە ئاب و هەوایی قەڵادزە: (م . م).

(*) کێش: بەحری خەفیف مەخبوون مەحزووف.

(فعلاتن مفاعلن فعلن).
وەك: "آه ازین زندگی ناخوش من
وز دل و خاگر مشوّش من"
قەلعەدزە: قەڵادزێ. دز، بەفارسی دژ، بەکوردی قەڵایە، قەڵاش لە" کەرك"، کەرخ" ەوە هاتووە. دزدار: قەڵادار. تەنانەت " ڕەواندز"یش، ڕەنگە هەر " ڕەوەند دز" بێ.

(٨٦)*

نابەکاری وەکو ئەم جووتە لەعینە لێرە
نەبووە قەت ئەمە موددێکی مەدید و دێرە
ئەو بە تر گوێز ئەشکێنێت و ئەمیش قنگ ئەدڕێ
هەردوو عاسین لەخودا، کێری من و ئەم کوێرە

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن).
وەك: " گرسر صحبت این بی سر و پایت باشد
بر سـر و چشم من دلشده جایت باشد"
بەدکار: خراپکار. مودد: موددەت. مەدید: درێژ. دێر: کۆن.

(٨٧)*

تۆ کە خۆت مەیلی جنێوبازی دەکەی شێخ سالح
بۆ دەکەی سەرزەنشی من کە ڕەزا هەجاوە؟
غایەتی بەندە جنێوم بەدوو سێ کەس داوە
تۆ هەتا ئێستە بەقوربان، بە هەزارت داوە

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل مەخبوون ئەصلەم.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن).
وەك: "صنما مردەء آنم کە تو جانم باشی
می دهم جان کە مگر جان جهانم باشی"

هـەجـجـارو: هـەجـجـاء، فـرێـاوێت، داشۆر. شاعـیر "ء" (هـەجـجـاء)ی لـەبـەر قـافـیـەی شیعرەکە بە "و" کردووە. بە هـەزارت داوە: دیـارە دوو مـانـا دەگەیـەنـێ یەکەمیـان جنێوت بەهـەزار داوە، دووەمیـان: گانت بەهـەزار داوە.

(٨٨)*

جەوهـەری مەحزە لە هـەردوو لاوە وەك تیغی دەبـان
داك كچی پاشای ڕەواندز، بـاب كوڕی پاشای بەبان
شێخ ڕەزاش هـەجـوی بكـا بـاز ئـیـعـتـیـبـاری بـۆ نـیـیـە
چـاك خـراپ نـابـێ بـەشیـعری شاعیرێکی قـەڵتـەبـان

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەقسوور.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان).
وەك: " من ز گوش او بدزدم حلقەای دیگر نهان
تـا نداند چـــشم دشمـن وربداند گو بدان"
مەحز: پەتی. قەڵتەبان: جاکەش، دەوێت، گەوواد.

(٨٩)*

بـە ڕەمـز قسەم پـێ دەڵـێ بـەگـی جـافـان(١)
بزن قنگی نەخورێ چی دەوێ لە نانی شوان
بـەكـێری گـەورە بـەرم، لـە مـەقـعـەدت تـا بـن
ئەگەر قووەت بدەیتە خۆت ترت دەبێت دووان

..............................................................

(١) بڕوانە ئومێد کاکە ڕەش، ل ٢٥٦.
(*) کێش: بەحری موجتەس مەخبوون مەقسوور.
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان).
وەك" دو چشم اگر بگشادی بە آفتاب وصال
بر آ بە چرخ حقائق دگر مگو ز خیال"

(٩٠)*

حـەمـەی وەستـا فـەتـاح سەد بـارەکـەڵـڵا لـەم سەر و ڕیشە
کـە گـوێدرێژێ بـەتـەنـیـا چـۆن ئـەبـا ئـەم بـارە قـامـیشە
لـە سەد بـاتمـان خـوری زیـاتـر نـەبـێ کـەمـتـر نـییـە وەزنـی
سەرت چۆنی هەڵئەگرێ من سەرم سوڕماوە لەم ئیشە(١)

..............................................................

(١) هەڵئەگرێ بە (هەڵەگرێ) بخوێنەوە.
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك:" اگر آن ترك شیرازی بدست آرد دل مارا
بخال هندویش بخشم سمرقند و بخارارا"
بارەکەڵڵا (ع. بارك اللّه): خوا فەڕ و پیتی تێ ئێخی.

(٩١)*

شێخ ڕەزا پـیـر بـووە ڕووی مـەجـلـیسی یـارانـی نـیـیـە
تـاقـەتـی کـەشمـەکـەش و گـەردشی شارانـی نـیـیـە
دەس بە گۆچان دەگەڕێ، ئێستە لەبەر زەعفی وجوود
مـەتـرەقـە سەر زلـەکـەی قـووەتـی جـارانـی نـیـیـە

..............................................................

(*) کیش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).
وەك:" بە خرابات برد از در این خانە مرا
کە دگر یاد شراب آمد و پیمانە مرا"
کەشمەکەش: کێشمەکێش، بگرەوبەردە. گەردش: گەڕان.

(۹۲)*

شێخ موستەفا لە زومرەی ئەولادی مورتەزایە
هەرکەس کە خەسمی ئەو بێ دەیگێم، لەلام غەزایە
حاجی ڕەسووڵی زادە مەفعوولی شێخ ڕەزایە
ڕەزا بەناڕەزایی وەك ماری بێ ڕەزایە

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موخەللەع.
(مستفعلن فعولن مستفعلن فعولن).
وەك: ″ای کامکار سلطان انصاف تو به کیهان
مسعود شهریاری خورشید تاجداری″
زومره (ع. الزمرة): دەستە. مورتەزا: حەزرەتی عەلی (د.خ) خەسم (ع. الخصم): دژمن، نەیار. غەزا (ع. الغزو: شەڕی موسڵمانان دەگەڵ کافران. مەفعوول (ع. المفعول): کراو. بەڵام شێخ ڕەزا: (مفعول به) مەبەستە... دوو مانای هەس: یەکەمیان ئەوەیە شتێك کاری فیعلێکی لە فیعلی تێپەڕ (المتعدی) ڕا وەبەر کەوتبێ و بە ئیستیلاح ″بەرکار″ە. دووەم: بە قوونیەوە کرابێ... بە ناڕەزایی و هتد... واتە: ئەگەر بە گان ڕازیی نەکا وەك ماری بێ ئیجازە، بەڵایە...

(۹۳)*

تۆیچ لێمان بووگی بەشاعیر ئەی حەرامزادەی سنە[۱]
بۆچە شانێ ناخەفێنی، مەسرەفی چەس ئەو تنە
عیززەت ئاهەنگی لە کوێ بوو ئەی کوڕی وەستا شەفێ
وردە ئاهەنگێ کە فەرمووت ها وەلای وەستاژنە[۲]

..............................................................

(۱)تویش لە من: (ت) تویچ لێمان: (م).
(۲) هاوەلای وەستا ژنەوە کوردیترە.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك: آن كە نقــش ديــگرش جايـــی مصــور باشد
نقش او در چشم ما هر روز خوبتر می شود″
تۆيچ: تۆش... بووگی: بوويیت. تن: قنگ.

(٩٤)*

پیر کە کۆکی و نەتڕی دوورە لە مردن هێشتا
وردە ئـاهـەنگی دوای کۆکـە نیشانـەی ئـەجـەلـە
پـیـر کـە کـۆکی وو تڕی دەنگی وەکو بـارەزەلـە
شاهیدی موعتەبەرم عیززەتی مەئمووری تەلە

---

(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).
وەك: ″گر مرا خار زند آن گل خندان بکشم
ور لبش جور كند از بن دندان بكشم″
وردە ئـاهـەنگ: وردە تڕ بە تەشبیهـ... زەل: ئەوەی تەرکەی چیغی لێ دروست دەکرێ.

(٩٥)*

گـەرچـی ڕیشم چـەرمگ و دنـدانـەکـانـیشم کـەلـە[١]
کـێرەکـەی مـردوومـراوم ئـێستـەکـەش هـەروا بـەلـە
من سەدی وەك تۆم لـە جێ گاوە کەچی ئێستا ئەتۆ
پـیـر و ئـیـفـتـادە (ڕەزا)یـە کـێرەکـەی بـۆ چـی شلـە

---

(١) د. کەمال فوئاد.
(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: ″شرط مردان نیست در دل عشق جانان داشتن
علـمی عالـــم فكـــرت بـــە كـــف مـــی آورم″

چەرمگ: سپی، مردوومراو: مردوو لێمراو. ئەمە مەجازێکی نەقلییە، بە ئیعتیبار (باعتبار ما سیکون)ی شتێك بە نێوی شتێکی کە لە داهاتوودا ئەو نێوەی لێ دەنرێ، گوتن. وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ ″إني أراني اعصر خمرا″ واتە ″اعصر عنباً سیصیر مآلاً إلی الخمر″.
بەل: ڕەب. کورد یەژێ: تەڕیەکەیت و بەلیە کەیت و وەخۆتیا ئەکەیت؟ ″ کەوچك. بەلۆکەش لەبەر بەلپی وای پێ گوتریاگە..

(٩٦)*

ئــەو مــریشك و کــەڵــەشێرە کــە وتم بــیــنــێرە
دووی لــە ڕێ مــرد و یــەکــێکــی بــە نــەخــۆشی لـێرە
شەو هەموو دەس بە دوعا بووین لە وەختی سەحەردا
کــەڵــەشێر ئــەمــری خــودای کــرد و وتم وای شێرە

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن).
وەك: ″ او نازنــین عیــب نباشد کە کــفد ناز ای دل
او همی سوزدت از عشق و تو می ساز ای دل″

(٩٧)*

هــەرکــەسێ نــاوی مــەلا عــەزیــزە
دایــیم بــن گــونــی هــەر گــیزەگــیزە[1]
بــەخــۆی گــەوواد و ژنــەکــەی حــیزە
خــواردنــی گــووە و شەربــەتــی مــیزە

................................................................

(١) داییم لەبن گونی: (ت)، داییم بن گونی: (م . م).
(*) کێش: بەحری.
(مستفعلاتن مستفعلاتن).

وەك: "زاهد چە سازم با چشم و ابرو
آن ناوك افكن این سخت بازو"

(٩٨)*

ڕقــی هــەڵسا سنــەیــی دێ لــە سلــێمــانــی دەدا
ئـافـەرین ئـەهلـی سنـە ئـەو ڕقـەتـان هـەر لـە كنـە
ئەهلی ئێمە لە سەفەر دەچنە ئەوێ حوكمە دەگێن
بە دوو پارە و قەرەپووڵێ ژنی كامیان تڕنە(١)

..............................................................

(١) لە دیواند نییە.

(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن).

وەك: " بە خرابات برید از در این خانە مرا
كە دگر یاد شراب آمد و پیمانە مرا"

لـە سلـێمـانـی دەدا: دوو مـانـای هـەس، یـەكـێكـیـان لـێدان، دووەمـیـان قـوونـدان. (ڕقەتان)یش دوو مانای هەیە: یەكەمیان بەمانای ڕك و كینە، دووەمیان بەمانای (ڕەق)، واتـە: كـێر. (لـەكـن)یش هـەر دوو مـانـای هـەس، یـەكـەمـیـان " لـە كن، لـەلا"، دووەمیان " لە كون، لە قنگ". دیارە ئەمە لە نووسینی كۆندا كە بە (ڕقەتان، لە كن) دەنووسرا، بە هەردوو جۆرەكەیان دەخوێندرایەوە.

(٩٩)*

حـاجـی عـەبـدوڵـڵا لـە ئـادەم فـیـلـتـرە(١)
بـاوجـوودی مـەرتـەبـەی پـێغـەمـبـەری
ئەم بە سەد شەیتان لە كۆیێ دەرنەچوو
ئـەو بـە شەیـتـانـێ لـە جـەنـنـەت دەرپـەڕی

..............................................................

(١) حاجی كاكەولا: (م.م ).

(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: ″ بشنو از نی چون حكايت می كند
وز جدائيـــــها شكـايت مـــی كند″

### (١٠٠)*

زوبدەی مەتاعی حیكمەتە ئەم شیعری كوردییە
هەرزانە بێ موبالەغە حەرفی بە گەوهەرێ
جامەی حەیاتی عارییەتی كورتە، زینهار
ئالوودە دامەنی مەكە بۆ پێچی مێزەرێ

---

(*) كێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون مەجبووب.
(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعل).
نموونەم دەست نەكەوت.

### (١٠١)*

وەعدی من و تۆ ئەی ڕەمەزان ڕۆژی جەزا بێ(١)
شەرعی من و تۆ لە حوزوور باری خودا بێ(٢)
ئەم لالەڕوخانە هەموو ڕەنگ زەردی دەسی تۆن(٣)
كێ دیویەتی شەقایق یەرەقانی بە سەرا بێ

---

(١) دەڵێن ئەم چوارینەیە هی زێوەرە (م . م). وەعدی: (ك . ر).
(٢) دیوانی من و....: (دیوان).
(٣) سادەڕوخانە: دیوان.
(٤) كێ دیویەتی لالە...: (دیوان).
(*) كێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەكفووف مەحزووف.
(مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن).
وەك: ″ آن كە خدای از قلـم لطـف نگـارد
شايد كە بر او زخمت مشاطە نيارد″

شێخ ڕەزا ئەم چوارینەیەی لەسەر سفرە و خوانی ماڵی مەحموود پاشای جاف لە مانگی ڕەمەزاندا فەرمووە. بڕوانە: ئومێد کاکەڕەش. ل: ١٩٩، ٢٠٠، ٢٠١.
ڕۆژی جـەزا (ع. الجزاء): ڕۆژی حـەشر و نـەشر و لـێپـرسینـەوە و مـەردم و سزای شایستەی خۆی تێدا بەرەوڕوو دەبێتەوەو چاکەکار بۆ بەهەشت و خراپەکار بۆ دۆزەخ و نـاری سەقـەر. حـوزوور (ع. الحضور): بـەرەوڕوو، نـەپـێوار. بـاری (ع. البـاری): ئەفراندکار، گوورێن، رسکێن. شەقائق (ع. الشقائق): گیایەکی یەك ساڵە، بەبڵندیی ٣٠ تا ٦٠سم، لە تیرەی خاشخاش، کە بەزۆری لە مەزرایاندا دەڕوێن. گوڵەکەی تاقانە و گەورە و جوانە و ڕەنگی سوور و دوو چاڵوێنە (کاسە) پەڕی هەس کە وەك خاشخاش زوو دەوەرن. چوار پەڕە گوڵی هەس بژو پەرچەمی زۆرن و لە بنەوە پەڕەکانی پنتی ڕەش ڕەشیان پێوە هەس. بۆ چارەسەر نەخۆشی بەکار دەبرێن. جۆری بەژەکی پەخشان، بێستانی. ئەرمەنستانی هەیە. شەقائقی نوعمانیشی پێ دەگوترێ.

(١٠٢)*

یـابـا لـە گـەڵـمـان وا بـە غـەرەز بـێ
هـەمین نـانـەوا و خـەجـێ ئـاشپەز بێ
ئـــەبـــێ شێخ ڕەزا لـــە بـــرسا بمرێ
لەگەڵ شێخ عەلی هەر بە دەغەز بێ(١)

.....................................................................

(١) کاکە ڕەش.
(*) کێش: بەحری ڕەجەز مورەببەع مورەففەل.
(مستفعلاتن مستفعلاتن).
وەك" زاهد چە سازم با چشم و ابرو
آن ناوك افكن این سخت بازو"

(١٠٣)*

چـوومـە خـزمـەت یـاری مـومـتـازم، وتـی لاچـۆ دزی
پێم نیشان دا ئەسڵی مەقسەد، نایە بەر دەستم کوزی

چـەنـدە هـاوارم لـە کـێرم کـرد نـەکـەی فـیـلـە نـەکـەی
گوێی نەدامیّ، خۆی هەوا دا کەوتە ناو قەعری کوزی

.............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فعلاتن فاعلن).
وەك" هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم
عالمـــی از عـــالم فکـــرت به کـــف می آورم"
قەعر: ناوەند. ئومێد کاکەڕەش دەڵێ ئەم پارچە هەڵبەستەم لە ساڵی سییەکانەوە لە مامۆستا مەلا فەتحوللای پاوەیی کە زۆر دۆستی شێخ ڕەزا و شوکری فەزڵی بووە، وەرگرتووە. ئەویش ئەم هەڵبەستەی بە وەڵامەکەیەوە لە زاری خۆی شوکری وەرگرتووە. پارچە هەڵبەستەکە ئەمەیە:
"هەروەکو ماکەر فشی کرد و لە ژێرما قەوقەویچ – ئافەرین بۆ دایکی شوکری و چاوی وەك کارمامزی"
ئەمەش وەڵامەکی شوکرییە:

"خـۆت لـە گـوڵـچین گـێڵ نـەکـەیت و کـاتـی ئـاشکـاری دزی
هــەروەکـو دۆڵـکـەی تـەکـێی لـێ هـاتـووە دۆڵـکـەی قـوزی
مـێرمـنـاڵـی بـەرتـەکـێ ئـەو بـاڵـقـی کـردوون هـەمـوو
بـارەهـا کـێرم لـە قـوزیـا و بـۆ قـنـگـیشی هـەڵـخـزی
ئەهلی کەرکووك، کەس نەما لێی تێرنەبێ، ئەی کۆنە حیز
عـەیب و عـارت زۆرە، دایـنـاپـۆشێ ئـەشعـاری گـزی.
(دیوانی شێخ ڕەزا، ئومێد کاکەڕەش، ل: ٢٠٢، ٢٠٣).

(١٠٤)*

کـە تـەشریـفـی هـات (ئـەمین فـەیـزی) بـە مـیـوانـی[١]
لـە عـوهـدەی شوکـری دەرنـاچـم، مـەگـەر خـۆم کـەم بـەقـوربـانـی
بە (خاتەم)کەی (سلێمانی)ی دەکرد وەك من (ئەمین) کەی بوو؟
(نـگین)ی مـن (ئـەمین)یشە لـە سای (فـەیـزی)ی (سلـێمـانـی)

..............................................................

(١) (بەیازی عەلییەفەندی).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).

وەك: " اگر آن ترك شیرازی بدست آرد دل مارا

بخال هندویش بخشم سمرقند و بخارارا

بەیتی دووەم ئومێد کاکەڕەش لە کەشکۆڵی محەمەد ئەسوەد و کەشکۆڵی مفتیی وەرگرتووە.

نگین (ف. ك. نگین): نقیم، گەوهەر و بەردی بەقیمەت کە دەکرێ بەنقێمی گوستیلك. سەدان بەیت بۆ تەشبیهی پەسندرای (مەمدووح) بە نگین، بەفارسی و تورکی گوتراون:

"گر انگشت سلیمانی نباشد

چەخاصییت دهد نقش نگینی"

(حافظ)

"سلیمان را نگین بود و و ترا دین

سکندر داشت آئینة تو آیین"

(نظامی)

نگین بەزۆر مانای دیکە هاتووە: زومڕووت و پیرۆزە و هتد... کە دە کاری گەوهەر چەقێنیدا دە کار دەبرێ. بەمانای گوستیلکی سلێمان پێغەمبەر، بەمانای فەرمانڕەوایی و دەسەڵات بەخشین و هتدە... خاتەم (ع. الخاتم): گوستیلك دوا ئاڵقەی زنجیرەی پەیامبەران. مەبەست گوستیلکی سلێمان پێغەمبەرە.

(١٠٥)*

بۆ شوورشێ ئەستۆم دەخورێ، شەڕ دەفرۆشێ[١]

با بێتەوە مەیدانی مەساف، گەر هەیە مەردێ

مـن داکی هەزاری وەکو تۆم گاوە بە فەردێ

نەتبیستووە، زەربولمەسەلە (سەد قەل و بەردێ)[٢]

---

(١) (د. کەمال فوئاد). ئەم بەیتە دراوەتە پاڵ مەلا مارفی مەستی.

(٢) ئەم بەیتە وەڵامی شێخ رەزایە: بڕوانە ئومێد کاکەڕەش ل: ٢٧٢.

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.

(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن).

وەك: "آن را که خدای از قلم لطــف نگارد

شاید که بر او زحمت مشاطه نیارد"

فەرد: تاك، تاکە شیعرێکی دە لاشیپانەیی، تاکە کەوشێ. قەل و بەرد: دەست تەنگیی کەسێ کە بۆ پارە خەرجکردن دەستی بلەرزێ...

## (١٠٦)*

وتم ئــەی شۆخــی پــەری چـیـهـرە ئـەمـەت پێوە دەچێ؟

وتــی یـــارایـــی جـــەوابم نـــیـــیـــە خـــۆت ئـــەیـــزانـــی

وتم هەر تێت ئەخەم و لێت ئەبڕم، هەرچی بڵێی(١)

وتــی هـــەر ئـــەزیـــەتـــی گـیـانم مـەدە، خـۆت ئـەیـزانـی

---

(١) کوردی کەرکووك لە جیاتیی تێت ئەبڕم (لێت ئەبڕم)یش دەڵێن. تێت ئەخەم و لێت ئەبڕم.

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).

وەك: "گر دست دهد خاك کف پای نگارم

بر لوح بــصر خــط غباری بنگارم"

پەری چیهرە: ڕوخسار وەك ڕوخساری پەری.

## (١٠٧)*

لـە خـەو هـەسـتـام خـورابـوو گـوێزەبـانـە

هـــەڵـــی دا ئـــاگـری جـووعـم زەبـانـە

دەهـــات دەنـگـی تـرم هـەروەك تـەرانـە

سەحەر گاهـان کە مەخمووری شەبانە

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەحزووف.
(مفاعیلن مفاعیلن فعولن).
وەك: ″ نبـایســـتی هم أول مهر بستن
چو در ل داشتی پیمان شکستن″
تەرانە: گۆرانی. شەبان: شەوپاسەوان. گوێزە بانە: تەوەقەترانە، گوێز: گوز″ ە، بەمانا ترە عوبەیدی زاکانی، کە ئەویش هەر لە گوێن شێخ ڕەزایە دەڵێ ″ مزگفت – ئەستەغفیروڵڵا – گوزگاه مسافران؟

(١٠٨)*

دەوری وەسمان بەگ لە کۆیە ژن نەما نەی گێن بەبە
نیسبەتی کۆیە لەگەڵ من نیسبەتی ئیبن و ئەبە(١)
ئەلغەرەز سووزانی وو زانی لە کۆیی چاترە

(١) ئین و ئەبە: (ر).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″
ئیبن و ئەب: کوڕ و باو، واتە: هەموویان لەون. کونی : قووندەر.

(١٠٩)*

هیجا مەزموومە، توخوا لێم گەڕێن با تۆبە نەشکێنم
(ولا تلقوا بایدیکم) غەرەز بۆ دەفعی ئیهلاکە
مەعاشی مانگی (کانون) و (شباط)م تا بەکەی نادا
کە ئازاری ڕەزا عەینی سمووم تەحسیلی تریاکە(١)

(١) کۆواری ڕەنگین، ژ: ١٠٠، ١٠١.

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك: " بە می سجّادە رنگین کن گرت پیر مغان گوید
که سالك بی خبـر نبـود ز راه و رسم مـنزلها"
مادەر (ف. مادر): دایك. گێتی: جیهان.
مەزمووم (ع. المذموم): فڕلێکرای، ناشیرن، خراپ. " ولا تلقوا بایدیکم" ئایەتێکە لە قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ: " وانفقوا في سبیل اللّه ولا تلقوا بایدیکم إلی التهلکة". ئازار: مانگی ئازار، یا ئێش. عەین (ع. العین): هەر ئەو، هەر هەمان. سمووم: ژەهری هەلاهیل. تەحسیلی تریاکە واتە: هەروەك تریاك دەرمانی ژەهرە، مووچەی مانگی ئازار، تریاکی ژەهری بێ پوولّیی ڕەزایە.

(١١٠)*

ئەی مادەری گێتی تۆ هەتا ئێستە نەزاوی[١]
زاتێکی وەکو فەیزی ئەفەندییی زەهاوی
مومکین نییە ئیراکی حەقائیق بە تەواوی
مومکین نییە ئیدراکی نەکا زیهنی زەهاوی

.............................................................

(١) ئەم چوارینەیە لە دیوانە چاپەکەی دواییدا هەردوو دێڕی بەجیا لە شوێنێکدا نووسراوە.
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)
وەك: " آن را کە خـدای از قلم لطـف نگارد
شاید کە بر او زحمت مشّاطە نیارد"

# تاکە شیعر

(١١١)*

مــاری ڕەشە خــنـکــاوە لــە گــێژاوی خــەلادا
کـێرمـە لـە قـنگی کـاکـە حـەمـەی حـاجی مـەلادا

................................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).
وەك: ″اندوه تـــو شد وارد کاشـــەنەام امشب
مهمان عزیزی مده در خانەام امشب″
خەلا. قوون.

(١١٢)*

لـــە بـــۆ مـــەغـــبـــووری و لـــێڵـــی دو سێ تـــێلام لـــە زێ وەردا
وەکو شەخسێ کە چەند کێری لە سەرچەشمەی قوزێ وەردا[١]

................................................................

(١) بڕوانە ئومێد کاکە ڕەش ل: ٢٥٦.
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك: ″بە می سجادە رنگین کن گرت پیر مغان گوید
کە سالك بی خبر نبـود ز راەو رســم منزلها″
مەغبووری: تۆز و خۆڵاوی. لێڵ: لهێل، شلوێ، سەرچەشمە: سەرچاوە.

(١١٣)*

ئـەحـمـەقـم نـەمـکـرد هـەتـا ڕیشم نـەبـوو گـانـێ بدەم
مستەفا بەگ چاکی کرد تا ڕیشی هات هەر گانی دا

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: ″گـر دلـم در عـشق تو دیـوانه شد، عیـبش مکن
بدر بی نقصان و زر بی عیب و گل بی خار نیست″

(١١٤)*

یـەهـوودی بـەچـچـەیێکم گـرت و لـێم بـرد و تـیـا خـووسا
کە تێم نـا چـاوی نووسا بـانگی کرد یـا حـەزرەتی مووسا[١]

(١) خەڵك بە زاری شێخ ڕەزاوە، بۆ لەتافەت بە (حەزرەتی مووشا)یان دەخوێندەوە (م . م).
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك: ″ألا یـا ایُّها السَّـاقی أدر کأسـاً وناولها
متی ما تلق من تهوی دع الدُّنیا وأهملها″

(١١٥)*

هـەر لە دەنگی کەڕەنا و شەیپووری جەنگیزخان ئەکا
وردە ئـاهـەنگی پـیـاوی پـیـر کـە وەختـێ گان ئـەکا

(*) کێش: بەحری ڕەمەل مەخبوون مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: ″زلف سر مستش چو در مجلس پریشانی کند
جان اگر جان در نیاندازد گرانجانی کند″
شەیپوور: زوڕنای لەشکر.

(١١٦)*

عـومـرم گـەیشتـە هـەشتـا کـێرم بـەکـارە هـێشتـا
تەسدیقی گەر نەفەرمووی هەستم بەرم بە ڕەشتا(٢)

..............................................................

(١) گەییە: (م). گەیی بە(س). تەسدیقی ئەگەر ئەفەرمووی (کاکە ڕەش).

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن موخەللەع.

(مستفعلن فعولن مستفعلن فعولن).

وەك: " ای کامکار سلطان انصاف تو بە کیهان

مسعــود شهریــاری خورشید تاجداری"

ڕەش: قوون. وەك ئومێد کاکە ڕەش دەڵێ شێخ ڕەزا ئەم تاکە بەیتەی لە وەڵامی (حەمادی)دا گوتووە، کە ئەم تاکەیە:

"دانەی دەمت نەماوە و لە گەف ناکەوی هێشتا

پیرە کــەری چەنەباز، ئەڵێم بکەم بـــە لەشتا"

(١١٧)*

مـەیلـی ئـەشعـارم هـەیـە، تـیـغـی زبـانـم مـوو دەکـا
هەرکەسێ جارێ کە بیگێم پڕ بەشارێ گوو دەکا

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك:" باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش

بر جفای خار هجران صبر بلبل باشدش"

موو دەکا: ئەوەندە تیژە موو دەبڕێ. ئومێد کاکەڕەش دەڵێ: شوکری فەزڵی وەڵامی ئەم تاکە بەیتەی شێخ ڕەزای بەم چوارینەیە داوەتەوە:

" ئەو جمیلەی تێی ئەبردی و لات جەمیل و لێی ڕەزا

(شوکری) شوکرت بۆ نەکرد، گوڵچین لە باخڵیا خزا

عەیبە هێندە سپڵە بی، تۆ زاهیرەن شێخ و مەلای

شاپڵیتەی کێری من چەند جار بە دەر قوونا چزا"

(١١٨)*

کـافـی کـلك و کـافـی کـوون و کـافـی کـەر تێکـەڵ کرا
ئیسم و ناو و شۆرەتی کەرکووکی لێ تێکەڵ کرا(١)

..............................................................

(١) کەشکۆلی (ح . ق). مەبەست: هەولێرە.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صحت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″

(١١٩)*

دانەی دەمت نەماوە و لە گەف ناکەوی هێشتا
پیرەکەری چەنە باز ئەڵێم بکەم بە لەشتا(١)

..............................................................

حەمادی ئەم تاکەی زیاد کردووە.
(*) کێش: بەحری عەریز (هەڵگێڕاوەی تەویلە).
(مفاعلن فعلون مفاعلن فعولن).
وەك: ″ بیا بیاو باز آ بە صلح سوی خانە
مرو مرو پیشم کتف چنین مجنبان″
گەف: هەڕەشە.

(١٢٠)*

(کووپە) هەیئەت، ڕوو (قەرە)، (سینەك) سفەت (دینار) پەرست
(ئەسکەمل) مل، مەشرەب (ئوغڵان) کاری (پاپاز)ی دەکا(١)

..............................................................

(١) بڕوانە ئومێد کاکەڕەش ل: ٢٥٧.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن سالم.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: ″باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″
شێخ ڕەزا نێوی برێ کاغەزی یاریی قوماری لەم تاکەدا کۆکردووەتەوە.

(١٢١)*

پێم مەڵێن ئەم دوو ژنەت بۆچییە تۆ شێخ ڕەزا(١)
شوکری بۆ تەسك و تروسکی وو جەمیل بۆ زگ و زا

................................................................

(١) دوو ژنەت بۆچییە تۆ (أ . ك). (جەمیلە) کاکە ڕەش.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل مەخبوون مەحزووف.
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)
وەك: ″گر مرا خار رند آن گل خندان بکشم
ور لبش جور کند از بن دندان بکشم″

(١٢٢)*

کێ دیویەتی شێخ عەلی! ماڵی خەزوور بۆ زاوا(١)
تۆ لە کوێ تەکیە لە کوێ بزنەگەڕی مەزناوا

................................................................

(١) کێ دیویەتی ئەی شێخ عەلی.. کاکە ڕەش.
(*) کێش: بەحری بەسیت موسەممەن سالم.
(مستفعلن فاعلن مستفعلن فاعلن).
وەك: ″ز عشق آن بی وفا افتادەام در بلا
هرگز نگوید مرا برخیز و یکدم بیا″
ئەم تاکە بەیتە لای کاکەڕەشیش و لە زۆر جێگەی دیکەمدا بە ″کێ دیویەتی ئەی شێخ عەلی ماڵی خەزوور بۆ زاوا دیوە، بەڵام ئەمانە هیچیان دەگەڵ ئەم کێشەدا ڕێك ناکەون... ڕاستییەکەی ئەمەیە: ″و″ کێ دیویەتی شێخ عەلی ماڵی خەزوور بۆ زاوا″.

(١٢٣)*

سێ ئیسم هەن بێ موسەمما هەروەکو ئابی بەقا
تەیری عەنقا، شاری جابولْقا، پڵاوی خانەقا

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: " یاد می داری که با من جنگ در سر داشتی
رای رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی"

ئابی بەقا: ئاوی حەیات، دەڵێن هەر کێ بیخواتەوە نامرێ.. گۆیا حەزرەتی (خدر) وە نسیوی بووگە.. ئەسکەندەری زولقەرنەینیش (ئەسکەندەری مەکەدۆنی) لە دووی گەڕاوە.. عەنقا: سیمرخ. نێوی هەیە و نێوەڕۆکی نییە. جابولْقا: پێشینان گوتوویانە: شارێکە بەرابەر شاری "جابولْسا"، یەکەمیان لە ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوین و دووەمیان لە ڕۆژاوای گۆی زەوین هەڵکەوتوون.. زانایان تا ئەوڕۆش لەبارەی بنیچە و بنواشەی ئەم دوو شارەوە بەئاکامێکی بنەبڕ نەگەیشتوون. سوورەوەردی، لە "**حکمة الإشراق**"**دا** " جابلق" و "جابرص" و " هورقلیا"ی لە ئیقلیمی هەشتەمدا جێ داونێ. هەرچی شارەزووریيە، لە شەرحی " حکمة الإشراق"دا هەرسێکیان بەناوی شارەکانی جیهانی "نموونە" دەزانێ و دەڵێ: جابلق و جابرص دوو دنیان لە جیهانی سریشتەکانی نموونە و "هورقلیا" لە جیهانی گەردوونەکانی نموونەیە.. عاریف و سۆفییانیش، هێندێ وتەیان لەم بارەیەوە هەس و خولاسە باسەکە دوور و درێژە... خانەقا: بەعەرەبیکراوی "خانگا"یە. بەهێورگای دەروێش و خوداناسان دەگوترێ. وەجهی شەبەهـ لە نێوان ئەم سێ شوێنەدا نەبوونە..

(١٢٤)*

دەمـــاری مـــردووە کـــێرم لــــە مـــاری مـــردوو ئــــەکـــا
لە ساق و ساعیدی میهتەر نەسیمی جادوو ئەکا(١)

---

(١) نەسیم(ت).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن مەخرووم مەقبووز (ئەم کێشەم لە فارسیی لەباودا بەرچاو نەکەوت).
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن فاعلن).
میهتەر: مەیتەر، سایس.

(١٢٥)*

داخیلی فەوجە لەسەر قنگ کێر بەگون دەعوا دەکا[١]
نـانـی کـون مـاسی دەخـوات و پـاسی جـرتـاوا دەکـا

..........

(١) زمانزەدی (کونە ماسی)یە، بەڵام بۆ وەزنی شیعرەکە (کون ماسی گوتووە).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "آن كە نقشی دیگرش جایی مصـــور می شود
نقش او در چشم ما هر روز خوشتر می شود"
کـون مـاسی و جـرتـاوا: نـێوی دوو گـونـدن لـە شاربـاژێر. نـێوەکـە بـۆ خـۆی "کونـە ماسی"یە، بەڵام بۆ کێشی شیعرەکە دەبێ بە "کون ماسی" بنووسرێ..

(١٢٦)*

چونکە شاعیر زۆر بووە لەم عەسرەدا
بووەتە حەشری نێرەکەر لەم حوجرەدا

..........

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: "بشنو از نی چون حكایت می كند
وز جدایـــها شكایت مـــی كنـــــد"

(١٢٧)*

شێخ ستار ئێمەی بەزاند وا بۆ مەلای گون سەنگەلا[١]
دینی پێغەمبەر بەئاشکار خۆشە یا من یا مەلا

............................................................

(١) بەزاندوا: واکە قورسە.... (م. م).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: ″ یاد می داری کە با من جنگ در سر داشتی
رای رای تست خواهی جنگو خواهی آشتی″
سەنگەلا: تایەکی سووك و تایەکی گران..

(١٢٨)*

کەلیماتی حیکمەت ئامێز لە جەنابی شێخ ڕەزاوە[١]
بە عەجایبی مەزانن کلکی تیایا ڕزاوە[٢]

............................................................

(١) کەلامی (ت، م)، کەلیماتی: (م. م).
(٢) (ل) (کلك) کەسرەیەکی مەختەلەسەی دەوێ.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون.
(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلاتن).
وەك: ″ ملکا ذکر تو گویم کە تو پاکی و خدایی
نروم جز بە همان رە کە توام راهنمایی″

(١٢٩)*

بەسە بۆ دەفعی ئەعدا چاوەکەم قەڵغانی سیمینت
هەزار مارتین بەقوربانی تفەنگی لوولە چەرمینت

............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).

وەك: ″ دلا یار دگر جوستی بدین کار از تو خوشنودم

تو از زاری بیاســودی من از خواری بیاسودم″

قـەڵغـان (ت. قـالقـان): تورس، مـەرتـاڵ. سیمین: زیوین. مـارتین: نێوی بـازرگـانیی جـۆرێ تفـەنگ کـە لـە سەروبـەندی قـاجـاردا، لـە ئێران بـاو بـوو. تفـەنگی مـارتینـی. بەکوردی لە گەرمیان ″ماتلی″یان پێ دەگوت. تفەنگێکی زۆر خوێڕیلە بوو. لوولە چەرمین: کینایەتە لە کوز..

(١٣٠)*

ئەسپەکەت دەرکرد لە دەستم وای درێغ بۆ ئەسپەکوێت(١)

سنگـەکـەی مـاوە کـەریـم خـان پـێم بـڵـێ بـیـکـوتمە کـوێت

---

(١) وا درێغ (دیوان).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك: ″ هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم

عالمــی از عـــالم فکـــرت به کـــف می آورم″

وای درێغ: حەیف، مخابن، ئەفسووس. سنگ: گوڵمێخ، مێخسکە.

(١٣١)*

کێر ئەگەر مەیلی کونی کرد، سەرەکەی بگرە لە مشت

هــمـــه جــا خـــانـــەء عشق است چ مسجـد چـە کـنشت

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەقسوور.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان).

وەك: ″ دارم از زلــف سیاهش گله چنـــدان که مپرس

که چنان زو شدەام بی سر و سامان که مپرس″

مشت: مست. لە کوردیدا، هێندێ کاو ″س″ دەبێ بە ″ش″ و بە پێچەوانەوەش، وەك: بڕست

″بڕشت″، ئاش ″ئاس″ (ئاسیاو) و هتد... همه جا خانهء عشق است چه مسجد چه کنشت: هەموو شوێنێ جێی ئاشقێنییە، چ لە مزگەوت، چ لە کەنیسە.. تۆبە و ئەستەغفار.

(١٣٢)*

خورووی نامرێ بە شیشی من تڵیشی ناوگەڵی داکت(١)
بڵێم چی صەد هەزار لەعنەت لە خۆت و شیری ناپاکت

..............................................................................

(١) خووری نامرێ بەکێری من تڵیشن ناوگەڵی داکت (ئومێد کاکە ڕەش).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).

وەك: ″ تو از هر در که باز آیی بدین خوبیً و زیبایی
دری باشد که از رحمت به روی خلق بگشایی″

خوروو: خورشت. شیش: کینایەتە لە کێر. تڵیش: کینایەتە لە کوز.

(١٣٣)*

گەرچی میرانی خدر بەگ موددەتێ قورعەی نەدا
پار لە خۆشناو قورعەیان کێشا و گەلێکیان پێوەکرد(١)

..............................................................................

(١) گەرچی میرامی خدر بەگ موددەتێك قورعەی ئەدا
پار لە خۆشناو قورعەیان کێشا و کلێکیان پێوە کرد
جاران وشەی (گەڵێکیان و کلێگان) وەك یەکتر دەنووسران؛ لەبەر هەندێ، وشەکە هەرتکان هەڵدەگرێ.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك: ″ باغبان گر چند روزی صحبت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″

گەلێکیان پێوە کرد: من ئەم وتەیەم بە ″ کلێکیان پێوەکرد″ یش بیستووە، کە بەمانای ″ بزێکیان پێوە کرد″ە..

(١٣٤)*

حەیدەری کەڕڕاڕە یاخۆ خالیدی ئیبنی وەلید
ڕۆستەمێکە ڕۆژی دەعوا بەینی بەینەڵڵا حەمید

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: " یاد می داری کە بـا من جنگ در سر داشتی
رای رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی"
حـەیـدەری کـەڕڕاڕ: حـەزرەتـی ئـیـمـامـی عـەلـی (د.خ). حـەیـدەر، بـە مـانـای شێرە. کەڕڕاڕیش، بەمانای لە شەڕدا دووبارە و چەند بارە هەڵمەت بۆ سەر دژمن بردنە.. " مکرّ مفرّ مقبلٍ مدبرٍ معاً – کجلمود صخرٍ حطَّه السیَّل من علٍ" حەمید: شێخ حەمیدی تاڵەبانیی گل.

(١٣٥)*

وەختێ ناجی ڕووت کرا وەك شێری نەڕ جەنگی دەکرد
گـاهـ گـاهـێکیش لـە تـرسان وردە ئـاهـەنگـی دەکرد

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فعلن).
وەك: " یاد می داری کە با من جنگدر سر داشتی
رای رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی"
وردە ئاهەنگی دەکرد: دەتڕی.

(١٣٦)*

قـوربـانـی پـەلـی بم کـە پـولـی هـەمـپـەلـی پـەل کـرد
خۆی و سەگەکەی هەردوو بەجارێ شەق و شەل کرد(١)

................................................................

(١) دەڵێن ئەم فەردە هی مەلا عەبدوڵلای جەلییە (م . م).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).
وەك: " دردی کە مرا هست بە مرهم نفروشم
ور عافیتش صرفە دهی هم نفروشم"
هەمپەل: نێوی دوختورێکی فەلەیە.

(١٣٧)*

ئەم قنگە زلە حیزە کە موسەمما بە ڕەشیدە
بیگرە لە ڕەشی نێ لە ڕەشی بە لە ڕەشی دە(١)

(١) د. کەمال فواد.
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون.
(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلاتن).
وەك: " همە کس را تن و اندام و جمال است و جوانی
وین همە لطف ندارد تو مگر سرو روانی"

(١٣٨)*

چایەکەی مامە غەفوورم زەردە وەك میزی نەخۆش(١)
ئیحتیاج ناکا بە ئاگر هەر بەدوو تڕ دێتە جۆش

(١) بەئاگر بەدوو تڕ دێنێتیە جۆش (ت، م). بە ئاگر هەر بەدوو تڕ دێتە جۆش (م. م).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: " یاد می داری کە با من جنگ در سر داشتی
رای رای تست خواهی جنگ و خواهی آشتی"

(١٣٩)*

صەد ساڵە ڕەنج ئەدەی وو هێشتا ڕووتتری لە سڵق[١]
کـێرێکـی سیس و دوو گـونـی چـرچ و قـنـگـێکـی فـلْـق

---

(١) ئەدەی هێشتا: (ت)، ئەدەیو هێشتا: (م. م).

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون مەقسوور.

(مستفعلن فاعلن مستفعلن فعل).

نموونەم دەست نەکەوت.

(١٤٠)*

هەر مەتاعێ کە تەڵەب کەی لە سولەیمانیدا
هەیە ئیللا کوزی بیکر و کونی ناموستەعمەل

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن).

وەك: ″ از تو با مصلـــحت خویش نمی پـردازم
همچو پروانه که می سوزم و در پروازم″

بیکر: نەسمڕاو.

(١٤١)*

بەم جووتە گونە کە دەڵێی عەنتەری نێرم
لێم لادە نەوەك بتخەمە بەر حەملەیی کێرم

---

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).

وەك: ″ آن را که خدای از قلم لطــف نگارد
شاید که بر او زحمت مشّاطه نیارد″

(١٤٢)*

بەغەیرەز میهری تۆ گەر بێ لە دڵما(١)

زڕەی زنجیـری زاڵـم بــێ لــە مـلـمــا

...............................................................

(١) (مەلا عەبدوڵڵای قزڵجی).

(*) کێش بەحری هەزەج موسەددەس مەحزووف.

(مفاعیلن مفاعیلن فعولن).

(١٤٣)*

سەر پەتی، خۆی لێ پەتی کرد تا مووانی نایە سەر

قوڵەڕەش هێندەی گوشی تا ئاوی لێ هێنایە دەر(١)

...............................................................

(١) بڕوانە پەراوێزی (٤)، (ئومێد کاکە ڕەش) ل: ٢٥٠.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

وەك: " باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش

برجفای خار هجران صبر بلبل بایدەش"

(١٤٤)*

تـڕی ئــەولادی ئــەم عــەسرە بــە کـێرم

کە من مردم مەگەر گوو بکەن بەخێرم

...............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج مەحزووف.

(مفاعیلن مفاعیلن فعولن).

وەك " ألا یـــا خیــمگی خیـــمە فروهل

کە پیشاهنگ بیرون شد ز منزل"

(١٤٥)*

موددەتێکە نێربازی و ئێستە مەیلی مێ دەکەم
ئارەزووی گانی کچێکی کوز پڕی دەرپێ دەکەم

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف.
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).
وەك: ″ هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم
عـــالمی از عالـــم فکـــرت به کـــف می آورم″
کوز پڕی دەرپێ: کوزی پڕ بە دەرپێ بێ.

(١٤٦)*

موخالەفەم نییە من ساعەتێکی میقاتم[١]
غولامی حەلقە بگۆشی ڕەسوولی ساداتم

................................................................

(١) یەکەمیان ئی شێخ ڕەزایە، دووەمیان ئی غەوسی گەیلانییە... (کش مەلا فەتاح).
(*) کێش: بەحری موجتەس مەخبوون ئەصلەم.
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن).
وەك: ″ بیا کە باسر زلـــف تو کـــــارها دارم
ز عشق روی تو در سر خمارها دارم″

(١٤٧)*

ئەم قەحبە، فەلەك لە داخی مردم[١]
مـوحـتـاجـی ڕەشی ڕەشیدی کـردم

................................................................

(١) فەلەك بە دڵی (قەحبە)یە؟
(*) کێش: بەحری ڕەجز مورەببەع مخبوون مورەففل.
(مستفعلاتن مفاعلاتن).

وەك: ″هم صحبت دل خیال وصلش
هـم بزم جان نالـه و فراقش″
ڕەشید: ڕەشیدی مەستی ئەفەندی.

(١٤٨)*

گـەلـێ سمـتـی سپـیـم دەس کـەوت و نـەمـتـوانـی پـیـاکێشم
درێغ بۆ تەمتوراقیی کێرەکەی چەند ساڵ لەمەوپێشم

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك: ″بتی دارم که گرد گل ز سنبل سایبان دارد
بهار عارضش خطی بەخون ارغـوان دارد″
تمەتوراقی: تومتراق، تەمتەراقی: دەبدەبە وشکۆ و هەیت و هووت.

(١٤٩)*

هـەر بـەتـەعریف و کینـایـەت لـە بنـی سنگت بـەم[١]
بـەگ ئـەفـەنـدی بـەسەراحـەت لـە کـونـی قـنگت بـەم

(١) هێند بەتەعریف (کاکە ڕەش).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم.
(فاعلاتن فاعلاتن فعلاتن فع لن)
وەك: ″از تو با مصلحت خویـش نمی پـردازم
همچو پروانه که من سوزم و در پروازم″
کینایەت: شتێکی بێژی و شتێکی دیکەت مەبەست بێ، وەك: ″پشتی ملی پانە″ واتە کەودەنە.

(١٥٠)*

نەجابەت کەی لە تۆدایە لە دوو چاڵی چەتیوت بەم[١]
حەمەی تووڵینە بەم تووڵە لە تووڵینەی هەتیوت بەم

................................................................

(١) ئەم فەردە هی ڕەشیدی لاوەیە (شێخ محەممەدی خاڵ – گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی کورد ساڵی ١٩٨٩.

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم.
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن).
وەك: " ترا در دوستی رایی نمی بینم نەمی بینم
مرا اندر دلت جایی نمی بینم نمی بینم"
چەتیو: کچە تیو، تووڵ: شووڕك، شووڵ. تووڵینە: قەرتاڵەی زۆر چکۆڵە.

(١٥١)*

ئەسبابی تەرەب زیر و بەمە ئەی بەگی جافان
بەزمێ بگرین چاکە لە من زیر و لە تۆ بەم

................................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف.
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن).
وەك: " گر خلق بدانند کە من عاشق و مستم
آوازە درست است کە من توبە شکستم"
زیر: ژێر، دوا ئاوازی پەیژەی موزیك، لە "دۆ" وە، لە "ڕێ" وە لە هەر ئاوازێکی دیکەوە، کە بەزاراوەی کۆن بەم و بە زاراوەی موزیك " ئۆکتاف" (هەشتەم ئاواز)ی پێ دەگوترێ. بەڵام بەم حیسابە بێ شێخ ڕەزا کەوتووەتە ژێرەوە.... بەمەرجێ وشەی "زیر" بەمانای "چووك" نەبێ.

(١٥٢)*

پیر بووە ناجی ئەفەندی، بووە پشتی بە کەمان
چرچ و ژاکاو و مولەووەس وەکوو کێری پاش گان

٦

**درهجو دختر مفتی بغداد*(١)**

(پیتی) ئەلف

نشوید گر درآمیزی بآب دجله جیحونرا(٢)
ز شهوت دامن آلودهء فیروزه خاتون را
توانی یافت چون گردش کنی در کوچهء فرجش
عمود سام و رخش رستم و گرز فریدون را
جماع مفت اگر خواهی برو در خانهء مفتی
در آنجا قدر یك جو نیست صد خرمن، کس و کون را
ز خردل دانهای کمتر نماید گر دراندازی(٣)
بسوراخ فراخ خواهرش دریای هامون را
میان هر دو ران خواهرانش جنگلستانیست
که آنجا خفته بینی صد هزاران خرس و میمون را
شکاف زیر ناف خانم فیروزه را نازم
که در زیر نگین دارد تمام ربع مسکون را
سه چندان سپاه روس لوطی در عقب دارد
اگر خواهد به آسانی بگیرد ملك ژاپون را
بەشاخ کرکدن تسکین نیاید خارش کونش(٤)
چه خواهد کرد جمیل پشت و مأبون را(٥)
اگر از هر یکی زان لوطیان یك پاره بستانند(٦)
باندك مدتی جمع آورند صد گنج قارونرا(٧)

---

(١) له دیوانی چاپکراودا (در هجو جمیل)ه...
(٢) درامیزد (ق).
(٣) زخم: (ت)، زخمی دل: (م).
(٤) کرکدن راحت (ق).
(٥) کرد جمیل: (ت)، کرد میل من: (م).

(٦) دووپارە (خ).

(٧) جمع آورد (خ).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: "الا یـــا ایها الســاقی ادر کــاســا و ناولها

که عشق آسان نمود اول ولی افتاد مشکلها"

نشوید گـر در آمیزد بەآب دجلـه جیحون را: ئـەگـەر ئـاوی دیـجلـە تێکەڵ بـەئـاوی ڕووبـاری جەیحوون بکا نـایشواتەوە. ز شهوت دامن آلودەء فیروزه خاتوونرا: لە شاوەتی داوێنی ملەوەسی پیرۆز خاتوون. واتە: پیرۆز خاتوون، هێندەی گانی حەرام داوە، داوێنی هێند بەشاوەتەوە ئالوودە و پیس بووە، ئەگەر هەردوو ڕۆخانەی دیجلە و جەیحوون دەگەڵ یەکەیدا تێکەڵ بکا، لەو پیسی و ملەوەسییەی ناشواتەوە، پاك ناکاتەوە.

توانی یافت چون گردش کنی در کوچەء فرجش: دەتوانی ئەگەر بگەڕێی بەکۆڵانی کوزیدا، عمود سام و رخش رستم و گرز فریدون را: ئەستوندەکی سام و ئەسپی ڕۆستەم و گورزی فەرەیدوون... دیارە، ئەستوندەکی سام و ئەسپی ڕۆستەم و گورزی فەرەیدوون، یەکیان لە درێژی و ئەوی دییان لە تەکان و تیژڕەویی و سێیەمیان لە قورسی و گرانیدا، وێنەیان نەبووە.. ئیدی شاعیرە و بەرز دەفڕێ و دنکە کونجییەك دەکا بـەکێوێ.. جمـاع مفت اگر خواهـی برو در خـانـەء مفتی: ئـەگـەر لـە گـانکردن دەگەڕێی برۆ بۆ ماڵی مفتی.. که آنجا قدر یك جو نیست صد خرمن کس و کون را: کە لەوێ سەد خەرمانی کوز و قوون بەهای دەنکە جۆیەکی نییە. زخم دل دانەء کمتر نماند گر درآندازی: برینی دڵ لە دانەیەك کەمتری نامێنێتەوە گەر هەموو دەریای هــامــوونــی دە کـونـی هــەراوی خـوشکـی ڕۆکـەی. مـیـان هـر دو ران خـواهـرش جنگلستانیست: نێوانی هەردوو ڕانی خوشکی لێڕەوارێکە.. که آنجا خفته بینی صد هزاران خرس و میمون را: کە لەوێدا سەدان هەزار ورچ و مەیموون دەبینی نووستوون. شکاف زیر ناف خانم فیروزەرا: قەڵشی ژێر نێوکی پیرۆز خانم.. که در زیر نگین دارد تمام ربع مسکونرا: کە سەرلەبەری چواریەکەی ڕووی زەوینی دە بن نگینداپە.. نگین: بـەنقێم، قـاشی گوستیلك دەگوترێ. مـەبـەستی نێوکیـەتی.. تـەشبیـهێکی دەگمـەنە... سەچـنـدان سپـاه روس لـوطـی در عـقب دارد: سێ ئـەوەنـدەی سپـای ڕووسی لـۆتـی

بەدواوەیە... مەبەست لە لۆتی: قوون گێن... اگر خواهد بە آسانی بگیرد ملك ژاپۆنرا: گەر بیەوێ بە سانایی مڵکی ژابۆن بگرێ... مەبەستی ئەوەیە: ئەگەر بیەوێ مڵکی ژاپۆن، کە گرتنی زۆر سەختە، بگرێ، هێندەی سپای ڕووسی لۆتی لە دووە و زۆر بەئاسانیی دەگرێ. بەشاخ کرگدن تسکین نیاید خارش کونش: خارشتی قوونی بە شاخی کەرکەدەن ناهێورێ. چە خواهد کرد جمیل پشت و مأبوون را: جەمیل زەهاویی پوشت و قووندەر چیی پێ دەکرێ. مەبەستی ئەوەیە، ئەگەر پیرۆز خانم ئەوە حاڵی بێ، جەمیل چیی دەسەڵاتە، چۆن دەتوانێ ڕێی ئەمەی لێ بگرێ. اگر از هر یکی زان لوتیان يك پارە بستانند: ئەگەر لە هەر یەکێ لەم لۆتییانە فلسێ وەرگرن.. باندك مدتی جمع آورند صد گنج قارون را: بەمەودایەکی کەم سەد گەنجی قاروون خڕ دەکەنەوە.

٧

## کشتی گرفتن شیخ رضا با شیخ ستار*

(پیتی) ئەلف

ستار آنکە هست بە نیر و تهمتنا
ایزد نیافرید چنو أهریمنا
دوش از درم درآمد، غرَّید: کای رضا
(انت الذی تصارعنی؟ قلت، أنا)
خندید قاه قاه کە روباه کی زند(١)
با شیر پنجە، تا تو زنی پنجە با منا
گفتم بەجای خود بنشین این قدر مناز
با گرههای ساعد و با میل گردنا
(هومان) کە پهلوان جهان بود عاقبت
دیدی چەسان ز پایش برانداخت بیژنا(٢)
گر تو بزور بازوی خود بودی من آن
غرندە اژدرم کە ببلعید ارژنا
چون این سخن شنید برآشفت از غضب
گردن فراخ زد بکمر عطف دامنا

دەستش دراز کــرد و گــریــبــان مــن گــرفت
تــا افــگــنــم بــخــاك مــن شیــر ارژنــا
هــر چــنــد سعــی کــرد تــن مــن تــکــان نــخــورد
از جــای خــود تــکــان نــخــورد کــوه آهنا
نـــیـــروی او چـــو نـــیك بمن آشکـــار شد
جستـــم زجـــای چـــون پسر کـــاوە، قـــارنـــا
مـــانـــنـــد پـــور زال گــرفــتــم کــمــرگــهش[٣]
بــرمــودمش ز خــاك چــو یك دانــەء ارزنــا[٤]
اورا ز روی خشم چـــنـــان بـــر زمین زدم
کــز مــردنش هــنــوز دلــم نــیست ایمنــا
آواز جـــرت و پـــرت درونش بـــلـــنـــد شد
از بـــارگـــاه مـــقـــعـــدش افـــتـــاد شیـــونـــا
آهـــی زدل کشیــد چــو نــادم بــەگــاە مــرگ
گــفــتــی: (حــیــاتــه ذهــبت، مــوتــه دنــا)
بــرقــوت و شجــاعت (لامــع) آنــچــان بدل[٥]
اقـــرار کـــرد و گـــفت تـــو مـــردی و مـــن زنـــا

........................................................

(١) چون زند(ت).

(٢) چە گونە اش بسر آورد(ت).

(٣) با پنجەیکی بگرفتم (ش).

(٤) برمودمش (ت).

(٥) چنان (م ، ت).

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەددەس متوی مەخبوون

(مستفعلن مفاعلن مفتعلن فعل)

وەك: ″ گرم قبول کنی بندەء کمین تو گردم

ورم بەتیر زنی ناظر کمان تو باشم″

نیرو: هێز. تهمتن: نێوی پاڵەوانێکی ئەفسانەییی ئێرانە. ایزد: خودا. نیاریدە: دروستی

نەکردووە، نەیڕسکاندووە، نەیگووراندووە. ئەهریمەن: خوای خراپە لە کن زەرتوشتییان. دەڵێ: ستار ئەو کەسەیە، کە لە ڕووی هێز و پاڵەوانیەتییەوە توهمەتەنێکە، خواوەند ئەهریمەنی وەکی ویی دروست نەکرد. دوش: دوێ شەو. در: دەرگا. درامد: پەیدا بوو. غریبد: گوڕاندی. کای رضا: کە ئەی رەزا. أنت الَّذی تصارعنی قلتە أنا: تصارعنی: زۆرانم دەگەڵدا دەگری. واتە: دوێ شەوێ، لە پێش دەرکەم پەیدا بوو، نەڕاندی، گوڕاندی، گوتی ئەی شێخ ڕەزا: ″ ئەتۆ زۆرانم دەگەڵدا دەگرێ؟ گوتم بەڵێ، ئەمن. خندید: پێ کەنی. روباە: ڕێوی. چون زند: چون دەدا. با شیر: دەگەڵ شێردا. دەڵێ: پێ کەنی، گوتی ڕێوی چۆن دەتوانێ پەنجە دەگەڵ مندا بدا؟ بجای خود بنشین: لە جێی خۆت دانیشە. این قدر مناز: ئەوەندە مەنازە. بەگرههای ساعد و با میل گردنا: بەڕەگ و گرێیەکانی پیل و بازووت و بەڕەگی ملتەوە، کە دەڵێی میلن. هومان: نێوی پاڵەوانێکی تووەرانییە، برای پیرانی وەیسە لە سەرکردەکانی لەشکری ئەفراسیابە. لەشەڕدا بەدەستی بیژەنی کوڕی گیو کوژرا.. عاقبت: سەرەنجام. بیژەن: ناوی پاڵەوانێکی کۆنی ئێرانییە، نێوی وی و هەموو پاڵەوانانی باستانیی ئێرانێ، لە شانامەی فیردەوسیدا هاتوون. دیدی: دیتت. چمان: بە چ جۆرێکی. ز پایش: لە پێی. برانداخت: خست. بیژنا: بیژن. گر تو بە بە زور بازوی خود بیژن: ئەگەر تۆ بەهێزی بازووی خۆت بیژەنی. من آن غرندە اژدرم: منیش ئەو ئەژدەرە بە نەڕە و گوڕەم. کە ببلعید بهمنا: بەهمەن هەڵلووشێ، قووتبدا. شنید: بیست. بر آشفت: هەڵ چوو، تووڕە بوو. گردن فراخت: بە لە خۆبایی بوونێکەوە ملی بادا. زد بکمر عطف دامنا: شاقەلی داوێنی بەپشتیدا دا، چاکی لێ هەڵماڵی. دست دراز کرد: دەستی درێژ کرد. گریبان من گرفت: یەخەی گرتم. تا افگند من شیر اوژنا: تا منی شیر ئەوژەن بئێخی، بە عاردمدا دا. هر چند سعی کرد: هەر چەندی کرد و کۆشا. تن من تکان نخورد: لەشی من نەبزووت، تەکانی نەخوارد. از جای خود تکان نخورد کوە آهنا: کێوی ئاسن لە جێی خۆی نەجوولا، هەر گوێشی لێ نەبوو. ئەمن پێم وایە شێخ ڕەزا لە زۆر لە وردە قسەی فارسی، میتافۆرا ئاگا بووە. گردن فراختن، عطف دامن بە کمر زدن و تکان نخوردن و لەم جۆرە بابەتانە سەلیقەی زۆر فارسی خوێندنەوەی دەوێ.. نیك: باش، چاك. جستم ز جای: لێی ڕاپەڕیم. پسر: کوڕ. کاوە. قارن: مانند: وەك. پور زال: کوڕی زاڵ ڕۆستەمی مەبەستە. گرفتم کمرگهش: سێبەندەم گرت. بروبودمش: ربودم: ڕفاندم. (ب)یەکە بۆ تەوکیدە. چو: وەك. دانەء ارزنا: دنکە هەرزن. ز روی خشم: لە تووڕەیییان.

چنان بر زمین زدم: وام بە عاردیدا دا. کز: کە از. مردنش: لە مردنی. دلم نیست ایمنا: دڵنیا نیم. آواز جرت و پرت درونش بلند شد: دەنگی تڕ و تسی لە ترسان بەرز بووەوە. وز بارگاه مقعدش افتاد شیونا: لە بارەگای قوونیەوە بوو بەشین و شەپۆڕ. آهی بدل کشید: ئاهێکی لە تەهی دڵڕا کێشا: چو نادم: وەك پەژیوان. بگاه مرگ. لە سەرەمەرگدا. گفتا: گوتی، حیاتە ذهبت موتە دنا: ژیانی لە دەست دا مەرگی نزیك بووەوە. بر قوت و شجاعت لامع چنان بدل/ اقرار کرد و گفت تو مردی و من زنا: بەهێز و ئازایەتیی لامیعی بەجۆرێك ددان پێدا نا، گوتی تۆ پیاو و من ژنم...

٨

**مدح توفیق بگ میرالای***

(پیتی) ئەلف

شمشیـــر بـــخـــون دشمـــن آلا
سالار سپـــاه و مـــیـــر آلا
تــوفـیـق بگ آنـکـە از تـواضع
پست است وعـلـی بـرتـبـە بـالا
دیــوان قــصائــدش مــرتّــب
شعـر و غـزلش عـالـی و اعـلا(١)
هــر حـرف از او چـو درّ شهـوار
هـر نقطـەء چو کوکبیست والا(٢)
شایـد کـە صحـیـفـەء بـیـانش
سازنـــد بـــە آب زرّ مـــحـــلاّ
استـــاد سخـــن بـــە مـدح والـی
پـرداخـتـە مـدحـهـای بـالا(٣)
در نامە چو نافەء مشك بیزاست
نــوك قــلــمش بــە گــاه امــلا
تــرکــیب وجــود او بـدیـع است
در عــالــم صورت و هــیــولا

گــر طــرد کــنــد و گــر نــوازد
هــرگــز نــکــنــم از او تــولاّ
بــر مسنــد عــزّتم نشانــده
شکــرانــهء مسنــد مُــعــلاّ
افــزایش عــمــر و مــال و جــاهش
خــواهــم ز جــنــاب حــق تــعــالــی
گــر اهــل دلــم بسان تــوفــیــق(٤)
تحصیــل کــنــد (رضا)ی مــولــی

........................................................................

(١) علی (ت).

(٢) لالا (خ).

(٣) والا (خ).

(٤) کو (ت).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەددەس ئەخرەب مەقبووز مەحزووف

(مفعولُ مفاعلن فعولن)

وەك: " عمری است که از پی نگاهی

هر لحظه نشستەام بە راهی"

آلا: ئــاڵ، سوور. سالار: سەردار، سپــاسالار. مــیــرآلا (ع. ت. مــیــرآلای): ئـامـیـر لـیوا، جەنەراڵ. تواضـع: (ع. التواضـع): تەوازوو، تەوازی، کەم هەوایی. پست: نەوی. رتبە (ع. الرتبە): پلە. بـالا: بڵند. دیوان: کتێبێك کە سەرلەبەری شیعری شاعیرێکی بەهەموو بـابەتە شیعرەکان (غەرەز)ەوە و بەهەموو کێش و قـافییە لەبـاوەکانی عەرووزی تێدا گرد کریاوێتەوە. هەر لەبەر ئەمە بەشاعیری ئەم جۆرە بـابەتەیلە یەژن: شاعیری دیوان.. قصائد (ع. القصائد): قەسیدە: بە چامە، پارچە شیعرێك کە بەیتەکانی گش لەسەر یەك کێش بن و قـافیەی دێڕی یەکەمی و سەرلەبەری بەیتەکانی یەك بن و قەسیدەکە لە غەزەل درێژترە و بەدرێژایی چامەکە یەك بـابەتە و پەند و حیکمەت و پەسن و بـابەتی کۆمەڵەکی و ئاینی و غەیری ئەمانەی دەبی تێدا بن و رەچاو کرێن. مرتب (ع. المرتب): رێك، سەرلەبەر، گش. علی و أعلا: بەرز و بـالا. چو در شهوار: وەك دوری شاهـانە، شایستە بە شا. کوکب (ع. الکوکب): ئەستێرە. والا: بڵند، بەرز. شاید:

رەنگە، دەشی، جائیزە، لە وانەیە. صحیفەء بیاش (ع. صحیفة البیان): رووپەڕەی یارای هونەرمەندانە مانادەربڕین. سازند: سازدەکەن. بە آب زر: بەئاوی زێڕ. محلا: جوانکراو. مەبەستی ئەوەیە، کە زیربافت کراوە. استاد سخن: وەستای قسەڕەوانی، دەوودوو پاراو. پەرداختە: مشت وماڵی کردووە، لیکولووسی کردووە، یا پەرژاوەتە سەر ئەو کاری هونەرمەندییە. بالا: بلند. نافەء مشك بیز: ناوکی میسك بیژەوە، واتە: نووکی قەڵەمی لە نامە دا، دە کاتی نووسیندا، میسك پرژینە. بدیع (ع. البدیع): لە شتــی خــواسایــی بــەدەر. صورت (ع. الصورة): وێنــە. هــیــولا (مــعــر. یۆ): بــەمــایــەی سەرەتاییی جیهان، کە هەمیشە لە وێنەدا هەستی پێ دەکرێ و هەر جارێ لە شێوە و شێوازێك و بارێکی جیاوازدا بەدیاردەکەوێ.. طرد (ع. الطَّرد): دەرکردن، قاودان. نوازد: بلاوێنێ، نوازشت بکا، دڵ ڕاگرێ. تولا (ع. تولّی): تەولا بوون. دیارە لە مانای عەرەبییەکەی لاداوە... مسند (ع. المسند): تەکیەگا، پایە. عزت (ع. العزَّة): گەورەیی، واتە لە سەر تەختی گەورەیی دانیشتاندووم. افزایش: زێدە بوون. بەسان: بەو جۆرە، بە ئاوها. تحصیل کند: پەیدای کا.

### ٩

### روز رسیدن متصرِّف کمالی پاشا*

(پیتی) ئەلف

سالــهـــا از سر إخــلاص دعــا مـــی کــردم
کــه خــدایــا گــره از کــار ضعـیــفــان بــگشا
مــتــصرَف بــفــرست، اهــل دلــیــران تــوی
مــتــصرِّف بــهــمــه کــون و مــکــان کـیـف یشا
مـــژدەء آمـــدن آصف ثـــانـــی چـــو رسیــد
شاعــران جــمــلــه فــتــادنــد بــفــکــر انشا
آرایوب بولدی (رضا) تام اولەرق تأریخی
(گلدی کرکوکــه سلامــتلــه کمالی پــاشا)

---

(*) کێش: بەحری رەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: ″ از تو با مصلـــحت خويش نمی پردازم

همچو پروانه كه ميسوزم و در پروازم″

سالها از سر اخلاص دعا می كردم: لە رووی دڵسۆزییەوە چەندین ساڵ بوو دوعام دەكرد. كە خدايا گره از كار ضعيفان بگشا: كە گری لە كاری بێ هێزان وەكە. متصرف بفرست، أهل دليران توی: موتەسەڕیف بنێرە، ئەتۆ ئەهلی دلێرانی. متصرف بەكون و مكان كيف يشا: كە بتوانێ تەسەڕوف لە هەموو كەون و مەكاندا بكا. مژدهء آمدن آصف ثانی چو رسيد: كە موژدەی ئاسەفی دووەم هات. شاعران جمله فتاند بفكر إنشا: شاعیران هەموو كەوتنە بیركردنەوەی ئینشا دانان. آرايوب بولدی (رضا) تام اولەرق تأريخی: (ڕەزا) لە مێژووی تەواوی گەڕا، دیتییەوە. (گلدی كركوكه سلامتله كمالی پاشا): (كەمالی پاشا) بەسەلامەتی هاتە كەركووك. كۆی ژمارەی پیتەكانی ئەم دێرە شیعرەی ناو كەوانەكە، بە حیسابی ئەبجەد دەكاتە مێژووی هاتنە كەركووكی كەمالی پاشا. مانای بەیتەكە: ڕەزا گەڕا، مێژووەكەی بەتەواوی دیتەوە (كەمالی پاشا بەسەلامەتی بۆ كەركووك هات).

### ١٠

### تعزيت نامه برای ذهنی باشا متصرف كربلا به مناسبت صوت برادرش قادر بگ*

(پیتی) ئەلف

لـقـد اصيب حـبـيب الـقـلب وا أسفـا

وصار بـدر سمـاء المجـد مـنـخسفـا

دلـم بسوخت ز نـا وعـدهء مـرگ قـادر بگ

بـرادرت (غـفـرالـلـه ذنـبـه وعـفـا)

چـو ديـد تـازه نـهـالـی كشيـد سر بـفـلك

زمـانـه از بـن و بـيـخش بـرآورد بـه جـفـا

بـەفـضل و رحـمت خـود ايـزدش بـيـامـرزد

كـه اهـل جـود و خـداونـد عـفـو بـود و وفـا

تـو بـی جـهت بـتـصرف نـیـامـدی بـه زمین
بــه کــربــلا کــه خــداونــد زاده شرفــا
چــو یــاد آوری از وقـــعــــهء امـــام حسین
چـگـونـه شمـر لـعـیـنش بـریـد سر ز قـفـا
کــنــی بــهحــال جـوانــان اهــل بـیت نـظـر
(لـهـم حـاسدهـم کـیـف اصبـحـوا هـدفـا)
جـمـاعـتـی نـگری سر بـرهـنـه سینـهزنـان
بمرگ تشنـه چـو بـیـمـار مـحـتـضر بشفـا
وفــات بــاب و بــرادر ز یــادت مـی بـرد(۱)
دران مـــصیـــبت سادات و مـــاتم شرفـــا
هـــزار لـــعـــن بـــه أرواح قـــاتـــل حسین
ولـی چـو شیـعـه مـرو تـا صحـابـه و خـلـفـا
نـه اعـتـمـاد بـرافـراط، نـه بـر تـفـریـط
مـیـانـه جـو کـه هـمین است مذهب عـرفـا
زمـــان عـــمـــر تـــو ممدود بـــاد و درگــذرد
بجاه، دولت و اقبال و عیش و ذوق و صفا
هـمـیشه تـا بـهـوای (رضا)ی حق حـجـاج
گـهـی بـهمـروه تـکـاپـو کـنـنـد، گـه بـهصفـا

---

(۱) برد (م. ت).

(*) کێش: بەحری بەسیت موسەممەن سالم
(مفاعلن فعلن مستفعلن فعلن)
نموونەم دەست نەکەوت

لقد أصیب حبیب القلب وا أسفا وصار بدر سماء المجد منخسفا: مخابن، خۆشەویستی دڵان، تووش بوو، مانگی چاردەی شەوی ئاسمانی سەروەری گیرا. دڵم سووتا. ز ناوعدهء مرگ قادر بگ برادرت: لە ناوەعدەییی مردنی قادر بەگی برات. غفراللّه ذنبه وعفا: خوا لە گوناهی خۆش بی. چو دید تازه نهالی کشید سر به فلك– زمانه از بن

و بیخ بر آورد بە جفا: زەمانە کە دیتی نەونەمامی سەری بەرەو ئاسمان بڵند کردووە، بە جەفا و مەینەتیی لە بن و بێخ دەرهێنا. بفضل ایزدش هتد... بەفەزل و رەحمەتی خوای خۆی، لە گوناهی خۆش بی. کە اهل جود و خداوند و هتد... چونکە خوا خاوەنی کەرەم و لێبوردنە بەوەفایە. تۆ بی جهت متصرف نیامدی بەزمین کربلا: ئەتۆ بی سۆنگە و سەوەو بەموتەسەڕیفی نەهاتوویە خاکی کەربەلا. کە خداوند زادە شرفا: کە خواوەند شەرەف و گەورەییی لەسەر شەرەف و گەورەییی دیی زێدە کردووە، یا وەك سیغەی دوعا، زێدەکا. چو یاد آوری از وقعەء امام حسین.... تا " هدفا" ... بۆ وەی ڕووداوی ئیمام حوسەینت وەبیر بێتەوە کە شمری مەلعوون چۆن سەری لە ملی جیا کردەوە. کنی بحال جانان اهل بیت نظر: چاوی لوتف بە حاڵی لاوانی بنەماڵەی پەیامبەر بفەرمووی. لهم حاسدهم کیف أصبحوا هدفا: چۆن حەسوودان و و ئیرەیی پێ بەرانیان بوون بە نیشانە. جماعتی نگری سر برهنە سینە زنان: چاوت بەگرۆیەك دەکەوی، سەرڕووت، لە خۆ دەدەن، سینە دەکوتن. بمرگ تشنە چو بیمار محتضر بشفا: وەك نەخۆشی لە سەرەمەرگدا تینووی شیفا و چابوونەوە. واتە لە پێناوی وان مل لە کێرد دەسوون، خۆیان فیدا دەکەن. وفات باب و برادر ز یادت می برد: مەرگی باب و برات لە بیر دەباتەوە. در این مصیبت سادات و ماتم شرفا: لەم نەهامەتیی سادات و پایەبڵیندانەدا. واتە: کۆستی سادات و پایە بڵندان هێند گەورەیە مردنی باو و برا لە بیر دەباتەوە. هزار لعن بە ارواح قاتلان حسین: هەزار نفر لە بکوژانی حسێن. ولی چو شیعە مرو تا صحابە و خلفا: بەڵام وەکو شیعە تا یارانی پەیامبەر پێی لێ هەڵمەبڕە و جنێوان مەدە. نە اعتماد بر افراط کن نە بر تفریط: نە پشت بەزۆرڕۆیی و نە پشت بە کەم ڕۆیی ببەستە. میانە جو کە همین است مذهب عرفا: لە مامنێونجی بگەڕێ، هەر ئەمەیە ڕێڕەوی عاریفان، خواناسان. زمان عمر تو ممدود با دو در گذرد.... تا: بصفا.. واتە زەمانی عومری تۆ تا حاجییان، بەشقی ڕەزای هەقەوە گا بەرەو مەروە، گا بەرەو سەفا، تەکان دەن، هەمیشە هەر بە شکۆ و دەوڵەت و دواڕۆژی خۆش و گوزەرانی و کەیفسازی و ڕابواردنەوە، درێژاییی هەبێ و بگوزەرێ.

## ۱۱

## مخمس بر شعر حافظ در مدح حسام الملك*

(پیتی) ئەلف

مـن اگـر روان نسازم بـەپـیـامـبـری صبـارا
بـەحسام مـلك و مـلت کـه تـرحـمـی خـدا را[۱]
ز مـقـربـان خـاقـان کـه شود وسیـلـه مـارا
(بملازمـان سلـطـان کـه رساند این دعـارا[۲]
کـه بـەشکـر پـادشاهـی ز نـظـر مـران گـدارا)
مـن اگـر چـه بـیـنـوایـم تـو وزیـر پـادشاهـی
من اگر چه در حضیضم تو بر اوج مهر و ماهی
ز مـیـان مـا تـفـاوت ز مـه است تـا بـەمـاهـی
(همه شب در این امیدم که نسیم صبحگاهی
بـه پـیـام آشنـائـی بـنـوازد آشنـا را)
مـن اگر بـەحـکـم تـقـدیـر شده روم جـایـگـاهـم
بـەهـوای مـلـك ایـران بـه امـیـد قـرب شاهـم
شده رومـیـان ز هـر سو چـو رقـیـب سد راهـم
(ز رقـیـب دیـو سیـرت بـەخـدای خـود پـنـاهـم
مـگـر آن شهـاب ثـاقب مـددی کـنـد سهـارا)
تـو کـه آفـتـاب صبـحـی قـدحت ز نـور لب ریـز
پـی ذرهـای نـاچـیـز کـرمت وسیـلـه انـگـیـز
سحـر (رضا)ی خـود را بـه دهـن نـوالـەای ریـز
(بەخدا که جرعەای ده، تو بەحافظ سحر خیز
کـه بـوقت صبـحـگـاهـی اثـری بـود دعـا را)

---

(۱) بەجناب صبحی پاشا (ق).

(۲) برساند (دیوان).

(٣) آشنایان (نوسخه).

(*) کێش: بەحری کامیل سالم

(متفاعلن فعولن متفاعلن فعولن)

نموونەم دەست نەکەوت.

من اگر روان نسازم بە پیمبری صبارا: من ئەگەر بە پەیامبەری، بای سەبا نەنێرم. بحسام ملك و ملت کە ترحمی خدا را: بە حوسامی، یا بە شیری ملك و میللەت سا بەشکو بەزەییەکی لە راهی خوا پێمدا بیتەوە. ز مقربان خاقان کە شود وسیلە مارا: کێ لە نزیکانی پادشاوە بۆ ئێمە ببێ بە پێناو. بە ملازمان سلطان برساند این دعارا: بە کەسی لەوانەی کە هەمیشە دەگەڵ سولتاندان، ئەم دوعایە بگەیەنێ. کە بە شکر پادشاهی ز نظر مران گدارا: کە بەسپاسی ئەوەی پادشای، دەگەڵ بێچارە و بێ نەوایاندا بێ رەحمی مەکە. واتە: بۆ ئەوەی کە بێ ئەدەبی نەبێ، هەر وا راستەوخۆ پەیام بە سوڵتان نەگا، پەیام بە نزیکانی سوڵتان بدا، تا بە سوڵتان بڵێن کە بە سپاسی ئەوەی پادشای، گەدا دەر مەکە. ئەم مانایە کە بە سوڵتان بدرێ لە سیاقی قسەدا پەنامە؛ چونکە بێگومان ئەوەی کە نابێ بە سپاسی پادشایی، گەدا لە لوتفی خۆی بێ بەش کا، سوڵتانە.. نەزدیکانی سوڵتان نین. من اگرچە بێنوایم تو وزیری پادشاهی: من ئەگەر چی بێ نەوام، بەڵام تۆ وەزیری پادشای. من اگر چە در حضیضم تو بر اوج مهر و ماهی: من ئەگەر چی، لە زەلکاو و پەستیدام، بەڵام ئەتۆ لەسەر ترۆپکی خۆر و مانگی. ز میان ما تفاوت ز مە است تا بە ماهی: فەرقی نێوانمان لە خۆرەوەیە تا مانگ. همە شب در این أمیدم کە نسیم صبحگاهی: هەموو شەوێ بە هەویای ئەوەوەم کە شنەیەکی بەرەبەیان. بە پیام آشنایی بنوازد آشنارا: بە پەیامی ئاشنایی، ئاشنا بلاوێنی. من اگر بحکم تقدیر شدە روم جایگاهم: من ئەگەر بە تەقدیری خوا وڵاتی رۆمیم بووە بە جێگا. بە هوای ملك ایران بە أمید قرب شاهم: بەخۆشەویستیی موڵکی ئێرانەوە و بە هەویای نزیکی لە شاوە خەون دەبینم. شدە رومیان ز هر سو چو رقیب سد راهم: رۆمیی نەگریس لە هەموو لایەکەوە وەك رەقیبی کۆسپی سەر ریمانی لێ هاتووە. ز رقیب دیو سیرت بەخدای خود پناهم: لە گەری رەقیبی ئاکار وەکوو ئاکاری دێو و درنج خۆم دە پەنای خودا خستووە. مگر آن شهاب ثاقب مددی کند سهارا: مەگەر ئەو ئەستێرە هەموو شت سمە بە فریای سوهاوە بی. سوها "سها" ئەستێرەیەکی نادیار و پەنامە، کە لە ورچی گەورەدایە، لە پاڵ ئەستێرەی عیتاق، لە ئەستێرەی ناوین، لە کچانە و بە بێ ئامێری زەرەبین، بە زەحمەت

دەبیندرێ، یەك لە حەوتەوانەیە. تو آفتاب صبحی قدحت  ز نور لب ریز: تۆ خۆری ڕۆژیی و پیاڵەت لە نوور پڕاوپڕ و سەرڕێژ و لێواولێوە. پی ذرهای ناچیز کرمت وسیله انگیز: بۆ وەدەستهێنانی ریزەگەلی کەم بەها و هیچ و پووچ کەرەم و بەخششت، پێناو و هۆکارە، سحر (رضا)ی خودرا بە دهن نوالەای ریز: دە بوومەلێلدا پارووێك لە زاری ڕەزای خۆت ئێخە، دیارە ″ رەزا ″ بەمانای شێخ ڕەزاش و ڕەزامەندیی خواش دێ. بە خدا کە جرعەای دە تو بە حافظ سحرخیز: تو خودا قومێ بەحافزی دە بوومەلێڵەدا بە خەبەر هاتوو، بەخشش بفەرموو: بەمانای حافزی قورئانیش و پابەندی هەموو ڕەوشتی موسڵمانانیش و حافزی شیرازیش دێ. واتە: وەکو حافز کە شاعیریشە و سۆفیشە و لە خواترسیشە.. کە بە وقت صبگاهی أثری بود دعارا: بۆ وەی دوعا لە بەرەبەیاندا کە کاریگەرە، کاریگەر بێ.

## ١٢

## در مدح احمد پاشای بەبە*

(پیتی) ئەلف

آصف جـــم صفت و داور اقـــلـــیـــم گشا
صاحب سیـف و قـلـم حـضرت احـمـد پـاشا
در گـــروه وکـــلا عـــارف و دانـــاتـــر ازو
هست، گـفـتـم بـه خـرد، گـفت نـه کلا، حـاشا
دهـر در طـاعت او (یـعـرفـه کـیـف یـریـد)
چـرخ در قـبـضـهء او (یـقـلـبـه کـیـف یشا)

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)
وەك: ″گر مـرا خار زند آن گـل خندان بکشم
ور لبش جور کند از بن دندان بکشم″

آصف جم صفت و داور اقلیم گشا: ئاسەفی خەسیەت جەم و داوەری ئیقلیم گر: پێشتر باسی ئاسەف و جەم کراوە. صاحب سیف و قلم حضرت أحمد پاشا: خاوەنی شیر و خامە، حەزرەتی ئەحمەد پاشا. در گروه وکلا، عارف و داناتر ازو: لە نیو گرۆی وەزیر

و هەمەکاراندا زاناتر لە وی. هست گفتم، بە خرد؟ گفت نە کلا حاشا: ئەگەر بە ئەقڵ هەس؟ گوتی، نەخێر، حاشا. دهر طاعت او (یصرفە کیف یرید): زەمانە گوێ بەفەرمانی وییە، چۆنی بوێ، وای دەگێڕێ.

## ١٣

## عجم*

(پیتی) ئەلف

شکست سر أفسر کسرای عـــجـــم را
بـربـاد فـنـا بـاد رگ و ریشهء جـم را
آورد شبـیـخـون مـدیـنـه بمدایـن
بگرفت ز شاهان عجم تاج و علم را
این عربده با آل عمر بهر علی نیست
بـا آل عـمـر کـیـنـه قـدیـم است عـجـم را

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)
وەك: ″ اندوه توشد وارد کاشانەام امشب
مهمان عزیز آمده در خانەام امشب″

بشکست سر افسر کسرای عجم را: شکا سەری سەر وەك تانجی کیسرای عەجەم. بر باد فنا داد رگ و ریشهء جم را: رەگ و ریشەی جەمی وەبەر بای نەمان دا. آورد شبیخون مدینه بمدائن: مەدینە شەو بە سەر مەدائینیدا دا. برفت ز شاهان عجم تاج و علم را: تانج و ئالای لە دەست شاهانی عەجەم دەرینا. این عربده با آل عمر بهر علی نیست: ئەم هەموو هەڵەپاسی و وەڕینەیە بە عومەر لەسەر عەلی نییە. با آل عمر کینه قدیمست عجم را: رك و کینەتۆزی دەگەڵ بنەماڵەی عومەردا کۆنە و رەگ و ریشەی دووری هەیە. قسە قسە دێنێ، گرۆی ئەهلی حەق لایان وایە بابانەکان بە رەچەڵەك دەچنەوە سەر باوەکانی کاکەیی و خزمایەتییەکەشیان لەوەڕدا هاتووە، گۆیا یەکێ لە باوەکانیان کیژی حەسەن بەگ ناوێکی هێناوە. حیکایەتەکەی لە تەزکەرەی ئەعلادا بە دوور و درێژی هاتووە.

١٤

## در مدح شاه نقشبند*

(پیتی) ئەلف

قـبـلـەء حـاجت بـود روی بـهـاءالـدیـن مـا
طـاق مـحـرابست ابـروی بـهـاءالـدیـن مـا
تـکـیـەء روحـانـیـان است آستـان حـضرتش
مـنـزل جـانـان بـود کـوی بـهـاءالـدیـن مـا
بـوی بـوبـکـرست، بـویش درمشام سالـکـان
خـوی پـیـغـمـبـر بـود خـوی بـهـاءالـدین مـا
هــــر کسی آرام بـــایــد از پــریشانـــی غــم
در قــرار تـــاب گــیسوی بـــهـــاءالــدیــن مـــا
پــنــجــەء گستــاخ دست مـنـکـران را بشکـنـد
قـــوەء اقـــرار بـــازوی بـــهـــاءالـــدیـــن مـــا
جستـجـو کـردم بـحـمـدالـلـه در بـحـر (رضا)
یــافـتـم لـؤلـؤ ز نـو بـوی بـهـاءالـدین مـا

---

(*) کێش: بەحری رەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″

قبلەء حاجت بود روی بهاءالدین ما: رووی بەهائوددینی ئێمە رووگەی پێویستی جێبەجێکردنی مرادانە. طاق محر ابست ابروی بهاءالدین ما: برۆی بەهائوددینی مە تاقی میحرابە. تکیە روحانیان است آستان حضرتش: سەردەرانەی وی تەکیەی سۆفییانە. منزل جانان بود کوی بهاءالدین ما: کۆی بەهائوددینی ئێمە مەنزلی یـارانـە. بـوی بـوبـکـرست، بـویش در مشام سالـکـان: بـۆنـی مـبـارەکـی لـە کـەپـووی دەروێشان بۆنی حەزرەتی ئەبو بەکرە. خوی پێغەمبەر بود خوی بهاءالدین ما: خووی بـەهـائـوددیـنـی ئـێـمـە خووی پێغـەمبـەرە. واتـە: ئـاکـار و رەوشتـی ئـاکـار و رەوشتـی

پیغەمبەرە. هر کسی آرام باید از پریشانی غم: هەموو کەسی لە پەژارە و پەرێشانی، با ئارام و سەراسوودە بی. لە کوی؟ در قرار تاب گیسوی بهاءالدین ما: لە هێورگای تاو و پێچی زلفی بەهائودینی ئێمەدا. پنچەء گستاخ دست منکران را بشکند: پەنجەی بی پەرواییی دەستی ئەوانەی ددان بەئیسلام و پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەردا نانێن. قوەء اقرار بازوی بهاءالین ما: هێزی مل پێ کەچکردنی بازووی بەهائودینی ئێمە دەیشکێنی، بە چی ؟. جستجو کردم بحمداللّە در بحر (رضا): سپاس بۆ خوا لە دەریای (رەزا)دا هەڵپە و ئەمسەروئەوسەرم زۆر کرد. یافتم لؤلؤ ز نو بوی بهاءالدین ما: ئاخرییەکەی مواریی بۆنی بەهائوددینم لە نوێوە، دیتەوە.

## ١٥

### در مدح محمد بگ قائممقام رانیه*

(پیتی)ئەلف

شعار خویش مکن شیوەء هلاکورا
بجان من مرنجان رئیس آکورا
مخور فریب بحرف دروغ مدعیان
ز بنده بشنو، مشنو حدیث بدگورا
گرفتم آنکە بجرم عظیم متهم است
بە ذیل عفو بپوشان جرائم اورا
بشکر آنکە خدا جاه و نعمتت داد است
علی الخصوص بتی نازنین دلجورا
بتی کە در وصفش آورم بە استشهاد
دو مصرع از غزل سعدی سخن گورا
(حصار قلعەء یاغی بە منجنیق مگیر
ببام قصر افگن کمند گیسورا)

---

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصلەم
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)

وەك: ″ منم كە شهرەی شهرم بـە عشق ورزیدن

منم كە دیـدە نیـالودەام بە بد دیدن″

شعار خویش مكن شیوەء هلاكورا: ئـاكار و رەفتـاری خۆت وەكو ئـاكار و رەفتـاری هـەلاكۆ مەكە. بجـان من كە مرنجـان رئیس آكورا: تۆ گیـانی من دڵی سـەرۆكی ئـاكۆیـان مـەڕەنجێنە. مخور فریب بحرف دروغ مدعیان: فریو بـەقسەی درۆی ئیدیعاكـەران مـەخۆ. ز بندە بشنو، مشنو حدیث بدگورا: قسەی راست لـەمن ببیە، قسەی بـەدگۆ مـەژنەوە، مەبیە. گرفتم آنكە بجرم عظیم متهم است: وای دابنێ كە تـاوانی گەورەی وە پـاڵ دراوە. بە ذیل عفو بپوشان جرائم اورا: بـەداوێنی بـەخشین تـاوانی وی داپۆشە. بشكرا او كە خدا جاە نعمتت داد است: لە سپـاسی ئـەوەی كە نیعمـەتی دایتێ. علی الخصوص بتی نـازنین دلجورا: نـەمـازا، ئـەو جوانـەی كە وەك بت وایە. بتی كە در وصفش آورم بـاستشهـاد: ئـەو بتـەی كە لـە وەسفیدا بـەشاهیدی دێنمەوە. چی بـەشاهید دێنمـەوە؟ دو مصرع از غزل سعدی سخن گورا: دوو لاشیپـانـە لـە غـەزەلی سـەعدیی قسە پـاراو. ″ حصـار قلعەء یـاغی بـەمنجنیق مگیر – بـام قصر بر افگن كمند گیسورا″: شوورەی قـەڵا بـەر مـەنجەنیق مـەدە، كەمـەندی زلف بۆ سەربـانی تـالار هـەڵدە. یـاغی: زاڵـم، وا بـەدیـار دەكـەوێ ″یـاغـی″ كـە وشـەیـەكـی تـوركـیـیـە، بـەمـانـای نـابـەفـەرمـان و سـەركێش دێ، بـەڵام بـە بـاغیش نووسراوە.

مـەولـەوی دەفـەرمـوێ:

زانكــە انسان در غنی یـاغی شود

همچو سیل خواب من یـاغی شود

منجنیق: بـەقۆچـەقـانیی گـەورە دەگوترێ كە بـە سـەر دارێكی مـەحكەمـەوەی دەبـەستن و بـەردی زەلامـی تێ دەخـەن و بـەدیواری قـەڵایدا دەدەن، قـەڵای پێ دەشكێنن. مـانـای بـەیتـەكە: بۆ گـەمـارۆدانی دژمن پێویستت بـە مـەنجـەنیق نییـە، چون ئـەگـەر كـەمـەندی زلف بۆ كۆنگرەی سەربـانی كۆشك هـەڵدەی، بـە سـانـایی بـە سـەر دەكـەوی و دەیگری.

١٦

**برای أمین فیضی***

(پیتی) ئەلف

ز اربــــاب دانش امــیـــن فــیــضــی را
امـــتــــیــــازیست کـــز فـــن ضـیــــارا
نشانـــهـــاست بـــر اتـــحـــاد مـــن و تـــو
ز یك مـــایـــه گـــویـــی سرشتـــنـــد مـــا را
زیـــاد و کـــم از نـــام نـــامـــیت نـــبـــود
بـــرسم جُـــمَّـــل گـــر شمـــاری رضـــا را(١)

.............................................................

(١) جُمَّل دەخوێندرێتەوە، کە ئەسڵەکەی (جمّل)ە...

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەخبوون

(مفاعلن مفاعلن مفاعلن)

وەك: ″ فغان ازین جهان و ابتدای او

که ماندەام عجیب در بلای او″

ز ارباب دانش امین فیضی را – امتیازیست کز فن ضیارا – نشانهاست بر اتحاد من و تو: چەند نیشانەیەك کە شایەتیی یەکایەتیی من و تو دەدەن، سەربارێکە بۆ ئەمین فەیزیی خاوەن زانست، کە لە نیشانەیەك هونەری رووناکییەوەی بۆ ماوەتەوە. ز یك مایه گویی سرشتند مارا: هەر دەڵێی لە یەك مایەیان گوو‌راندووین. زیاد و کم از نام نامیت نبود: هیچ کەم و کورتییەك لە نێوی نامی و بەناووبانگتدا نییە. برسم جمل گر شماری (رضا) را: ئەگەر بە حسابی ئەبجەدی (جمل) بۆ (رەزا) بژمێری.

١٧

**در مدح بگ زادەء جاف***

(پیتی) ئەلف

حق شناسم ندهم کف دامن اوصاف را(١)
آل بـــرمك یـــافـــتـــم بـــگـــزادەهـــای جـــاف را

خواستم در مدح ایشان قطعه‌ای انشا کنم
خامه گفتا کی توانم شرح این اوصاف را
گر قیاس جودشان با (حاتم طائی) کنی
فـرق بس بـاشد زلـیـخـا تـا بـکوه قـاف را

............................................................

(١) أزكف دامن أوصافرا (ت).

(*) کێش: بەحری رەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: "آن که نقشی دیگری جایی مصوّر می شود
نقش او در چشم ما هر روز خوشتر میشود"

حق شناسم ندهم از کف دامن اوصاف را – آل برمك یافتم بگزاده‌های جاف را: ئەوەی حەق ناسە، ئەوە قوبووڵ ناکا لە داوێنی مەدحت کورت کەمەوە. بەگزادەکانی جافم وەك بەرەی بەرمەکییان دیت. خواستم در مدح ایشان قطعه‌ی ای انشا کنم: ویستم لە پەسنیاندا پارچە شیعرێك دانێم. خامه گفتا کی توانم شرح این أوصاف را: قەڵەم گوتی کەی دەتوانم شەرحی ئەم وەسفانە بکەم. گر قیاس جودشان با (حاتم طائی) کنی: ئەگەر سەخاوەتیان دەگەڵ سەخاوەتی حاتەمی تائیدا بەراوردکەی. فەرق ئێکجار زۆرە، (زلیخا) لە کوێ و کیوێ قاف لە کوێ؟ ئەو لە یەمەن و کێوی قاف لە بنی دنیایێ.

١٨

**مخمسی دیگر بر شعر حافظ**

**در مدح صبحی پاشای وزیر***

(پیتی) ئەلف

مـن اگـر روان نسازم بـه پـیـامـبـری صبـارا
بـه‌جـنـاب صبحـی پـاشا کـه تـرحمـی خدا را
ز مـقـربـان خـاقـان کـه شود وسیـلـه مـارا
(بـمـلازمـان سلطـان کـه رساند ایـن دعـارا[١]

کـه بـەشکـر پـادشاهــی ز نـظـر مـران گدا را)
پـدر تـو سامـی پـاشا کـه بـه پـاکیش گـواهـم
نظری به سوی من داشت تو نمی کنی نگاهم
سخـن رقـیب بـدمست مشنـو کـه خـیـره خـواهـم
(ز رقــیب دیــو سیـرت بــخـدای خـود پـنــاهـم
مـگـر آن شهــاب ثــاقب مـددی کـنـد خـدارا)
پــدرت هــمــیشه بــرمــن ز کــرم دری گشودی
چـه کـریـم بـود إلـهـی مـارا هـمـی سـتـودی
پـدر آشنــای خــودرا تــو ز لــوح دل ربــودی
(چه قیامت است جانا که به عاشقان نمودی
رخ هـمـچـو مـاه تـابـان دل هـمـچـو سنگ خـارا)
مـن اگـر چـه خـاکسام تـو قـریـن مـهر و مـاهـی
مــن اگـر چــه بــیـنـوایـم تـو وزیـر پـادشاهـی
زمــیــان مــا تــفــاوت زمــهــر تــا بــه مــاهــی
(همـه شب دراین امیدم کـه نسیم صبحگاهی
بـــه پـــیـــام آشنـــائـــی بـــنـــوازد آشنارا)
تـو کـه آفـتـاب صبـحـی قـدحت زنـور لب ریـز
پـی ذرهـای نـاچـیـز کـرمت وسیـلـه انـگـیـز
سحری (رضا)ی خودرا به دهن نوالەای ریز
(بـخـدا کـه جـرعـەای ده تـو بـحـافـظ سحـرخیز
کـه بـوقت صبـحـگـاهـی أثـری بـود دعـارا)

---

(١) (برساند) (م . ت).

(*) کێش: بەحری کامیل

(متفاعلن فعولن متفاعلن فعولن)

نموونەم دەست نەکەوت.

من اگر روان نسازم به پیامبری صبارا: من ئەگەر بای سەبا وەك پەیك و پێناو

نەنێرم. بەجناب صبحی پاشا کە ترحمی خدرارا: بۆ خزمەت سوبحی پاشا، کە بۆ خوا بەزەیەکی پێمدا بێتەوە. لە هاودەم و نزیکانی خاقان کی دەبێ بە پێناومان. ئەم دوعایە لە جەنابی سوڵتان بگەیەنێ. خاقان نازناوی پادشای مەنگۆلە. دوعایەکە کێهەیە؟ لە شوکرانەی ئەوەدا کە پادشای، گەدا لە بەر دەرکەی رەحمەتت دەر مەکە. پدر تو سامی پاشا کە بە پاکیش گواهم: سامی پاشای باوت کە شایەتیی پاکیی بۆ دەدەم. نظری بسوی من داشت تو نمی کنی نگاهم: ئەو چاوێکی پێمەوە بوو، لوتفێکی دەگەڵم هەبوو، ئەتۆ چاوێکت لێم نییە، ئاوڕێکم لێ نادەیەوە. سخن رقیب بدمست مشنو کە خیر خواهم: قسەی رەقیب، نەیاری بەدمەست (ئەو ئارەق خۆرانەی کە ئارەق دەخۆنەوە و ئاکاریان وەك ئاکاری دڕندەی لێ دێ) مەبیە، ئەمن خێرخوازم. ز رقیب دیو سیرت بخدای خود پناهم: لە تاو نەیاری رەوشت دێو و درنجانە پەنا بۆ خوای خۆم دەبەم مگر آن شهاب ثاقب مددی کند سهارا: دەنا مەگەر ئەو ئەستیرە سمبەیە بەفریای سوها کەوی (سوها یەکێ لە حەوتەوانەیە لە پێشترێ شەرح کراوە). مەبەست لە سوها زۆر دوورییەتی. پدرت همیشه برمن ز کرم دری گشودە: بابت دەرکەیەکی زێڕ و زیوی بە رووی مندا هەمیشە کردبووەوە. چە کریم بود الهی مارا همی ستودی: خودایە چەند دڵاوا بوو، هەمیشە ستایشتی دەکردم، دەیلاواندم. پدر آشنای خودرا تو ز لوح دل ربودی: ئاشنای باوی خۆت لە دڵ ڕاڕفاند. چە قیامەت است جانا کە بە عاشقان نمودی: چ قیامەتێکە گیانە، کە دەرهەق بە ئاشقانت نواند. رخ همچو ماه تابان دل همچو سنگ خارا: روخسار وەك مانگی تابان، بە تیشك و شەوق دڵ وەك بەردی خارا. بەردی خارا زۆر رەقە.. من اگر چە خاکسارم تو قرین مهر و ماهی: من ئەگەرچی هەش بەسەرم، بەڵام تۆ بەرابەری خۆر و مانگی، هاوتای ویی. من اگر چە بینوایم تو وزیر پادشاهی: من ئەگەر چی بێ نەوام، بەڵام تۆ وەزیری پادشای. ز میان ما تفاوت ز مە است تا بە ماهی: فەرقی نێوانمان، وەك فەرقی مانگ و ڕۆژ وایە. همە شب در این أمیدم کە نسیم صبحگاهی: هەمیشە بە ئاواتی ئەوەوەم کە شنەیەکی بەرەبەیان. بە پیام آشنائی بنوازد آشنارا: بەپەیامی، بە خەبەری ئاشنایی، ئاشنا بەسەر بکاتەوە. تو کە آفتاب صبحی قدحت ز نور لب ریز: تۆ کە خۆری بەیانی پیاڵەت لە رووناکی پڕ و سەرڕێژە. پی ذرهای ناچیز کرمت وسیلە انگیز: کەرەمی تۆ هۆکاری بەدوای زێڕ و زیوی هیچو پووچدا گەڕانە. واتە کەرەمی وی، نرخ و بەهای بە زێڕ و زیو بەخشیوە، دەنا زێڕ و زیو شتێکی هێندە بەنرخ نییە..

سحری (رضا)ی خودرا بە دهن نوالە ای ریز: لە بەرەبەیانیکدا پاروویەك لە زاری (رەزا)ی خۆ باوی... بە خدا کە جرعەای دە تو بە (حافظ) سحر خیز: تو خوا مژێك مەی بە حافزی لە بەرەبەیاندا بۆ دوعاکردن هەڵستاو بدە. کە بەوقت صبحگاهی أثری بود دعارا: بۆ وەی لە کاتی بەرەبەیاندا کە دوعا کارییە، کاری بکا.

## ١٩

## در وقتی که والی موصل برای تفتیش بکرکوك می آید*

### (پیتی) بی

خواب دیدم دوش کز مغرب بر آمد آفتاب
چیست گفتم بامدادان ای عجب تعبیر خواب
ناگهان از سمت موصل عازم کرکوك شد
آفتاب عالم آرا والی عالی جناب
چون شنیدم این خبر از بهر تبریك قدوم
ره نورد پارا پا نهادم در رکاب
تیز رفتاری چو عزم عالم بالا کند
ره بەمنزل می برد پیش از دعای مستجاب
برق کرداری چو از بالا جهد سوی نشیب
بهر صیدی از هوا گوئی فرود آمد عقاب
یك دو فرسخ ره بە استقبال بیرون تاختم
خیمەها دیدم ز هر جانب طناب اندر طناب
دشت گفتی قلزم است و جستخیز خلق موج
درمیان موج مردم خیمها همچون حباب
باز بگرفتم عنان تا موکب والی رسید
در زمان کردم بسوی موکب والا شتاب
خویش را ز خانەء زین بر زمین انداختم
جبهەء تعظیم را صد جا نهادم بر تراب

آصف خـاکـی نـهـادم چـون فـراز خـاك دیـد
کـرد در ساعت سرافـرازم بـه تـوجـیـه خـطـاب
آمـد از روی تـواضـع بـا مـن انـدر گـفت و گـو
گرم گرم از وی سؤال و، نرم نرم از من جواب
تا شدم یك بارهگی سرمست صهبای حضور
عـندلیب آسا دریـدم پـردهء شرم و حـجـاب
کـردم آغـاز ثـنـاخـوانـی بـه آواز بـلـنـد
وز جـمـال شاهـد مـعـنـی بـرافـکـندم نـقـاب
خـیـر مـقـدم مـرحـبـا أی خسرو مـالك رقـاب
مـلك و مـلّـت شد بـتشریـف قـدومت فـیـضیـاب
هـم ز شادیّ قـدوم تست آخـر ایـن هـمـه
خـنـدهء بـرق و صدای رعـد و شابـاش سحـاب
بـر زبـانش گـر بـرانـد نـام عـزمت نـاخـدا
مـیـرود بـی امـتـنـان بـادبـان کشتـی بـر آب
کـار عـاقـل نـیست رفـتـن بـر خـلاف رای تـو
خـویش را رسوا کـنـد دیـوانـهء جِـنَّـت مآب
در ولایت بـعـد ازیـن حـادث نـگـردد فـتـنـهای
تـا تـو بـاشی و فـهـیـم پـاشا تـرا نـائب مـنـاب
بعد ازین از این دوعقرب نَبْودم اندیشهای(۱)
چـون بـدیـدم اقـتـران مـاهـرا بـر آفتاب
اقـتـران ایـن دو نـیِّـر مـایـهء آسایـش است
مـن چـنـیـن فـالی زدم (والله اعلم بالصواب)
از خدا خواهم که دارد در جهان این هر دورا
بـرقـرار و پـایـهدار و کـامـکـار و کـامـیـاب

(۱) بعدا زبن درعقرب بنودم اندیسهء.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: "هر زمان زین سبز گلشن رخت می برم
عالمی از عالم فکرت بە کف می آورم"

خواب دیدم دوش: دوێ شەو خەونم دیت. کز مغرب بر آمد آفتاب: کە لە ڕۆژاوەوە خۆر هەڵات. چیست گفتم بامدادان: بۆ سبەینێ چییە گوتم. ای عجب تعبیر خواب: داخۆ لێکدانەوەی ئەو خەونە چەند سەیربێ. ناگهان از سمت موصل عازم کەرکووك شد: لە ناکاو لە موسڵەوە بەرەو کەرکووك چوو. کێ؟ آفتاب عالم آرا والی عالی جناب: والیی بارەگا بڵندی وەکو خۆری جیهان رازێنەوە. چون شنیدم این خبر از بهر تبریك قدوم: هەرکە ئەم هەواڵەم بیستەوە، بۆ پیرۆزباییی تەشریف هێنان. رە نورد یارا پارا پارا پا نهادم در رکاب: ڕێی پارە پارەم وەبەرگرت و پێم لە ئاوزەنگی توند کرد. پارە پارە لای کفرییە. تیز رفتاری چو عزم عالم بالا کند: وەك تیژڕۆیەك کە بەرەو جیهانی سەروو هەڵکشێ: رە بە منزل می برد پیش از دعای مستجاب: کە پێش دوعا قوبووڵ بوون، ڕێ دەباتە مەنزڵ. هەرکەسێ عەزمی قایم بێ و بە دڵ نیازی بە مەبەست گەیشتن بێ، پێش ئەوەی دوعای قوبووڵ بێ، زووتر دەگاتە جێی مەبەست. برق کرداری چو از بالا جهد سوی نشیب: وەك بروسکەیەك کە لە سەررا بەرەو نشێو داکشێ. بهر صیدی از هوا گوئی فرود آمد عقاب: وەك هەڵۆ وایە کە بۆ نەخچیرێك لە ئاسمانەوە نشێو بێتەوە. یك دو فرسخ رە باستقبال بیرون تاختم: بۆ پێشوازکردن یەك دوو فەرسەنگە ڕێیەکم تاودا. خیمها دیدم ز هر جانب طناب اندر طناب: چیم دی، چەندین خێوەتم لە هەموو لایەکەوە دیت. دشتی گفتی قلزم است و جستخیز و خلق موج: دەتگوت دەشتێکی دەریای قەزوێن بزوێنە و جمجووڵی شەپۆلی حەشامات. در میان موج مردم خیمها همچون حُباب: خێوەتەکان لەنێو شەپۆلی خەڵکەکەدا وەك بڵقی سەرئاوابوون، تەشبیهێکی دەگمەنە.. باز بگرفتم عنان تا موکب والی رسید: دیسان جڵەوی ئەسپەکەم گرتەوە، تا والی گەیشت. در زمان کردم بسوی موکب والا شتاب: دەمودەست، بەرەو کۆڕەوی بە شکۆ و بڵند تاوم دا. خویش را از خانەء زین انداختم: خۆم لەسەر خانەی زینی ئەسپەکەم هەڵداشتە خوار. جبهەء تعظیم را صد جا نهادم بر تراب: هەنیەی ڕێزلێنان و گەورەکردنم لە سەد جێ وەسەر خاك ئێخست. آصف خاکی نهادم چون فراز خاك دید: والیی سیفەت خاکیی وەك سیفەتی ئاسەفی بەرخیای، کە لە سەر ئەرز

لە مەبەستم گەیشت. کرد در ساعت سر افرازم بە توجیە خطاب: دەمودەست بە قسە دەگەڵ کردنمدا سەربڵندی کردم. آمد از روی تواضع با من اندر گفتوگۆ: لە ڕووی بێ هەواییەوە دەگەڵمدا وە وتوویژ کەوت. گرم گرم از وی سؤال و نرم نرم از من جواب: گەرم گەرم لەوەوە هەواڵپرسین و نەرم نەرم لە منەوە وەڵامدانەوە. تا شدم یك بارگی سرمست صهبای حضور: تا بە جاریێ سەرمەستی شەرابی بە خزمەت گەیشتن بووم. عندلیب آسا دریدم پردەء شرم و حجاب: وەك بلبل پەردەی شەرم و حیجابم دڕی. کردم آواز ثناخوانی بە آواز بلند: بەدەنگی بەرز دەستم بە پەسندان و پێداهەڵگوتن کرد. وز جمال شاهد معنی بر افگندم نقاب: سەرپۆشم لە ڕووی جوانیی مەعنا هەڵمالی. خیر مقدم، مرحبا ای خسرو مالك و رقاب: گوتم: بە خێرهاتی، پێ و قەدەمت بە خێر، مەرحەبا، سەرچاو هاتی، ئەی پادشای خاوەن سەر و ماڵی هەمووان. ملك و ملت شد بە تشریف قدومت فیضیاب: وڵات و خەڵکی وڵات بە تەشریف هێنانت سەرلەبەر فەیزیاب بوون، لە هەموو خواست و داواکارییەك سەرشار بوون. سێڵاوی بەرەکەتت هەموو دنیای تەژی کرد. هم ز شادی قدوم تست آخر این همە: هەروەها لە خۆشی و شادمانی تۆوەیە ئەم هەمووە. خندەء برق صدای رعد و شاباش سحاب: کەنینی بروسکە و ناڵەی هەورەتریشقە و شاباشی هەور. بر زبان گر می براند نام عزمت ناخدا: ئەگەر کەشتییەوان نێوی عەزیمەتت، بڕێ، میرود بی امتنان بادبان کشتی برآب: کەشتیی بێ منەتی بایەوان بە سەر ئاودا دەڕوا. کار عاقل نیست رفتن بر خلاف رای تو: سەرپێچی لە ڕای تۆ کاری پیاوی ئاقڵ نییە. خویشرا رسوا کند دیوانەء جِنَّت مآب: شێتی جندۆکە مەئاب، شێتی جندۆکە خانەی خۆی ڕیسوا دەکا، شێتی، جندۆکان گەرایان تێدا هەڵاوردبێ.. در ولایت بعد ازین حادث نگردد فتنەای: لەمەوپاش، لە ویلایەتدا ئاژاوەیەك ڕوو نادا. تا تو باشی و فهیم پاشا ترا نائب مناب: تا تۆ هەبی و فەهیم پاشا جێگری تۆ بێ. بعد ازین از این دو عقرب نَبْودم اندیشەای: ئیدی پاش ئەمە هیچ پەژارەیەکم لەم دوو دووپشکە نامێنێ. چون بدیدم اقتران ماه را بر آفتاب: کە وەختێ جووتبوونی مانگم لەگەڵ ڕۆژدا دیت "دوو مانای هەیە... والی و فەهیم پاشا دوو ئەستێرە یا دوو کولاژدمن بۆ پەسنیش و بۆ فریش دەست دەدا. اقتران این دو نیِّر مایەء آسایش است: بەیەك گەیشتنی، جووتبوونی ئەم دوو ئەستێرەیە، والی و فەهیم پاشا، مایەی ئاسایشن. من چنین فالی زدم واللّه أعلم بالصَّواب. ئەمن ئەوها فاڵێکم گرتەوە، ئەوجا خوا بۆ خۆی ڕاستییەکەی دەزانێ ئەوەش هەر بۆ دوو ئەگەران دەست

دەدا. از خدا خواهم که دارد در جهان این هر دورا: لە خوام دەوێ ئەم هەردووە لە جیهاندا. بەرقەرار و پایەدار و بەمرادی خۆ گەییو و بە کامی خۆ ڕەسیو کا.

## ٢٠

## مسیح*

(پیتی) بێ

مسیـح بـر فـلك و شاه انـبـیـاه بـەتـراب
دلم ز آتش این غصَّە بسیکە بود کباب(١)
سؤال کـردم ازیـن مــاجـرا ز پـیـر خـرد
چو غنچە لب بر تبسُّم برگشود داد جواب
کـە قـدر هـر دو بـەمـیـزان قـدر سنـجیدند
کە چون گرانتر ازو بود در همەء ابواب
نشست کـفَّـەء مـیـزان مـصطـفـی بـەزمین
بەآسمـــان چـــارم مسیـــح شد بـــەشتـــاب

---

(١) دلم زآتش ان غصە بسکە بود کباب (ت).

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون مەحزووف

(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)

وەك:" بە حسن و خلق و وفا کس بە یار ما نر

ترا در ایـن سـخن انکار کار ما نرسـد"

مسیح بر فلك و شاه انبیا بەتراب: حەزرەتی مەسیح لە حەلحەلەی ئاسمان و شای پێغەمبەران لە زەوین. دلم ز آتش این غصَّە بسیکە بود کباب: دڵم لە ئاوی ئەم خەمە بە جارێ بوو بەکەباب. سؤال کردم این ماجرا ز پیر خرد: ئەم ڕووداوەم لە پیری ئەقڵ پرسی. چو غنچە لب بەسخن بر گشود داد جواب: وەك خونچە لێوی بە قسە کردەوە و وەرامـی دایـەوە. کـە قـدر هـر دو بـەمـیزان قدر سنـجیدند: کە قـەدری هـەرتکیـان بـە تەرازووی قەدر و ڕێز هەڵسەنگاند. کە چون گرانتر از و بود در همە ابواب. لەبەر وەی ئـەو لـە بـابـەتـەکـاندا لـەو گرانتـر بـوو. نشست کفـەء میـزان مصطفـی بـەزمین: تـای

تەرازووی حەزرەتی مستەفا نیشتە زەوین. بە آسمان مسیح شد بشتاب: حەزرەتی مەسیح یەکسەر چوو بۆ ئاسمانی چوارەم.

## ٢١

## در مدح أحمد ناظم بگ متصرف بغداد*

### (پیتی) تێ

گنبدی هست که نامش کفل سیمین است
اندرونش همه با آب طلا رنگین است(١)
عشق با ساده رخان از پی سمت است و سرین
نه رخ و زلف خم اندر خم و چین در چین است
آن دروغست که من شیفتهء خال و خطم
شیخ را هم غرض از ساده پرستی این است
ایها الناس چو من رخت به میخانه بکشید(٢)
نه بەمسجد که درو زاهدك بی دین است
خود دو صد عیب نهان دارد و اغماض کند
داستانش همه از عیب من مسکین است
میتوانم که کشم کینه ز دشمن لیکن
ای عزیزان چەکنم سینهء من بی کین است
چه غم آرد ز نظر اهل ریا زشت آید
خلقت من که بەچشم همه کس شیرین است
مایەام گوهر نظم است خریدارش نیست
سالها شد که ز خرجی تهیم خرجین است
عارم آید که نویسم به کسی شرح نیاز
جز به (ناظم) که ولی النعم دیرین است
حبذا قبلهء ارباب هنر (ناظم بگ)
متصرف به شرف چون فلك پروین است

عزم او یافت مگر یاد، ز آن چالاك است
حزم او دیده مگر کوه ازان تمکین است
خامەاش گر چه عبارت ز یکی شاخ نی است
لیك در دیدهء آعدا به اثر زوپین است
بس بود معدلتش مایهء آرایش ملك
شهر بغداد چه محتاج به شهر آیین است
خنجر موعظه تا قبضه به دل کار کند
گرچه شمشیر بدست خطبا چوبین است
گر ندانم سخن از نکهت خلقش گفتن
روزگاریست که بوی نفسم مشکین است
ای دبیری که بەتحسین منت حاجت نیست
زانکه سر تا قدمت تعبیه از تحسین است
پایەات بسکه بلند است ز وصف خجلم
چند بالا بروم می نگرم پائین است
چمن عمر تو از باد خزان ایمن باد
تا چمن پر ز گل و یاسمن و نسرین است
تا دراین دیر مسدّس بەلآلی نجوم
پیکر گنبد فیروزه گهر آگین است
ور بەکرکوك فروماند (رضا) پنداری
در حصاریست که دیوا و درش رویین است
دلم ز آتش آن غصبه بسی که بود کباب (ت).

---

(١) از درونش (ت).

(٢) بکشید (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: ″ عمرهـا در پی مقصـود بـه جـان گردیـدیم
دوست در خـانـه و مـا گرد جهان گردیدیم″

گنبدی هست کە نـامش کفل سیمین است: گومـەزێك هـەیە، کە نێوی سمتی زیوینە. از درونش همـە بـا آب طلا رنگین است: لە نـاوەوە هـەمووی بـە ئـاوی زێڕ ڕەنگینە، مـەبـەست لە ″ نـاوەوە″ دیارە شتەکانی ناوگەڵیەسی. عشق بـا سادەرخـان از پی سـاق است و سرین: ئـاشقە لووسی لـە بۆ پووز و سورێن و کەفەڵە. نە رخ و زلف و خم اندر خم و چین در چین است: نـەك بۆ ڕوو و زوڵف و پێچ و تـاو و چین لـە سـەر چینی پـەرچـەم و زوڵفە، چونکە ئەوانـە هـەموو بۆ جێی مـەبـەست ڕێبـەدێیی دەکەم. آن دروغ است کە من شیفتە خـال و خطم: ئـەوە درۆیـە کە یـەکێ بڵێ (ئـەوانـە درۆن)، کە من هـەڵوەدای خـاڵ و خەتم. شیخ را هم غرض از سادە پرستی این است: مـەبـەستی شێخیش لـە سادە پـەرستی هـەر ئـەمـەیـە. ایهـا النـاس چو من رخت بـە میخـانـە کشید: ئـەی خـەڵکینە ئێوەش من ئـاسایی تـەخت بـەرەو مـەیخـانـە ڕاکێشن، واتـە: هـەر لـەوێ بژین و بمرن.. نـە بـە مسجد کە دراو زاهد بی دین است: نـەك بـەرەو مزگەوت کە لـە دنیـا بـە درۆ دەسبـەرداری بێ دینی لێیە. خود دو صد عیب نهان دارد و إغمـاضٌ کند: خۆی دوو سـەد عـەیبی هـەس و چاوی لێ دەپۆشێ، داستـانش همـە از عیب من مسکین است: کەچی داستـان و حەکایـەتی لـە مـەڕ عـەیبی منی هـەژارە. میتوانم کە کشم کینە ز دشمن لیکن: ئـەمن دەتوانم دەگەڵ نـەیاردا بیکەم بـە کینـەبـەری. ای عزیزان چـە کنم سینـەء من بی کین است: بـەڵام چ بکەم ئـازیزان، سینـەی من بێ ڕك و کینـە. چە غم آرد ز نظر اهل ریـا زشت آید: خلقت من کە بـەچشم همـە کس شیرین است: بـەڵام ئێسك و سـەروسوورەتی من لـەبـەر چـاوی هـەموو کەسێ شیرینە. مـایـەام گوهر نظم است خریدارش نیست: مـایـەی فرۆتـەنیم گەوهـەری شیعرە، بـەڵام کڕیاری نییە. سالها شد کە ز خرجی تهیم خرجین است: چـەندین سـاڵە لـە خـەرجی خورج خـاڵیم. هـاوئـاوازیی ″خـەرجی″ و ″خورجین″ خۆشە. عـارم آید کە نویسم بـە کسی شرح نیـاز: بـە نـەنگی دەزانم شـەرحی حـاڵی خۆمی بۆ بنووسم. جز بـە نـاظم کە ولیُّ النِّعم دیرین است: جگە لـە نـازم کە خێوی ڕۆزی و بژیوی کۆنمە. حبَّذا قبلـەء أربـاب هنر نـاظم بگ: ڕووگەی هونـەرپـەروەران کە نـازم بـەگە، شایستـەی پـەسن و پێدا هـەڵگوتنە. متصرِّف بـە شرف چون فلك پروین است: موتـەسـەڕیف لـە شـەرافـەت و و بڵندیدا هـەروەك فـەلـەکی پـەروینە. عزم او یـافت مگر بـاد و زان چـالاك است: بـا عـەزمی ئـەوی وەچـەنگ کەوتووە، لـەوەڕا خێرا و چـالاکە. حزم او

دید مگر کوه ازان تمکین است: کێو حەزمی ئەوی وەگیر کەوتووە بۆیە هێند چەسپ و پایەدارە. خامەاش گرچە عبارت ز یکی شاخ نیست: قەڵەمی گەرچی بریتییە لە چڵە قەمیشێ. بلکە در دیدەء اعدا بە أثر زوبین است: بەلام لە کارکردندا بۆ چاوی دژمن نێزەی دوو سەرە. بس بود معدلتش مایەء آرایش ملك: داد و عەداڵەتی زۆرە و مایەی ڕازاندنەوەی مڵك و دەوڵەتە. شهر بغداد چە محتاج بە شهر آیین است: شاری بەغدا چ پێویستی بە یاسا و ئاینە. خنجر موعظە تا قبضە بدل کار کند: خەنجەری پەند و ئامۆژگاری تا مشتوو کار لە دڵ دەکا. گرچە شمشیر بدست خطبا چوبین است: گەرچی شمشێر بە دەست خودبەخوێنانەوە دارینە. گر ندانم سخن از نکهت خلقش گفتن: ئەگەر نەزانم قسە لە بەرامەی قسە ئاکاری پاراوی بکەم. دەمگوت خوایە، داخۆ ئەوە چەند ڕۆژە بۆ بۆی هەناسەم بۆنی میسکی لێ دێ. ای دبیری کە بە تحسین منت حاجت نیست: ئەی سەرکارێ، کە پێویست بە ئافەرین و بترەژمی من نییە. زانکە سر تا قدمت تعبیە از تهسین است: لەبەر وەی کە لە سەرترا تا ژێر پێت لە ئافەرین سەرشارە ″ تعبیە″ مەبەست ″موعەببەء″: پایەات بسکە بلندا است ز وصفت خجلم: پلە و پایەت لەبەر وەی فرە بڵندە، لە پەسندان و وەسفت شەرمەزارم، هێچکی وەسفم بە گوریسی پێدا هەڵگوتنت ناگاتەوە. چند بالا بروم می نگرم پائین است: هەر چەندی بەرەو سەروو هەڵکشێم، دەنوارم هەر خوارێیە. چمن عمر تو از باد خزان ایمن باد: چیمەنی تەمەنت لە گەڕی بای پایز بە دوور بێ. تا چمن پر ز گل و یاسمن و نسرین است: تا چیمەن پڕ لە گوڵ و یاسەمەن و نەسرینە. تا در این دیر مسدَّس بەلالی و نجوم: تا لەم گێتییە شەش پالووەدا بە مرواریی ئەستێران. پیکر گنبد فیروزە گهر آگین است: پەیکەری گومەزی پیرۆزە گەوهەر ئاخنە. ئەمانە وەك ڕستەی مەرجەکی پاش وەلام کەوتوون. ور بەکرکوك فرومانْد (رضا) پنداری: ئەگەر لات وایە (ڕەزا) لە کەرکووك گیری خواردووە و چاوەنۆڕە. در حصاریست کە دیوارو درش رویین است: لە حەسارێکدایە، کە دەر و دیواری پۆلایە.

۲۲

## در ستایش شیخ امین اربیلی
## رئیس محکمهء جزای کرکوک*

(پیتی) تیّ

گــفــتــم مــلك روی زمین شیــخ امین است
نــهنــه غــلــطــم صد مــلــكش مُــلك یمین است
کــوتــه نــظــری گــفت مــلك مــی نــتــوان شد
کــانــرا بــهفــلك مسکــن ویــن را بــهزمین است
گــفــتــم مــگــر ایــن ضرب مــثــل را نشنــیدی
ای خــواجــه کــه تشریــف امــاکن بــهمکین است
بــازار درایــن کــار درآمــد کــه مــلائك
ازنــور، بــنــی آدم بــیــچــاره ز طین است
مــاهــیت آن تــعــبــیــه از عــالــم انــوار
سرمــایــهء ایــن، قــطــرهای از مــاء مــعین است
بــا آن گــهــر پــاك بــرابــر نشود خــاك
صد پــایــه بــهمــیزان خــرد آن بــه ازیــن است
گــفــتــم کــمــکــی بــاز بــكش خــواجــه عــنــانــرا
اصرار مــکــن، عــفــو بــفــرمــا، نــه چــنین است
در بــارگــه لــم یــزل اقــدس یــزدان
بــنــیــاد فــضیــلــت هــمــه بــردانش و دیــن است
مسجــود مــلائك شدن آدم خــاکــی
از سایــهء عــلــم لــدنــی و دیــن مــبین است
ای شیــخ اگــر مــحــکــمــه را مــعــدلــتــی هست
از رای زریــن تــو و از فــکــر مــتین است
جــبــریــل امــیــنت ز بــرای چــه نــگــویــم(۱)
صد بــار خــدا گــفت کــه جــبــریــل امین است

شیـرینـتـر از اشعـار (رضـا) نـیست، بـلـی هست
أمـا نـه چـنین نـغـزو نـه چـنین نمکین است[٢]

............................................................

(١) زبرای(ت).

(٢) چنین نقره (دیوان).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن مەکفووف مەحزووف

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)

وەك: ″گر دست دهد خاك كف پای نگارم

بر لوح بصر خـط غبـاری بنگارم″

گفتم ملك روی زمین شیخ أمین است: گوتم گەردوونی ڕووی زەوین شێخ ئەمینە. نە نە غلطم صد ملکش ملك یمین است: نـا نـا هەڵەم کرد، صەد بەزێڕکڕدراوی، کەنیزەی وییە. کوتە نظری گفت ملك می نتوان شد: گوتم کورتبینێك ناتوانێ بە مەلایەکەت ببێ. کانرا بفلك مسکن و وین بەزمین است: کە ئەویان ماڵی لە ئاسمان و ئەمیان لەسەر زەوینە. ای خواجە کە تشریف آماکن بە مکین است: ئەی خواجە شەرەف و گەورەیی جێگا بە نیشتەنییەوەیە. بازارِ دراین کار درآید کە ملائك – از نور بنی آدم بـیـچـارە ز طین است: بـازاڕی زەمـانـە وای لـەم کـارەدا کـردووە کـە مـەلایـەکـەت لـە ڕووناکی و ئایەمی بێچارە لە قوڕە. ماهیت آن تعبیە از عالم انوار: چییەتیی ئەو لە جیهانی ڕووناکی ڕسکاوە. سرمایەء این قطرە از ماء معین است: ماك و سەرمایەی ئەم دڵۆپەیە لە ئاوی ڕەوانە. با آن گهر پاك برابر نشود خاك: خاك دەگەڵ ئەو گەوهەرە پاکەدا یەکسان نییە. دەگەڵ یەکدیدا بەراورد ناکرێن.. صد پایە بەمیزان خرد آن بە ازین است: صەد پلە بە تەرازووی ئەقڵ ئەو لەم چاترە. گفتم کمکی باز بکش خواجە عنان را: گوتم خواجە نەختێ جڵەو بگرەوە. زۆر مەڕۆ.. اصرار مکن عفو بفرما نە چنین است: زۆری پێ لێ دامەگرە، ببەخشە کارەکە وا نییە. در بارگە لم یزل اقدس یزدان: لە بارەگای هەمیشە هەرهەبووی هەرە پیرۆزی یەزداندا: بنیاد فضیلت همە بر دانش و دین است: بنیاتی ئەردە و زێدەگەورەیی لەسەر زانست و دین ڕۆنراوە. مسجود ملائك شدن آدم خاکی: حەزرەتی ئایەمی خاکیی مەلایەکەت کڕنووش بۆ بردوو: از سایەء علم لدنی و دین مبین است: لە سایەی زانستی خوا خۆی و ئاینی

ڕوون و ئاشكراوەیە. ای شیخ اگر محكمە را معدلتی هەست: ئەی شێخ ئەگەر دادگا عەداڵەتێكی بەركەوتبێ. از رأی زرین تو و ز فكر متین است: ئەوە لە سای ڕای زێڕین تۆ و لە بیری پایەداری یان ڕێی تۆوەیە. دەتوانی (را) بە (ڕێ)یش مانا لێ دەیەوە. جبریل امنیت ز برای چە نگویم: بۆچی جبریلی ئەمین نەڵێم: صد بار خدا گفت كە جبریل أمین است: خودا صەد جاری جبریل فەرمووە. شیرینتر از اشعار (رضا) نیست، بلی هەست: لە شیعری (ڕەزا) شیرینتر نییە؟ بەڵێ هەیە. أما نە چنین نغزو، نە چندین نمكین است: بەڵام نەك هێندە شیرن و جوان و نەش ئەوەندە سوێرمەزەیە.

٢٣

**برای امین فیضی***

(پیتی) تێ

مشربت خوش و لهجە شیرین است
دهـــنت درج گـــهـــر آگـــین اسـت
فـــكـــر بـــكـــر تـــو بین بین الـــلـــە
نـغـز دوشیـزە نـیـگـاریـن است(١)
عـرش بـلـقـیس و فـرش بـراقش
در حـقـیـقت كـمـینـە كـابین است
این نە شعر است: رشتەء شهداست
این نە نظم است عقد پروین است
مـــصرعـــی از قـــریـــحـــەء عـطـــار
كـــە عـــجب آبـــدار و رنـــگین است
گـر بـەتـضمین بـیـارم چـە عـجب
یـــكـــی از فـــنّ شعـــر تـــضمین است
بـــەمـــعـــانـــی گـــران، نـــظـــم سبك
گـر بـود سهـل ممتـنـع ایـن است
تـا بـەضرب المثـل هـمـی گـویـنـد
كـــە دعـــا از بـــرای آمـین اسـت

خـاطـرت شاد بـاد (امین فـیـضـی)
زان که دریای دانش و دین است
دشمــنت خــاکسار و زیــر و زبــر
زان که درخورد لعن و نفرین است
فــضل را دانــد از خــدای (رضا)
نــه ازان شاعــران خــودبین است

.................................................................

(١) نقرەء شیرەء (دیوان).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ

(فاعلاتن فعلاتن فع لان)

وەك: " بیش از این طاقت هجرانم نیست

برگ این دیـــدەء گریـانم نیست"

مشربت خوش لهجه شیرن است: هـاودەمیت خۆش و زاروپلت شیرینە. دهنت درج گهر آگین است: زارت چـەکمـەجـەی گـەوهـەر ئـاخـنـە. فـکـر بـکـر تـو بین بین اللّـه: بیری نەسمراوی تۆ بەینی بەینەڵڵا: نغر و شیرین و نگارین است: کیژی نەسمراوی شیرن و نیگار نییە. عرش بلقیس و فرش براقش: عەرشی بەڵقیسا و فەرشی بەراقیش: در حقیقت کمینە کابین است است: بارەگای شا بەلقیساو فەرش و رایەخی بەراقیش بە ڕاستـی مـارەییـیەکی زۆر کـەمـە. بـەڵـقیس: قرالیـچـەی شاری "سەبـەء" هـاوچـەرخـی سلێمانی کوڕی داوود، که بۆ دیدەنیی چووە، بەپێی نەقلان، بە هاوسەری سلێمان نامێیە. این نە شعراست، رشتەء شهد است: ئەمە شیعر نییە، ڕشتەی هەنگوینە. این نە نظم است، عقد پروین است: ئەمە هۆنراوە نییە، کۆی پەروینە. مصرعی از قریجەء عطار: لاشیپانەیەك لە قەریحەی عەتتار. مەبەستی شاعیری سۆفیی گەورەی ئێران، شێخی عەتتارە. که عجب آبدار و رنگین است: کە عەجەب ئاودار و ڕەنگینە. گر بە تضمین بیارم چە عجب: ئەگەر بە ناواخنی شیعرمی بکەم، پێت سەیر نەبێ. یکی از فنّ شعر تضمین است: چونکە یەکێ لە هونەری شیعر، لە شیعری تر هەڵکێشانە. بە معانی گران، نظم سبُك: بە مانا گران، بە هۆن سووك. گر بود سهل ممتنع، این است: ئەگەر شتێ هەبێ سانا و لە کر بەدەر، ئەوە ئەمەس. آن بە ضرب المثل همە گویند: ئەوە بە مەسەل دەڵێن. کە دعا از برای آمین است: کە دوعا بۆ خاتری ئامینە. " ئامین"

یش و ″ ئەمین″یش دەگرێتەوە. خاطرت شاد باد (آمین فیضی): خاترت هەمیشە شاد بێ. زان کە دریای دانش و دین است: چونکە دەریای دانش و دینە. دشمنت خاکسار وزیر و زبر: دژمنت خاکەسار و ژێر و ژوور بێ. زانکە درخورد لعن و نفرین است: چونکە شایستەی لەحنەت و نفرە.. فضل را داند از خدای (رضا): شێخ رەزا فەزڵ و کەماڵ بە بەهرەیەك لەلایەن خواوەی دەزانێ. نە از شاعران خودبین است: نەك لەلایەن شاعیرانی بە فیز و خۆ بە زلزانەوە.

٢٤

**عشق حضرت حسین***

(پیتی) تێ

لافت از عشق حسین است و سرت برگردن است
عشقبازی سر بەمیدان وفا افنگدن است
گر هواخواه حسینی ترك سر كن چون حسین
شرط این میدان بخون خویش بازی کردن است
از حریم کعبە کمتر نیست دشت کربلا
صد شرف دارد بران وادی کە گویند ایمن است
ای من و ایمن فدای خاك پاکش کاندرو
نور چشم مصطفی و مرتضی را مسکن است
زهرەء زهرا نگین خاتم خیرالوری
نطفەء پاك جناب حیدر خیبر كن است(١)
سنّیم سنّی، ولیکن حبّ آل مصطفی
دین و آیین من و آباء واجداد من است
شیعە و سنی ندانم، دوستم با هرکە او
دوست باشد، دشمنم آنرا کە با او دشمن است
حبّ آل و سبّ اصحاب نبی یا للعجب
از قبیل نام سبحان بردن و گوە خوردن است

نام آن میر عالیشان باشد: گیان لە پێناو نامەیەکدا، کە نێوی ئەو میرە پایە بڵندەی تێدا بێ، بەخت دەکەم. مصطفی بگ کە کلك مشکینش – همچو طوطی شکر فشان باشد: مستەفا بەگ کە خامەی میسکبێژی، وەك تووتی شەکەرڕێژە. شاهباز بلند تدبیرش – طائر أوج کن فکان باشد: شابازی بڵند تەگبیری وی، باڵداری پۆپەی هەرچییەکی گوت "ببە، دەبێ" یە.. عزم أورا ز چشمەء تقدیر: عەزمی وی هەر لە سەرچاوەی تەقدیری خواوەندەوە. با قضا طفل توأمان باشد: دەگەڵ قەزادا ساوای جمرانەن..مەبەستی ئەوەیە کە خواوەند هەر لە ڕۆژی عەزەڵەوە عەزم و خوایشتی ویی دەگەڵ چارەنووسدا وەك دوو ساوای جمرانە لێ کردووە. واتە: وای بۆ لە لەوحی مەحفوزدا بۆ تۆمار کردووە، کە هەر خوایشتێکی هەبووە، دەبێ یەکسەر جێبەجێ بکرێ. قدر او در مکان نمی گنجد: قەدر و بەهای هێندە گەورەیە، لە نێو شوێندا جێی نابێتەوە. مر سراپردەء لامکان باشد: مەگەر لە سەراپەردەی ناشوێن (لامکان) لای خوا، کە لە زەمان و مەکان بەدەرە، بگونجێ و جێی ببێتەوە. ئەم مانایەی لە شیعری عیمادودینی نەسیمی خواستوەتەوە، کە دەڵێ:

منده صغار ایکی جهان　　من بو جهانه صغمازم

گوهـر لامکــان مــنم　　کون و مکانه صغمازم

بە کوردییەکەی:

هەردوو جیهان خۆیان خزاندووەتە نێو منەوە

من ناخزێمە نێو ئەم جیهانەوە

گەوهەری بێ شوێن منم

ناخزێمە نێو زەمان و مەکانەوە

بر سراپردەء لامکان باشد: جێگای وی لە سەر سەراپەردەی ناشوێنە.. وصف ماهیَّتش توانم گفت: دەتوانم وەصفی چییەتیی بکەم. گر مەو مهر جسم و جان باشد: ئەگەر مانگ و ڕۆژ لەش و گیان بێ. دیارە گیانی بە ڕۆژ و لەشی بە مانگ چوواندووە.. ئەمە بە بڕوای سۆفییان، واتە دوو شت، یەکێکیان، وەك مانگ کە بە ڕواڵەت خۆ دەنوێنێ و شەوقی ئی خۆی نییە و لە ڕۆژی وەردەگرێ، ئی دووەمیان وەك ڕۆژ، کە بە حەقیقەت هەر ئەو سەرچاوەی تیشکە و هەر خۆی حسێوە. خولاسە هەر چی شتی بەرچاو هەس، ڕواڵەتە و حەقیقەت و نییە و هەمووی لە فەیزی خوای لە هەموو ڕواڵەتێك بەدەرەوە، شەوقی داوەتەوە. مەبەستی وەحدەتی وجوودە. در قیافت جوان،

بە دانش پیر: لە قیافەتدا لاو، بە زانست و دانایی پیر. ئەمەش هەر ئەوە دەگەیەنێ کە شت بە دوو دیمەن خۆی دەنوێنێ: یەکێکیان لە هەرەتی لاویدا و ئەوی تریان لە پیریدا، ئەوەکەی هەرەتی لاوێنی ڕەفتەنی و بێ پایەس و بەرەو زەواڵە و ئەوی تریان، پایەدار و حەقیقەتە و هەر دەمێنێ، کە "قدیم"ە موتڵەقە، خواوەندەکەیە.. دیارە "قدیم" و "حادث" وەك دوو زاراوەی عیلمی کەلام و فەلسەفەی ئایدیالیزم، دوو شتی لێك دووفاقن یەکەمیان ڕاستە و دووەمیان، وەك سێبەر وایە.

طرفە پیری کە نوجوان باشد: بەڵام سەمەرە ئەوەیە کە پیرێك لاو بێ. واتە هێندەی خۆ لە بەندواری دنیای ماددی ڕەها کردووە، شەوقی حەقیقەتی بە هەموو هەرەتێکەوە تێدا درەوشاوەتەوە. واتە: حەقیقەتی خواوەند بە ئاکارێك کە ئاکاری خواوەندە، دەنوێنێ. گر دامن همّتش برافشاند: ئەگەر ئەوەی لە داوێنی هیممەتیدایە، هەڵڕێژێ. ئەوەی لێ دەرژێ کە لە بەریکی دەریا و گانگادا هەس، نیست فخر کیانیان چون جم. جێی شانازیی وەك جەمشیدی کەیانییان وجوودی نییە. بگرە ئەو جێی شانازیی سەرلەبەری جیهانییانە. ای سفر کردەای کە فتح و ظفر: ئەی سەفەر کردەیەك کە فەتح و سەرکەوتن: دەگەڵ ڕکێفتدا هەمیشە هاوجڵەوە. سفرت بە أزان کە درَ ثمین – تا بە دریا بود نهان باشد: سەفەرەکەت هێندە ناوودەنگی داوەتەوە، لە دوور چاترە کە لە نێو دەریادا بە نهێنی بمێنێنەوە.. شاعیر سەفەری مەمدووحی لە ڕووی ناووبانگەوە بە دوری بن دەریا، کە ئەویش زۆر بە ناووبانگە چوواندووە، بەڵام دورێك کە تا لە بنی دەریادا شاراوە بێ، ئەو لە کوێ و سەفەری بە ناووبانگتری مەمدووح لە کوێ؟!

ئاسمان و ڕێسمانە، ، دست در گردن هدف نکند – تیر تا همدم کمان باشد: تیر دەست لە ملی نیشانە و ئارمان ناتوانێ بکا، تا بە هاودەمی کەوان نەبێ. واتە: هەر نیازێکی بۆ ئامانج گەیشتن هەبێ، تا قودرەت و توانی ویی دەگەڵدا نەبێ، جێبەجێ نابێ. شاعر ترا بریدە باد زبان – شاعیر، ئەگەر پەسن و ستایشی تۆی هەمیشە لەسەر زار نەبێ، زمانی بە بڕین چێ. چە تفاوت میان ناز کند – طبع چون سرکش و روان باشد: چ بیانوو و دەسپێچکی نازکردنی بە دەستەوە دەمێنێ، مجێز و تەبع، کە سەرکێش و ڕەوان بێ. واتە تەبع ناتوانێ هیچ ناز و نووزێك بۆ خۆنەبان کردن، بنوێنێ، هیچ عوزرێکی بە دەسەوە نامێنێ، کە گەوارا و ڕەوانیش بێ. در لغت (کرد) مردرا گویند: لە زماندا (کورد)بە پیاوێك دەگوترێ. گر زبردست و پهلوان باشد: گەر

زەبــەردەست و قــارەمــان بــێ. وشەی کــورد لــە شانــامــەدا بــە "گــرد" نــووسراوە، مــام هــەژاریش، بە مانای بەهێزی لێك داوەتەوە. تورکەکان بە "گور"ی دەڵێن. کوردی زۆر نــاوچــەی کوردەواریش، وا دیــارە، هــەر لــە تــورکــەکــەیــان هــەڵگــرتــووەتــەوە، تــەنــانــەت ئەوەشیان لە بیرچووە، کە بە "باوەگرگر" "باوەگورگور" دەڵێن. من نگویم چو شاعران دیگر: ئەمن وەکو شاعیرانی تر ناڵێم. کە کار ئەوها و ئەوها بێ. از دعایت همین قدر گویم: بۆ دوعا بۆ کردنت هەر هێندە دەڵێم. کە آنچە خواهد دلت آنچنان باشد: کە هەرچی دڵت گەرەکیەسی، وەو تەرحە بێ، واتە خوا بە خوایشتی خۆتت دەگەڵدا بکا. هدیەات را بە جان قبول کنم: دیارییەکەت بە دڵ و گیانەوە قوبووڵ دەکەم. گرچە یك ریزە استخوان باشد: گەرچی ڕێزە سوقانێکیش بێ. قدر شعر گرانبهای (رضا): قەدری گرانبـاییی (رضا): داند آنکس کـە نکتـەدان بـاشد: ئـەو کـەسەی کـە نوکتـەزان بـێ، دەیزانێ.

## ٤١

## تخمیس غزل حافظ*

(پیتی) دال

تــعــدّایــی کــە بــا مــن اقــربــا کــرد
نــدیــدم شمــر بــا آل عــبــا کــرد
مــگــر از حــال مــن رمــزی ادا کــرد
(سحر بلبل حکایت با صبا کرد
کـە عشق روی گل بـا مـاچـهـا کـرد)
ز عـقـوب طـینـتـان عـمّ و خـالـم
پـریشان روزگـار و خستـە حـالـم
مـهـیّـا از پـی تـاراج مـالـم
(مـن از بـیـگـانـگـان هـرگـز نـنـالـم
کە با من هر چە کرد آن آشنا کرد)
پـر از زاغ و زغـن صحـن گـلستـان
ز شادی کـبك قـاهـا قـاه و خـنـدان

هــزاران را هــزاران داخ حــرمــان
(بـهـر سو بـلـبـل مسكـيـن در افـغـان
تـنـعّـم درمـيـان بـاد صبـا كـرد)
(رضا) را نفرت است از خرقه پوشان
زعشق و شورها چون دف خروشان
مـن و مـی بـعـد بـزم بـاده نـوشان
(بشارت بـر بـهكـوی مـی فـروشان
كـه حـافـظ تـوبـه از زهـد و ریـا كـرد)

---

(*) كێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەحزووف
(مفاعيلن مفاعيلن فعولن)
وەك: ״ ز بـاغ عافيـت بويـی نـدارم
كه دل گم گشت و دلجويی ندارم״

تعدّايی كه با من أقربا كرد: دەسدرێژییەك كە خزم دەگەڵ منیدا كرد. ندیدم شمر با آل عبا كرد: نەمدیت شمر دەگەڵ بەرەی ئیمامی عەلییدا بكا. مگر از حال من رمزی ادا كرد: مەگەر ئەوە نمایەكی دەربارەی سەر زوان. واتە: مەگەر بە ڕەمز و لەمزەوە بیڵێم. یا مەگەر ڕەمزی كە كابرایەكە، ئادای بكا... (سحر بلبل حكايت با صبا كرد – كە عشق روی گل با ما چها كرد) بەرەبەیان بولبول حەكایەتی دەگەڵ بای سەبادا كرد، كە ئەشقی ڕووی گوڵ چیی بە مە كرد. ئەگەر ״ماچها״ وەك كوردی بە مانای ״ئێستری ماچە״ بێ، ئەوە مانایەكەی وای لێ دێ، كە خزمەكانی بە پێچەوانەوە، وەك ئێستری ماچەیان دەگەڵدا ڕەفتار كردووە، یا ماچ و مووچیان دەگەڵدا كردووە. ئێستری ماچە بە تۆڕی نامێیە. واللّه أعلم بالصوَّاب.. ز عقرب طينتان عمّ و خالم: كەسانێكی لە كولاژدم ماك و ئەسڵ، مام و خاڵوانەم: پريشان روزگار و خسته حالم: ڕۆژگار پەرێشان حاڵ و باڵ ماندووم. مهيًا از پی تاراج مالم: هەمیشە بۆ چەپاوڵ كردن و بە تالان و بڕۆبردنی ماڵ و حاڵم ئامادەو تەیارن. (من از بيگانگان هرگز ننالم): من لە بیانییان هەرگیز ناناڵم – كە با من هرچه كردن آن آشنا كرد): ئەوەی دەگەڵ منی كرد، ئاشنا و ڕۆشنا كردیان. پر از زاغ و زغن صحن گلستان: مەیدانی گوڵستان پڕ لە قەلەڕەشكە و دالاشە. ز شادی كبك قاها قاه و خندان: كەو لە خۆشییان قاقایەتی

و دەو بە کەنە. هُزاران و را هزاران داغ حرمان: کەچی هوزاران، بولبولان هەزاران داخی بێ بەشی و مەینەتی دەخۆن. (بە هر سو بلبل مسکین در افغان – تنعُّم در میان باد صبا کرد) کەیفخۆشیش، لەو نێوانەدا، بای سەبا کردی. واتە کێ کردی و کێ خواردی. "تووتنە خەرجی سووتنە مۆدنە ماچی لەب دەکا"... (رضا) را نفرت است از خرقە پوشان: (ڕەزا) نەفرەت لە پەلاّس پۆشان دەکا، خۆشیی لە چارەیان نایە. ز عشق و شور ما چون دف خروشان: لە تاو ئەشقی مە وەك دەف، هاڕەمان دێ. من و می بعد بزم بادە نوشان: من و مەی لە دوای بادە نۆشانەوە. (بشارت بر بە کوی می فروشان – کە حافظ توبە از زهد و ریا کرد): کە حافز لە دنیا دەستبەرداری و دووڕوویی تۆبەی کرد.

## ٤٢

## در تاریخ تعمیر جامع حاجی اغا می گوید*

(پیتی) دال

**اگر خواهی سعادت سعیها کن در نیکوکاری**
**کەیزدان (لیس للانسان الا ماسعی) فرمود**
**ببر رنج و ببخشان گنج در راه خداوندی**
**کە در پاداش نیکی بندگان را وعدها فرمود**
**مگو زحمت کشید و ساخت مسجد مصطفی آغا**
**بگو جنَّت خرید و با خدا بیع و شرا فرمود**
**جواهر پاش شد طبع (رضا) و گفت تاریخش**
**(مزیَّن معبدی را مصطفی آغا بنا فرمود)**

---

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: " خدا را داد من بستان ازو ای شحنەء مجلس
کە می با دیگری خوردست و بامن سر گران دارد"

**اگر خواهی سعادت سعیها کن در نیکوکاری:** ئەگەر بەختەوەریت دەوێ، بۆ کاری چاك

تێ کۆشە. کە یزدان (لیس للإنسان إلّا ما سعی) فرمود: کە یەزدان (مرۆ لەوە کە بۆی تێ دەکۆشێ، چیی دیکەی بۆ نامێنێتەوە)ی فەرمووە. ببر رنج و بیفشان گنج، در راه خداوندی: لە ڕێی خوادا ڕەنج بکێشە و گەنج ببەخشە. کە در پاداش بندگان را وعدها فرمود: چونکە لە پاداشتی بەندەکانی خۆیدا، گفت و بەڵێنی فەرمووە. مگو زحمت کشید و ساخت مسجد مصطفی آغا: مەڵێ مستەفا ئاغا زەحمەتی کێشا و مزگەوتی ڕۆنا. بگو جنَّت خرید و با خدا بیع و شرا فرمود: بڵێ بەهەشتی کڕی و دەگەڵ خوادا سەودا و مامەڵەی فەرموو. دیارە ئەمە نەقیزەیەکی تێدایە. جواهر پاش شد طبع (رضا) و گفت تأریخش: تەبعی (ڕەزا) بوو بە گەواهێر پەخش و مێژووی (مزیَّن معبدی را مصطفی آغا بنا فرمود) گوت: (مستەفا ئاغا پەرستگایەکی ڕازاوەی ڕۆنا).

## ٤٣

## در ستایش مرحوم احمد پاشا ابن سلیمان پاشا طاب ثراه*

(پیتی) ڕێ

هر چند زدم دامن تقوی بەکمر بر
تسبیح بەکف گیرم و مسواك بە بربر
ناگە کفلی نرم تر از پنبەء محلوج
برجست ز دنبال یکی سادە پسر بر
چون دیدم و از شوق دلم در طپش آمد
چون خایەء حلاج بە زیرو بە زبر بر
آبم ز دهان ریزد و جانم بەلب آمد
صد آه جگرسوز برآرم جگر بر
چون افعی سرمازدە از تابش خورشید
بازم زند احلیل پدر سوختە سر بر
دوشنبە بدم معتکف کنج عبادت
آهو کفلی آمد و زد حلقە بدر بر

بـرجستـم و دربـاز نـمـودم چـو مـرا دیـد
ازداعــیــهء ساده پــرستــی بــه حــذر بــر
بـرزد بـمـن از خشم یـکـی بـانگ بـهتـهـدید
بـانـگـی کـه زنـد ضـابـط حـربـی بـه نـفر بر
کـه شیـخ ریـائـی تـو نـه آن شیـخ رضـایـی
کـز رنـدی تـو بـود جـهـانـی بـهخـطـر بـر
اکـنـون سر تـزویـر فـروهشتـهای عـمـداً
یـعـنـی بـهرخ ساده حـرام است نـظـر بـر
مـاهـی بـهدرآورد یـکـی حـقّـهء سیـمـیـن
بـرحـقّـهء سیـمـیـنش یـکـی حـقـه ز بـر بـر
گه روی نشان داد و گهی ساعد و گه ساق
گشتـم نـگـران خـیـره بـدان شعـبـدهگـر بـر
وان گـاه بـهمـن عـطـف نظر کرد کـه برخیز
تـیـری بـههـدف بـرزن و تـیـغـی بـه سپر بر
این گفت و یکی شیشهء می از جیب در آورد
زان می که شعاعش زند آتش به حجر بر
جـامـی دو سه پـیـمـود ز نـاب مـی صـهـبـا
آویـخت بسی خـوشهء پـرویـن بـه قـمـر بـر
سودی نـکـنـد مـوعـظـه و ذکـر در آنجا
کـز شوق فـتـد رعشه بـراعـضـای ذکـر بـر
افـتـاد نـگـاهـم چـو بـدان ساق نـیـگـاریـن
پـیـچـیـده دو ساقـم ز هـوس یك بـه دگـر بـر
در عــرصهء اعــمــال نــهــالــی بـنشانـدم
شاخش بـهقـمـر بـرشد و بـیـخش بـهسقـر بـر
هـوش دار (رضـا) هـرزه مـگـو زانـکـه بـد آید
بـر طـبـع ولـی نـعـمت فـرخـنـده سیـر بـر

(احـمـد) لـقب آن والـی جـم جـاه کـه بـاشد
صد رتبه ز جمشید به اصل و به گهر بر
طهمورث و هوشنگ و کیومرث و سیامك
جـمشیـد کـنـد فـخـر بـدیـن چـار پـدر بـر
نسبت نـتـوان کـرد بـدیـن جـمـلـهء مـعدود
آبـــاء کـــرامش کـــه نـــیـــایـــد بـــه شمـــر بـــر

.............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)
وەك: " أندوه تو شـد وارد کاشانەام امشب
مهمان عزیزم آمده در خانەام امشب"

هر چند زنم دامن تقوی بە کمر بر: هەر چەندی شاقەلی لە خواترسی بە بەر پێشتێندا کەم. تسبیح بە کف گیرم و مسواك بە بر بر: تەزبیە هەڵگرم و میسواك بە بەر پێشتێندا کەم. ناگە کفلی نرم تر از پنبەء محلوج: لە ناکاو سمتێکی لە لۆکەی هەلاجیکراو نەرمتر. برجستە ز دنبال یکی سادە پسر بر: لە دوای هەتیوێکی سادەوە، سمتێکی زۆپ دەرپەڕیویش. چون دیدم و از شوق دلم درطپش آمد: هەرکە دیتم دڵم لە شەوقان وە تەپە تەپ کەوت. چون خایەء حلاًج بە زیر و بە زبر بر: وەك گونی هەلاج کەوتە بەرز و نزم بوونەوە. آبم بە دهان ریزد و جانم بە لب آمد: ئاوم زایە زار و دڵم وە سەر لێوم کەوت. صد آه جگر سوز برارم ز جگر: صەد ئاهی جگەر سووتم لە ناخی جەرگەوە هێنایە دەر. چون أفعی سرمازدە از تابش خورشید: وەك ماری سەرما کەسیرە کردوو لەبەر هەتاوی خۆر. بازم زند احلیل پدر سوختە سر بر: دیسان کێری باو شەوتیم سەری وەدەرهێنا. دوشنبە بودم معتکف کنج عبادت: دووشەمبە لە کونجی خواپەرستیدا بووم. آهو کفلی آمد و زد حلقە بە در بر: مامز کەفەڵێك هات و بە ئاڵقەی دەرکە لە دەرکەی دا. برجستم و در باز نمودم چو مرا دید: یەکسەر ڕاپەڕیم و دەرکەم لێ وەکرد: از داعیەء سادە پرستی بە حذر بر: لە جاڕدەریی سادەپەرستی پرینگایەوە. بر زد بە من از خشم یکی بانگ بە تهدید: لە تووڕەییان، بە هەڕەشەوە تێی ڕاخوڕیم. وەك ئەفسەری سەربازی، کە لە نەفەرێك ڕادەخوڕێ. کای شیخ ریائی تو نە آن (شیخ

رضا)یی؟ کز رندی توبوو جهانی به خطر بر؟ که دنیایەك لە تاو ڕەندیت، دە مەترسی کەوتووە. اکنون سر تزویر فروهشته بە عمداً: نووکە، سەری گزی و فڕوفێڵت بەسزمانانە، داخستووە. یعنی بە رخ سادە حرام است نظر بر: کە گۆیا لە ڕووی سادە نواڕین حەرامە. ماهی بە در آورد یکی حقّهء سیمین: مانگێکی هێنایە دەر، وەك دوڕدانی زیوین. بر حقّهء سیمینش یکی حقّه ز بر بر: دوڕدانێکی زێڕیشی وەسەر دوڕدانی زیوینی تری خستووە. گە روی نشان داد، گهی ساعد گە ساق: جاریّ ڕوخساری نیشان دا و کاویّ مەچەك و تاویّ بەلەك و پووزی. گشتم نگران خیره بدین شعبدەگر بر: بە جاریّ نیگەران بووم و لەم شەعبەدەگەر و فڕوفێڵ گێڕە، ورد بوومەوە. وانگاە بە من عطف نظر کرد کە برخبز: ئەوجا ئاوڕی لیّ وەدام، کە هەڵسە. تیری بە هدف بر زن و تیغی بە سپر بر: تیریّ لە نیشانە بسرەوێنە و تێخیّ لە سەنگەر دە. این گفت یکی شیشەمی از جیب برآورد: ئەمەی گوت و شووشەیەکی لە بەریکی دەرهاورد. زان می کە شعاعش زند آتش بە حجر بر: لەو مەیەی کە ئاور لە بەردی بەر دەدا. جامی دو سە پیمود ز ناب می صهبا: دوو سیّ پیاڵەی لە شەرابی ئاڵی تریّ نۆشی. آویخت بسی خوشهء پروین بە قمر بر: وشییەکی زۆری لە کۆوە وەسەر مانگ ئێخست. مەبەستی ئەوەیە، سەرو سوورەتی سوور هەڵگەڕا.. پەروین، کە بە کوردی کۆی پیّ دەگوتریّ، ڕەنگی بە سووری نامێیە، واتە: وشی، هێشوو، گوڵ، سونبولێکی زۆری، لە کۆوە کە بەشەرابی ڕەنگ ئاڵ تەشبیهـ کردووە، هێنا، ڕەنگ و ڕوخساری مانگی، کە ڕوخساری هەتیوەکەیە، پیّ سوور کرد. سودی نکند موعظه و ذکر در آنجا: وەعز و زیکر و فیکری خوا: لەوێدا هیچ سوودێکی نەبوو. کز شوق فتد رعشه بر أعضای ذکر بر: لە تاوان پەنا بە خوا، مچوڕکە وە جەستەی کێری حەیتار کەوت.. افتاد نگاهم چو بدان ساق نگارین: هەرکە چاوم بەو پووز و بەلەکە هەر دەتگوت ڕەسم کراوە کەوت، پیچیده دو ساقم ز هوس یك بە دگر بر: لە کەیفان هەردوو لاقم بە یەکتر ئاڵان. در عرصهء اعمال نهالی بنشاندم: بیّ ئێوە ناخۆش، نەونەمامێکم دە مەیدانی عەمەلییاتدا دانشتاند. شاخش بە قمر بر شد و بیخش بە سقر بر: لکی کە هەردوو لاقیەتی، بۆ مانگ، کە سەرو سوورەتیەتی بڵند و بێخیشی، کە قوونیەتی، بۆ سەقەر کە ناوەندی دۆزەخە نەوی بوو. مەبەستی لە سەقەر ئاوری تاوی کێریەتی. هوش دار (رضا) هرزه مگو زانکە بد آید – بر طبع ولی نعمت فرخندە سیر بر: (ڕەزا) وریا بە، قسەی قۆڕ مەکە، چونکە بۆ مجێزی وەلی نیعمەتی ڕەوشت و ئاکار پیرۆزی خراپە.

(أحمد) لقب آن والى جم جاه كه باشد: ئەگەر ئەحمەد نازناوی والیی شکۆ وەك شکۆی جەمشید بێ. صدر رتبە ز جمشید بە أصل و بەگهر بر: بە سەد پلە بە ڕەچەڵەك و ماك و نەژاد، لە جەمشید لە پێشترە. طهمورث و هوشنگ، كيومرث و سيامك – جمشيد كند فخر بدين چار پدر: تەهموورس و هۆشەنگ و کەیوومەرس و سیامەك، ئەم چوار بابە، جەمشید شانازییان پێوە دەکا. نسبت نتوان کرد بدین جملەء معدود: ناتواندرێ ئەو دەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا بەراورد بکرێ. آباء کرامش کە نیاید بە شمر بر: بابو و باپیرانی ڕەسەن و نەژاد پاکی، لە ژمارە نایەن.

## ٤٤

## احمد مختار*

(پیتی) رێ

شکستــه بــاد دو دست فـلك ازیــن کــردار
بـریـده بـاد دو پـای سپـهـر ازیـن رفـتـار
دلاوری کــــــه در آهـنـیـن ز جـا کـنـدی
بــەبــازوان قـوی هــمـچـو حـیـدر کـرار
بــەچشم زخـم حسودان شکستــه شد دستش
بلـی زمـانـه عـجب روبـهی است شیر شکار
ولی تو هیچ مخور غم شکسته بسته شود
بـەشاهـراه حـقـیـقت شکسه تـگیست بـکـار
بـراه عشق کـه از مــا و مــن بـپـرهـیـزنـد
ز پـــای دست بشوی و ز دست دست بــدار
نـه آخـر فـلك است ایـن فـلك کـه روز (اُحُد)
شکست گـوهــر دنـدان أحـمـد مـخـتـار
نـــه آخــر آن فـــلك است روز (صفّـــیـــن)
خـراب کــرد جـهــان را بــەکشتن عـمّــار

---

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ

(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)

وەك: ″ دلا ز قيد حريفان بى خرد بگريز

تو مرغ زيركى از دام ديو و دد بگريز″

شكسته باد دو دست فلك ازين كردار: هەر دوو دەستی گەردوون لەو کردارەی کردی، بشکێ. بريده باد دو پاى سپهر ازين رفتار: هەردوو پێی فەلەك لەو ڕەفتارەی نواندی بە برین چێ. دلاورى كه در آهنين ز جا كندى: دلاوەرێك كە دەركەیەكی ئاسنینی لە بن هەڵكەند. به بازوان قوى همچو حيدر كرَّار: بە بازووانی بە گورد، وەك حەیدەری كەڕار: مەبەستی ئیمامی عەلییە، كە دەركەی قەڵای خەیبەری لە بنڕا دەرێنا. به چشم زخم حسودان شكسته شد دستش: بە چاوی برینی حەسوودان دەستی شكا. بلى زمانه عجب روبهى است، شير شكار: بەڵێ ڕۆژگار ڕێوییەكی سەیر و سەمەرەیە، ئەو شێری ڕاو و شكارە. ولى تو هيچ مخور غم شكسته بسته شود – به شاهراه حقيقت شكستگيست به كار: وەلێ تۆ هیچ خەم مەخۆ، ئەوە بە شاڕێی ڕاستییەوە بەستراوە و كاری بەرەو شكست دەڕوا. به راه عشق كه از ماه و من بپرهيزند: دەبێ لە ڕێی ئەشقدا لە مانگ و من خۆ بپارێزن. زپاى دست بشور و ز دست بردار: لە پێیان دەست بشۆ و لە دەست دەستبەردار بە. مەبەستی ئەوەیە كە پیاو نابێ گوێ بە دەست و پێیان بدا. نه آخر فلك است، اين فلك كه روز (أحد): ئەدی ئەوە فەلەك نییە، ئەو فەلەكەی كە ڕۆژی (ئوحود). شكست گهر دندان أحمد مختار: گەوهەری ددانی ئەحمەدی موختاری شكاند:؟! نه آخر آن فلك است، اين كه روز (صفّين): ئەدی ئەوە فەلەك نییە، ئەو فەلەكەی كە ڕۆژی (سەفین). خراب كرد جهان را به كشت عمَّار؟ بە كوشتنی عەمماری كوڕی یاسر دنیای خرا كر؟

## ٤٥

### بريفكان*

(پیتی) ری

عزم ديار روم چو كردم ز شهرزور

افتاد در ديار بريفكان مرا عبور

كوهى بلند پايه در آن رهگذر بود

بگداخته ز تاب تجلّى بهسان طور

حـــــیـــــران شدم ز نشهء آن کـوه پـرشکـوه
پـــرواز کـــرد از سرمـــن طـــائـــر شعـــور
آواز کـــرد نـــاگـــهـــم از غـــیب هـــاتـــفـــی
کـین راز بـرتـو لحظـه‌ای دیـگـر کـنـد ظـهور
زان کـــوه نـــیـــکـــبـــخت چـــو بـــالا بـــرآمدم
بـنـمـود چـــون رواق فـلك گـنـبـدی ز دور
پـرسیـدم ایـن رواق مـنـوَّر ازان کـیست
بـخ بـخ تـبـارك الـلـه زیـن جـنت و قـصور
مـــانـــنـــد قـــرص انـــور زریـــن آفتاب
مـی تـافـتـی ز بـام و درش لـمعـه لـمعـه نـور
گفـتـنـد ایـن ضریـحـهء قـطـبـی ز اولـیـاست
پـــیـــمـوده ساقـــی از لـــبش بـــادهء طـــهـــور
ایـن مـرقـد حـبـیب خـدا (شیـخ نـوریست)
جسمش به‌خاك خفته و جان رفته در حضور
آیـــنـــد فـــوج فـــوج زبـــهـــر زیـــارتش
از آسمـــان مـــلائـــکـــه در صورت طـــیـــور
سازد خـدا بـه پـایـهء جـمشیـد بـرتـرش
مـوری اگـر بـه سایـهء قـصرش کـنـد مـرور
یـارب بـه‌جـاه حـرمت ایـن قـطب اولـیـا
(رضا) بـبـخش کـه فـرمـوده‌ای انـا الـغـفـور
روزی مـکـن درایـن سفـرش رنـج و محـنـتـی
بـــاز آورش بـــــه‌شادی و آســایـش و سـرور

---

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون موخەللەع
(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعول)
نموونەم دەست نەکەوت.

عزم دیار روم چو کردم ز شهرزور: کاتێ ویستم لە شارەزوورەوە بۆ وڵاتی ڕۆم بچم. افتاد در دیار بریفکان مرا عبور: وا ڕێ کەوت بە وڵاتی بریفکاندا تێ پەڕم. کوهی بلند پایه در آن رهگذر بود: چیایەکی پایە بڵند لەسەر ڕێیێم بوو. بگداخته ز تاب تجلّی به سان طور: وەك کێوی توور توابووەوە. حیران شدم ز نشئهٔ آن کوه پر شکوه: لە نەشئەی ئەو کێوە پڕ شکۆیە سەرم سوڕما. پرواز کرد از سر من طائر شعور: باڵداری هەست و خوستم لە سەرم پەڕی. کاین راز بر تو لحظهٔ دیگر کند ظهور: کە ئەم نهێنییەت ترووکەیەکی تر بۆ دەردەکەوێ. زان کوه نیکبخت چو بالا برآمدم: کە لەو کێوە بەخت چاکەوە سەر کەوتم. بنمود چون رواق فلك گنبدی ز دور: گومەزێکی وەکو هەیوانی ڕووناك لە دووررا بە دیار کەوت.

پرسیدم این رواق منوَّر ازان کیست؟ لێم پرسیم ئەم هەیوانە ڕووناکە ئی کێیە؟ بخ بخ بارك الله ازین جنَّت و قصور: بەهـ بەهـ لە گەورەیی خوا و لەم بەهەشت و کۆشك و تالارە؟ مانند قرص انور زرّین آفتاب می تافتی ز بام درش لمعه لمعه نور: ڕووناکی بە چریسکە چریسك لەسەربان و دەرکەوەی دەبریسکایەوە. گفتند این ضریحهٔ قطب ز اولیا است: گوتیان ئەم ئارامگایە قوتبێکە لە وەلییان. پیمود ساقی از لبش بادهٔ طهور: ساقی هەر لە عەزەڵەوە پیاڵەی پاکی بە پەیمانە داوەتێ. این مرقد حبیب خدا (شێخ نوریست): ئەمە ئارامگەی خۆشەویستی خوا، (شێخ نووری)یە. جسمش به خاك خفته و جان رفته در حضور: لەشی دە خاکدا نووستووە و گیانی بەرەو حوزووری خودا چووە. آیند فوج فوج ز بهر زیارتش: دەستە دەستە بۆ دیدەینی دێن. از آسمان ملائکه در صورت طیور: مەلائیکەت لە ئاسمانەوە دە شێوەی تەیر و تووان. سازد خدا به پایهٔ جمشید برترش: خوا لە سێبەری جەمشیدی بەرزتر کاتەوە. موری اگر به سایهٔ قصرش کند مرور: ئەگەر مێرووێك بە لای سێبەری تالاریدا تێ پەڕی. یا رب به جاه و حرمت این قطب اولیاء: خوایە بە جاهـ و حورمەتی ئەم قوتبی وەلییە. جرم (رضا) ببخش که فرمودهای انا الغفور: لە تاوانی (ڕەزا) ببوورە، کە خۆت فەرمووتە: هەر من لە گوناهان دەبوورم. روزی مکن دراین سفرش رنج و محنتی: قەت ڕۆژێك لەم سەفەرەیدا تووشی ئازار و مەینەتیی نەهێنی. باز آورش به شادی و آسایش و سروور: هەروا هەمیشە بە شادی و ئاسایش و کەیف خۆشییەوەی پێ بەسەر بەری.

٤٦

## در مدح محمد بگ جاف*

(پیتی) سین

غـرض از هـدیـه نـه درّاست وعـقـیـق و الـمـاس
غــرض الــفت بـــود و دوستــی و استــئــنـــاس
هـــدیـــه از جـــانـب جـــانـــانـــه اگـــر زهـــر بـــود
خـوشتـر آیـد بـهمـن از (فـیـه شفـاء لـلـنـاس)
هـدیـهای آمـده از دوست یـکـی پـوست پـنـیـر
پـوست مـوئـیـن چـو سرو صورت آغـا عـبـاس
بـامـدادان چـو فـرستـادهای از جـانب مـیـر
عسل رانـــیـــه آورد و پـــنـــیـــر بـلـبـاس
گـفـتـم آری چـو مـرا دیـد جـگـر خستـهای
عسلـم کـرد روان پـیـر مسیـحـا انـفـاس[١]
بـازگـفـتـم بـچـههـا مـاش ونـخـود مـی طـلـبند
نـکـنـد شهـد وعسل چـارهو درد افـلاس
شکـر نـعـمـت کـنـمـت بـنـدهء احسان تـوام
نـیك نـاسم نـه چـو (مـخـمـور افـنـدی) نسنـاس
مـن بـه غـیـر از تـو کسی را نشنـاسم مـخـدوم
تـو جـز ایـن بـنـدهء خـود نـیـز کسی را مشنـاس
مـن کـه در بـوتـهء اخـلاص تـو بـگـداخـتـهام
بـهکسان دیـگـرم مـی نـتـوان کـرد قـیـاس
مـن چـو مـخـمـور نـه از جـمـلـهء او بـاشم
کافگند بر سر یك پای دو صد مهره بهطاس
مـنـم آن شاعـر نـادر سخـن و نـادرهگـو
کـه بـههـر شعـر کـنـم تـعـبـیـه صد گـونـه جـنـاس
آن شکم گنده ولب گنده جناب (سکی ویر)[٢]
نـیست از صحـبت او فـائـده جـز وسواس

بــەهــمــە مــردم (رانــیــە) سلامــی زمـن است[٣]
جــز بـــە ابــراهــیــم افــنــدی پــدر الــخــنـــاس
سینە و گردن و پشت و شکم وساق و سرین
گــنــد و نـــاپـــاك و گــە آلــود و سراپـــا انــجـاس
قـــاضیــم نــیــز نــپــرسد مــگــر از یـــادش رفت
خورش از کشك دو سە سالە و پوشش ز پلاس
خـــرا اگـــر کسوت زربـــفت بـــپـــوشد پشم است
گـوز بـر ریش چـنـین قـاضی بشمـیـنـە لـبـاس
جـــاسم آغـــا کـــە دخـــانـــی نـــفـــرستـــاد مـــرا
بـــە تـــو بـــخشیــدمش ای داور جـــمشیـــد اساس
یـوقسە نـامـوسنـی بـن بـیـز گـبـی یـرطـار ایدم
قـاچـورردم آنـی تـا مـمـلـکت مـوش و سیـواس
شکـر نـاس ار نـکـنـم شکـر خـدا نـکـنـم[٤]
تـو ولـی الـنـعـمـی مـن کـنـمت شکـر و سپـاس

..............................................................

(١) علم: (ت).

(٢) (سکیویر) (ت).

(٣) نەتراست (ت).

(٤) ئیشارەتە بۆ فەرموودەی پەیامبەر (د): ″ من لم یشکر الناس لم یشکر اللە″.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)

وەك: ″ هر کە در کـوی خرابات مرا بار دهد

بە کمال و کرمش جان من إقرار دهد″

غرض از هدیە نە درّ است و عقیق و الماس: مەبەست لە دیاری، نە دوڕ و نە عەقیق و نە ئەڵماسە. غرض الفت بە دوستی و استئناس: مەبەست هۆگری و خۆشەویستی و دۆستایەتی و هاودەمییە. هدیە از جانب جانا بە اگر زهر بود: دیاری با لە لایەن یاری وەك جانانەوە زەهری هەلاهیلیش بێ. خوشتر آید بە من از (فیە شفاء للناس):

لە (شیفای خەڵکی تێدا هەیە) لە من خۆشتر دێ. هدیەای آمده از دوست یکی پوست پنیر: دیارییەکی پێستی پەنیرم لە دۆستێکەوە بۆ هاتووە. پۆست موئین چو سر و صورت آغا عبَّاس: پێستێکی موویین وەك سەر و سوورەتی عەباس ئاغا. بامدادان چو فرستادەای از جانب میر: کە سبەینانێك پەیکێك لە لایەن میرەوە ناردراو. عسل رانیە آورد و پنیر بلباس: هەنگوینی ڕانیە و پەنیری بڵباسی هێنا. گفتم آری چو مرا دید جگر خستەء هجر: گوتم بەڵێ، کە بە جەرگی ماندووی هیجرانەوەی دیتم. عسلم کرد روانە پیر مسیحا انفاس: پیری هەناسە وەك هەناسەی حەزرەتی مەسیح هەنگوینی بۆ ناردم. باز گفتم بچەها ماش و نخود می طلبند: گوتیشم زارۆکان داوای ماش و نۆك دەکەن. شکر نعمت کنمت بندەء إحسان توام: سپاسی نیعمەتت دەکەم، بەندەی چاکەی تۆم. نیك ناسم نە چو (مخمور أفندی) نسناس: ئەمن چاك ناسم، نەك وەکو (مەخموور ئەفەندی)ی سەگسار: بە هەموو جۆرە مەیموونێکیش هەر نەسناس دەگوترێ. هەروەها بە گۆریللایش دەگوترێ و بە پیاوی بەد و نەگریس و گەمژەش دەگوترێ. من بە غیر از تو کسی نشناسم مخدوم: ئەمن لە تۆ زێتر کەسێکی تر بە گەورە و خزمەت کردن پێویست نازانم. تو جز این بندەء خود نیز کسی را مشناس: ئەتۆش لەم بەندەیەی خۆت زێتر کەسێکی تر مەناسە. من کە در بوتەء إخلاص تو بگداختەام: ئەمن کە لە بۆتەی دڵسۆزیی تۆدا تواومەوە. بە کسان دیگر نتوان کرد قیاس: ناتواندرێ بە کەسێکی تر بپێورێم. من چو مخمور نە از جملەء اوباشم: ئەمن وەکو مەخموور لە بابەتی ئەو نیم. یا لە بابەتی ئەوباش و هەرچی و پەرچی نیم. کافگند بر سر یك پای دو صد مهرە بە طاس: کە دوو سەد مۆرە بە جارێ داوێتە تاسی نەردەوە، مەبەستی ئەوەیە کە وەکو ئەو قوماربازو کەڵەکچی نییە. منم آن شاعر نادر سخن و نادرەگو: منم ئەو شاعیرە قسە دەگمەن و دەگمەن وێژە. کە بەهر شعر کنم تعبیە صد گونە جناس: کە صەد جۆرە جیناس و تەورییە دە شیعران داوێم. آن شکم گندە و لب گندە جناب (سکی ویر): ئەو ورگ ئاوساو و لێو گەنیوە، کە جەنابی (کیر بدە بەرێ) یە. نیست از صحبت أو فائدە جز وسواس: لە هاودەمیی وی هیچ جۆرە سوودێك وەچەنگ ناکەوێ. بە همە مردم رانیە سلامی ز بندە است: لە منەوە سڵاو بۆ هەموو خەڵکی ڕانیە. جز بە ابراهیم أفندی پدر الخنَّاس: جگە لە ئەلخەنناسی باوی ئیبراهیم ئەفەندی. "الخنَّاس" واتە شەیتان. سینە و گردن و پشت وشکم و ساق سرین: سینە و مل و پشت و ورگ و بەلەك و پووز و سمت. گند و ناپاك و گە آلود و سراپا

انجاس: گەنیو و پۆخڵ و گوواوی و سەر تا پا پیس. قاضیم نیز نپرسد مگر از یادش رفت: قازیشم ناپرسێ مەگەر لە بیری کردووە. خورش از کشك دو سه ساله و پوشش ز پلاس: خور و خۆراکی لە کەشکی دوو سێ ساڵە و پۆشاکی لە پەڵاسە. خر اگر کسوت زربفت بپوشد پشم است: کەر ئەگەر بەرگی زێڕ بافت لە بەرکا، پەشمە. پەشم دوو مانای هەس: خوریش و عەیبیش دەگەیەنێ. وا دیارە ئەو قازییە هەمیشە بەرگی خوریی چڵکن و پڵکنی لەبەر کردووە.. گوز بر ریش چنین قاضی پشمینه لباس: تڕ بە ڕیشی قازیی بەرگ پەشمینی وا بێ. جاسم آغا که دخانی نفرستاد مرا: جاسم ئاغا کە تووتنێکی بۆ نەناردووین. به تو بخشیدمش ای داور جمشید اساس: هەجوم نەکرد، بە تۆم بەخشی، ئەی داوەری بنیچە جەمشید. یوقسه ناموسنی بن بیز گبی یرطار ایدم: دەنا ئەمن ناموسیم وەکوو شام بێزی دادەدڕی. قاچورردم آنی تا مملکت موش و سیواس: تا وڵاتی منووش و سێواسێم ڕاوەدوو دەنا. شکر ناس ار نکنم شکر خدا را نکنم: ئەگەر سپاسی خەڵك نەکەم، سپاسی خواش ناکەم. تو ولی النعمی من کنمت شکر و سپاس: تۆ وەلی نیعمەتی منی، سپاست دەکەم.

## ٤٧

## در این دیدار (رضا)را*

(پیتی) سین

ز رشحـــهء قـلـــمت در مشیـــمـــهء قــرطـــاس
نـتـیـجـههــاست بـهقـیـمت گرانـتـر از الـمـاس
صحـیـفـه مـعـجزه پیراست بسکـه چـون مـریـم(۱)
بـــه بـــرگـــرفـــتـــه مـــوالـــیـد عـیسوی انـفـــاس
رسیــده کـــار بـــه جـــای تـــرا امـــیـــن فـــیـضی
که جبرئیل امین خوانده است ز روی قیاس(۲)
هـــزار سال بــمـــانــی کـــه ایـــن عـــجب نـــبـود
بشر نـــیـــنـــد مـــگـــر خـــضر زنــده و الـــیـــاس
در ایـــن دیـــار (رضـا) را بـــه هـــرزه عـمـر گـذشت
بـــه جـــان رسیــده گـنـــاهش بـــه گـردن افـلاس

(١) (ح).

(٢) ئەم دوو دێڕە لە چاپی (ت).

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ

(مفاعیلن فعلاتن مفاعیلن فع لان)

وەك: " مـرا هـوای سحرگه پیـام یار آورد

نسیم بوی بهشتی ازان دیار آورد"

ز رشحهء قلمت در مشیمهء قرطاس: لە تەڕاوشی خامە لە ئاوەڵ منداڵی کاغەزاندا. نتیجەها بە قیمت گرانتر از ألماس: بەرهەم و نەتیژەگەلێك، بە بەها لە ئەڵماس گرانتر و بـە بـەهـاتـرە. صحیفـە معجزە پیراستـە بسکـە چـون مریم: لاپـەڕەیـەکـی زۆر جوان ڕازاندووەتەوە وەکو مریەم. بە برگرفتە موالید عیسوی أنفاس: لە دایکبووی هەناسە وەك هـەناسەی عیسای لە باوەش گرتووە. رسیدەکار بەجای تر أمین فیضی: کار بە ئـەندازەیـەك گـەیشتـووە. کـە جبـرئـیل أمـین خواندەاست زروی قیـاس: کـە حـەزرەتی جیبریلیش بە قیاس نێوی هەر بە "أمین" هاتووە. هزار سال بمانی کە این عجب نبود: ئەگەر هـەزار ساڵ بژی و بمێنی، ئەمە کارێکی لە خواسایی بەدەر نییە. بشر نبند مگر خضر زندە و الیاس: بە نموونە وەك ئەوەکەی خدری زیندە و ئیلیاس وایە، در این دیار (رضا) را بەهرزە عمر گذشت: بەشێ لە تەمەنی (ڕەزا) لەم وڵاتەدا، بە فیرۆ بەسەر چووە.

## ٤٨

## درمدح غوث گیلانی*

## (پیتی) شین

گلستـانـی کـە خـوانند آستـان غـوث گـیـلانش

زدە فـیض مـقـدَّس خیمـە در صحن خیـابـانش

مـطـاف شیـرمـردان طـریـقت کـعبـەء کـویش

سرگـردن فـرازان حـقـیـقت گـوی مـیـدانش

غـلام کـمـتـرینش را لـقب شد خـواجـەء أحـرار

بـەقـطب الـعـارفـین مشهور شد طفل دبستـانش

(بـهـای نقشبـندی) خـوشـهچـیـن خـرمـن جـودش
(شهاب سهروردی) کاسهلیس خوان احسانش
هـزاران (شمس تـبـریـزی) خـراب بـادهء عشقش
هزاران (پیر جامی) جرعه نوش بزم عرفانش
شهـنشاهــان طـفـیل و تـاجداران طوق درگردن
خـداونـدان اسیـر و شهـریـاران بـنـد فـرمـانش
(رضا) را هـمّـتـی شهبـاز لاهـوت آشیـان یـعنی
بـیـفـکـن اسـتـخـوانـی و سگ درگـاه خـودخـوانش

---

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیل مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: ″ شب تاریك و بیم موج و گردابی چنین هایل
کجـا دانـند حـــال مـــا سبکباران ساحلها″

گلستانی که خوانند آستان غوث گیلانش: گوڵستانێك که هاسانەی غەوسی گەیلانیی پێ دەڵێن. زده فیض مقدّس خیمه در صحن خیابانش: فەیز، لە خوا هەڵڕژانی پیرۆز، خێوەتی لە مەیدانی شاگامیدا هەڵداوە. مطاف شیر مردان طریقت کعبهء کویش: جێ بۆ دیدەنیی شێری مەردانی تەریقەت. کابەی کۆ و گەڕەکی وییە. سر گردن فرازان حقیقت گوی میدانش: سەری گەردن بڵندانی ڕاستی، گۆی مەیدانی وییە. غلام کمترینش را لقب شد خواجهء احرار: خولامی لە هەموان کەمترینی، نازناوی خواجەی ئازادانی دراوەتێ. بـە قـطب الـعـارفـیـن مشهـور شد طـفـل دبستـانش: مـنـداڵـی فـێرگـەی بـە قوتبولعاریفین، بە نەوەی عاریفان بوو بە نامێ و ناودار. شهاب سهروردی خراب بادهء عشقش: شەهابی سوورەوەردی پەرێشانی ئەشقی وییە. هزاران پیر جامی جرعه نوش بزم عرفانش: هەزارانی وەکوو پیری جامی مەی نۆشی بەزمی عیرفانی وییە. شهنشاهان طفیل و تاج داران طوق در گردن: شاهنشایان مشەخۆر و تاجداران مل بە تەوقەوەن. خداوندان اسیر و شهریاران بند فرمانش: خاوەن دەسەڵاتان دیل و خونکار و سوڵتانان دە گەوی فەرمانیدان. (رضا) را همّتی ای باز لاهوت آشیان یعنی: سا هیممەتێك بۆ (ڕەزا) هۆ بازی هێلانە خواوەندی. بیفکن استخوانی و سگ درگاه خود خوانش: هێسکێکی لۆ باوێ و بە سەگی دەرگای خۆتی وەخوێنە.

## ٤٩

### شیخ*

### (پیتی) شین

دو گز عمّامه، سەگز طیلسان و یك گز ریش(١)
دو صد مرید روان در رکابش از پس و پیش
ز بس فریفتەء صورتند اهل جهان(٢)
که ادّعای نبوّت کند رود از پیش
چە سحرها چە فسونها چە مکر و داستانها
که دیدەام من ازین صوفیان کافر کیش
یکی کلاه بلند بەقدر قامت عوج
نهادە بر زبر فرق نامبارك خویش(٣)
که شیخ مولویم مسلك وطریقت ما
نی است ودمبك ورقص وسماع وچرە وحشیش(٤)
یکی گرفتە بە کف حربەای چو آلت من
که از مشایخ رفاعیم زنندەء شیش
مشایخی که جهان را بدین دسیسە خورند
چە آن مشایخ و چە پشم خایەء درویش
پناه دە تو خدایا (رضا) ز مکر شیخ(٥)
بەظاهری در عبادت بەباطنی بنگ کیش(٦)

............................................................

(١) دو گز عمامە و سە گز و یك گز ریش: (م)، دوگز عمامە، سەگز طیلسان، یەگز ریش: (ت).

(٢) زبس فریفتەء صورتند: (م)، زبس فریفەء صورتند: (ت). اهل جهان همە: (م ، ت).

(٣) برزیر (م).

(٤)... سماع چرس وحشیش (ت)، ... سما اکل حشیش: (م). دومبك: (ت)، دمبك: (م).

(٥) زمکرو ریا: (ت)، زمکر شیخ: (م).

(٦) زعبادت: (ت)، درعبادت: (م).

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون مەحزووف

(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)

وەك: ″ خوشا دلـــی که مدام از پی نظر نرود

بـه هر درش که بـخوانند بی خبر نرود″

دو گز عمَّامه، سه گز طیلسان و یك گز ریش: دوو گەز مێزەر و سێ گەز تەیلەسان و گەزێ ڕیش. دو صد مرید روان در رکابش از پس و پیش: دوو سەد مرید لە ڕکێفیدا لەپاش و پێشەوەی. ز بس فریفتهء صورتند أهل جهان همه: خەڵکی دنیا سەرلەبەر فرە فریوخۆری ڕواڵەتن. که ادعای نبوت کند رود از پیش: کە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدا و لە پێشەوە دەڕوا. چه سحرها، چه فسونها، چه مکر و داستانها: ج سیحرێلێ، چ فسوونێلێ، چ داستانێلێ. که دیدەام من ازین صوفیان کافرکیش: کە لەم سۆفیە کافرمەزەبانەم دیتوون. یکی کلاه بلندی بقدر قامت عوج: یەکێ کڵاوێکی درێژی هێندەی بەژنی عووجی کوڕی عەلەق.. نهاده بر زیر فرق نامبارك خویش: بە تیلاکی سەری نامبارەکیینەوە ناوە. که شیخ مولویم مسلك و طریقت ما: کە شێخی مەولەویم و ڕێ و ڕێبازی ئێمە. نی است و دەمبك و رقص و سماع و چره و حشیش: نی و دمبك و سەما و گوێ لە ستران گرتن و بەستە چڕاندن و حەشیشەکێشان. یکی گرفته به کف حربەای چو آلت من: یەکێ قەمەیەکی وەکو ئامێرەکەی منی بە دەستەوە گرتووە. که از مشایخ رفاعیم زنندهء شیش: کە لە مەشایخی ریفاعیم و زەرگ لێدەر. مشایخی که جهان را بدین دسیسه خورند: مشایخێك کە دنیا بەم فڕ و فێڵە دەخۆن. چه آن مشایخ و چه پشم خایهء درویش: چ ئەو مشایخانە و چ گوڵك و مووی گونی دەروێش، هەرتك وەك یەك وان. پناه ده تو خدایا (رضا) ز مکر و ریا: خودایە (ڕەزا) لە مەکر و دووڕوویی. بەظاهری در عبادت باطن بنگ کیش: لە خوداپەرستیی بە ڕواڵەت و لە ژێرەوە بەنگ کێشی بیارێزە.

٥٠

## درمدح نقیب الأشراف سید مصطفی کاکه احمد شیخ*

(پیتی) فێ

دست خـیـال ازل خـرقــهء نـامـوس و عـفـاف

خـوش بـریـداست بــهبــالای نـقـیب الاشراف

یعنی نعم الخلف حضرت (کاك احمد شیخ)
آنکه با شیر زند پنجه به‌میدان مصاف
مصطفی نام و چراغ نسب مصطفوی
نطفهء هاشم و نقد کمر عبد مناف
مدّعی گو نزند لاف زهم چشمی او
تکیه بر جای بزرگان نتوان زد به گزاف
به‌زیارتگه آباء کرامش چه عجب
سر قدم ساخته آیند ملائك به‌طواف
ای ترا بندگی من، نه بامّید طمع
ندهم دست کرم تو به‌صد وجه کفاف
امتیاز از دیگران داده خدایت به سه چیز
همّت عالی و دست کرم و طینت صاف
تکیه بر مسند جدّت زن و اندیشه مکن
جز سرانگشت ندامت نگزد اهل خلاف
خصم را تیغ زبان من و شمشیر تو بس
وای ازان روز که آن هر دو براید ز غلاف
بشکافد دم شمشیر تواش مهرهء پشت
بگذرد نوك سنان منش از حقّهء ناف
کمترین جود تو ای زبدهء اولاد حسین
خرج ده سالهء دولت ز دولتخانهء جاف
تا همچو (بنی آکله) با (آل علی)
چرخ دربارهء ارباب هنر بی انصاف
باد اندام عدوّ تو به‌سجّیل قضا
(عصف مأکول لایلاف قریش ایلاف)
بندهات شیخ رضا را تو فراموش مکن[1]
ایکه دربارهء ارباب هنر با انصاف

(١) لە دیوانە چاپدراوەکەیدا نییە.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)

وەك: " هر کە درکـوی خرابــات مرا بـار دهد

بە کمال و کرمش جان من اقرار دهد"

دست خیَّال أزل خرقەء ناموس و عفاف: دەستی بەرگدرووی هەر بووەی پەلاسی ناموس و پاکیزەیی: خوش بریده است بەبالای نقیب الأشراف: جوانی بە بەژنی نەقیبی ئەشرافان بڕیوە. یعنی نعم الخلف حضرت (کاك أحمد شیخ): واتە: پاشینەی حەزرەتی (کاك ئەحمەدی شێخ)، کە شایستەی پەسن کردنە. آنکە با شیر زند پنجە بە میدان مصاف: ئەوەی کە لە مەیدانی شەڕدا دەگەڵ شێراندا پەنجە لە پەنجە دەدا. مصطفی نام و چراغ نسب مصطفوی: کە نێوی مستەفایە و چرای ڕەچەڵەکی بەرەی مستەفا. نطفەء هاشم و نقد کمر عبد مناف: نوتفەی هاشم و نەختینەی کەمەری عەبد مەنـاف. مـدَّعـی گـو نـزنـد لاف ز هـم چشمـه ای او: ئـەوەی لاف لـێ دەدا، لافـی هاوسەرچاوەییی ئەو لێ نەدا. تکیە بر جای بزرگان نتوان زد بە گزاف: خۆ بە پلە و پایەی مەزنانەوە هەڵاواسین هەر وا لە خۆڕا ناکرێ و لە توان بەدەرە. بە زیارتگە آباء کرامش چە عجب – سر قدم ساختە آیند ملائك بە طواف: سەیرنییە کە مەلایەکەت سەریان کردووە بە پێ و هاتوون بۆ دیدەنیی زیارەتگای باپیرانی خاوەند کەرەمی. ای ترا بندگی من نە بە آمِّید طمع: ئەی ئەوەی کە بەندەگیی من بۆ تۆ لە ڕووی تەماحەوە نییە. ندهم دست کرم تو بە صد وجە کفاف: ئەمن دەستی دەهەندەی تۆ بە صەد ڕزق و ڕۆزییەکی کە بەشم بکا نادەم. امتیاز از دیگران دادە خدایت بە سە چیز: خواوەند بە سێ شتانی زێدە ئەردەو و فەزڵ لە خەڵکی تر جوێ کردوویەوە. همَّت عالی و دست کرم و طینت صاف: هیممەت بڵندی و دەستی دەهەندەیی و هەشی پاك و خاوێن. تکیە بر مسند جدّت زن و اندیشە مکن: پشت بە پاڵپشتی باپیرەوەت دە و خەمت نەبێ. جز سرانگشت ندامت نگزە أهل خلاف: بەرەی لە ناکۆکی گەڕ لە سەرئەنگوست گەزین بەولاوە چییان بۆ نامێنیتەوە. خصم را تیغ زبان من و شمشیر تو بس: تیغی زمانی من و شمشێری تۆ بۆ دژمن بەسە. وای ازان روز کە هر دو برآیند ز غلاف: وای لەو ڕۆژەی کە ئەم هەردووە لە کالان دەرێن. بشکافد دم شمشیر تواش

مهرەء پشت: مەودای شیری تۆ مۆرەی پشتی بقەڵشێنێ. (ش)ەنە کە بۆ کێشی شیعر پەڕیوەتە پاش وشەی (تو). واتە (پشتش). بگذرد نوك سنان منش از حقّهء ناف: نووکە نێزەی من لە حوققەدانی نێوکی تێ پەڕێ. (ش)ەکە لەبەر ناچاریی کێشی شیعر خلیسکاوەتە پاش (من)ەوە، واتە: نافش. کمترین جود تو ای زبدهء أولاد حسین: کەمترین کەرەمی تۆ ئەی سەرتۆپی فرزندانی حوسەین. خەرج دە سالەء دولت ز دولتخانهء جاف: خەرجی دە ساڵەی دەوڵەت لە دەوڵەتخانەی جاف: تا همچو بنی آکله با آل علی: وەکو بەنی ئاکیلە دەگەڵ بەرەی عەلیدا نییە. چرخ دربارەء ارباب هنر بی انصاف: چەرخی گەردوون دەربارەی خاوەن هونەر، بێ وێژدانە. باد اندام عدوّ تو به سجّیل قضا: ئەندام دژمنت بەر سیجیلی قەزا کەوێ. (وشەی سیجیل بە مانای تۆپەڵە بەرد و قوڕە). بە عارەی کراوی فارسییە.. (عصف ماکول لایلاف قریشِ ایلاف): ببێ بەو خاشاکە کە لە سورەتی (لإیلاف)دا نێوی هاتووە.

## ٥١

## شیخین و شیر لا فتی*

(پیتی) فێ

شب چو خیزد کیر من بر دوش می گیرد لحاف
می نخسپد تا سحر چون زاهد اندر اعتکاف
همچو میل پهلوانان دائماً در گردش است
گاه می چسپد به زانو گاه می چسپد بەناف
می رود دائم چو افعی در دل سوراخها
میرود در هر مغار و می خزد در هر شکاف(١)
یعنی گر افتد به دستم سادەو سیمین سرین
کیر در سوراخ تنگش می سپوزم تا بەناف(٢)

---

(١) میشود در هر شکاف (نوسخە).

(٢) می سپردم: (ت)، در سپوزم (م).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش

بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″

شب چو خیزد کیر من بر دوش می گیرد لحاف: کە شەو ڕادەشکێ کیری من لێفە بە کۆڵەوە دەگرێ. می نخسبد تا سحر چون زاهدان در اعتکاف: وەك لە دنیا دەستبەرداران چۆن خۆ لە کونجی خەڵوەتدا قەتیس دەکەن و نانوون، ئەویش نانوێ. همچو پهلوانان دائما در گردش است: هەروەکو میلی پاڵەوانان هەمیشە لە گەشت و و گەڕاندایە. گاه می چسبد بە زانو گاه می چسپد بە ناف: جارێ لە چۆکم دەکەوێ و کاوێ خۆی بەنێوکەوە دەچەسپێنێ. می رود دائم چو أفعی در دل سوراخها: هەمیشە وەکو مار دەچێتە کون و کەلێنانەوە. می رود در هر مغار می خزد در هر شکاف: دەچێتە هەموو ئەشکەوتێکەوە و دەخزێتە هەموو قەڵشێکەوە. یعنی گر افتد بەدستم سادە و سیمین سرین: واتە ئەگەر لووسێکی سمت زیوینم دەست کەوێ. کیر در سوراخ تنگش می سپوزم تا بە ناف: کێرم لە نێو کونی تەسکیدا تا ناوکی دەبەم.

## ٥٢

## در مدح عبدالله پاشای رواندوز
## جد اسماعیل بگ زعیم مشهور*

(پیتی) لام

شاعری گنده طبع همچو جُعل

شعر او چون شعور او مختلّ

رفت پیش حکیم تا دهدش

شربتی از برای دفع علل

مسهلی داد و گفت این دارو

هفت بارت در آورد بەعمل

چون بخورد او چهار بار برید(١)

تاخت پیش حکیم و ساخت جدل

طعنە زد کای حکیم بی تمیز

فرق ناکردە ناقەرا ز جمل

سخـن هـفت و هشت مـی رانـدی
هـفت اکـنـون بـه چـهـار شد بـدل
گـفت الـبـتّـه مـخـالـف خـوردی
کـه بـه دار و ازان رسیـده خـلـل
گفت چـیـزی نـخـوردهام لـیکـن[۲]
بـودم انـدر خـیـال شعـر و غـزل
گـفت از شعـر ساخـتـی چـیـزی
گــفت آری شعــر مستــعـجـل
گفت برخوان، چو شعرهـا برخواند
گفت خـنـدان حـکـیم، کـای جَهِلْ
تـو عـمـل هـفت کـردهای، امـا
سه ز بــالا، چــهــار از اسفــل
شاعـری چـنـد هست مـی زیـبـنـد
کـاوری ایـن حـدیـثشان بـه مـثـل
نـیك و بـد را ز فـرقـه و شعـرا
نشنـاسد بـهغـیـر مـیـر اجـل
آنـکـه قـائـم مـقـام اربـیـل است
مــاه مــلك است و آفتـاب ملل[۳]
دم تـیـغش لـهـیب نـار جـحـیـم
کـف جـودش سحـاب کشت امـل
بـامـنش لـطف گر بـود چـه عجب
رغــبـت است آفـتـاب را بـه حـمـل
وصف او در سخـن نـمـی گـنـجـد
بـه کـه وصفش ادا کـنـم مُـجـمـل
تـا ابـد آن جـنـاب را یـارب
دستـگـیـری کـن ز لـطـف ازل

(١) چون نخورد (م).

(٢) چون نخورد (م).

(٣) آفتاب: (ت).

(*) كێش: بەحری خەفیف موسەددەس مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن مفاعلن فع لن)

وەك: ″ تا کی از عشق تو کشم خواری

تا کی از هــجر تــو کنم زاری″

شاعری گنده طبع همچو جُعل: شاعیرێکی میزاج بۆگەنی وەکو قالۆنچە. شعر او چون شعور او مختلّ: شیعری وەکو هۆشی شیرازەی شێواو. رفت پیش حکیم تا دهدش – شربتی از برای دفع علل: چووە پێش حەکیمێك تا دەرمانێکی بۆ لە کۆڵ کردنەوە ی نەخۆشییەکەی بداتێ. مسهلی داد که این دارو: دەرمانێکی زگچوونی دایێ. گوتی ئەم دەرمانە حەوت جارانت زگ دەچوێنێ. چون بخورد و چهار بار برید: کە خواردی چوار جار ڕیا و ئیدی بڕیی. تاخت پیش حکیم و ساخت جدل – طعنه زد کان حکیم بی تمیز: هەڵی کوتایە پێش حەکیمەکە دەستی بە مشتومڕ و تانووت و ڕەخنە لێ گرتن کرد. فرق ناکرده ناقه را ز جمل: هەی وشتری مێیینگە لە وشتری نێرە جوێ نەکەرەوە. سخن از هفت و هشت می راندی: قسەت لەمەڕ حەوت و هەشتان دەفەرموو. هفت اکنون به چار شد مبدل: ئێستا حەوت بوو بە چوار. گفت البتّه مخالف خوردی: گوتی هەڵبەت بە پێچەوانەوەت خواردووە. که به دارو ازان رسیده خلل: کێ بە دەرمان زیانی گەیشتووەتێ؟ گفت چیزی نخوردەام لیکن: گوتی هیچم نەخواردووە، بەڵام. بودم اندر خیال شعر و غزل: دە خەیاڵی شیعر و غەزەل گوتندا بووم. گفت از شعر ساختی چیزی: گوتی شتێکت لە شیعر هەڵکڕاند؟ گفت آری، سه شعر مستعجل: گوتی بەڵێ، سێ شیعری بە پەلە. گفت بر خوان، چو شعرها برخواند: گوتی دە وەیخوێنە، کە شیعرەکەی وەخوێند. گفت خندان حکیم کای جَهِلْ: حەکیمەکە بە پێکەنینەوە گوتی، هەی لە نەزان نەزانتر. تو عمل هفت کردەای اما: تۆ حەوت جارت زگ چووە بەڵام. سه آز بالا، چهار از آسفل: سێ لە سەرێڕا و چوار لە خوارێ. شاعری چند هست می زیبند: شاعیری فرە هەن کە شایانی ئەوەن. کاوری این حدیثشان به مثل: قسەیان بە نموونە بێنییەوە. نیك و بد را ز فرقهء شعرا، نشناسد به غیر میر آجل: وەلێ جگە لە

عیزرائیل کەس چاك و خراپیان لە گرۆی شاعیران هاوێر ناکا. آنکه قائم مقام اربیل است: ئەوەی کە قایمەقامی هەولێرە. ماه ملك است و آفتاب ملل: مانگی ملّك و دەوڵەت و خۆری میللەتانە. دم تیغش لهیب نار جحیم: مەودای تێخی بڵێسەی ئاوری دۆزەخە، کف جودش سحاب کشت أمل: دەست سەخاوەتی هەوری چاندنی هەویایە. وشەی "کشت" بە "گشت"یش نووسراوە. ئەم وشەیە. بە فارسییش هەر هەمان مانای هەس، تەنانەت لە زمانە هیندو – ئەورووپاییەکانیشدا، هەر بەم مانایە هاتووە، وەك، گشتاڵت، بەژەرمەنی و تۆتاڵ بە ئینگلیسی.. تیوریی گشتاڵت لە پەروەرشت ناسیدا، مەشهوورە ئەمە ئەگەر وشەکە "گشت" بێ، بەڵام ئەگەر کشت بێ، ئەوە مانایەکەی ئەوەیە کە دەستی سەخاوەتی هەوری ئاوات چاندنە... واتە هیچی لەدەست نابێتەوە... پێم وایە هەر ئەمەی مەبەستە. با منش گر لگف بود چه عجب: ئەگەر دەگەڵ مندا لوتفی هەبێ سەیر نییە. رغبتست آفتاب را به حمل: ئەدی نابینی خۆر حەزی لە پشکی کاوڕ هەس؟ مەبەست لە سەر و ساختی خۆر دەگەڵ پشکی کاوڕدا ئەوەیە کە خۆر دە یەکەم مانگی خۆرێدا دەکەوێتە پشکی کاوڕەوە. واتە لە مانگی "فروردین"ە واتە لە ۲۱ی مارتدا. یا شاعیر خۆی بە بەرخێکی بەسزمان چوواندووە، بۆ بەزە دادۆشینی مەمدووح. وصف او در سخن نمی گنجد: وەسفی وی لە چوارچێوەی قساندا جێی نابێتەوە. هێندە فرەوان و زۆرە قسە بەبەری تەسکە.. به که وصفش أدا کنم مجمل: چاك ئەوەیە وەصفی بە کورتی بکەم؛ چونکە قسە بەشی ناکا. تا أبد آن جناب را یا رب: هەتا هەتایە، خوایە. دستگیری کند لطف أزل: لوتفی ئەزەلییەت، کە خوا هەر خۆیەتی، دەستی بە بالایەوە بێ.

## ٥٣

### صدر اعظم*

(پیتی) میم

مـزن بـیـهـوده از فـضل و هـنـر ای یـار هـمـدم دم
که از فضل و هنر بهتر بود دینار و درهم هم
شود ایـام دولت بـا تـو چـون پـروانـه دشمـن رم
کـنـد هـنـگـام نکبت از تـو چون بیگـانـه محـرم رم

غذا مـی سازد از خـون جگـر هـرجـا هنـرمـنـدیست
نـصیب روبـه دائـم دنـبـهء چـرب است وضیـغم غم
بەهرجا شاعری خوش لهجهء شیرین زبان بینی
بـود اوضاع او چـون قـوهء گـفـتـار ابـکـم کـم
بـدیـن انـدك هـنـر کـزمـن خـدایش بـاز بستـانـد
فـراوان خـوردهام از دست ایـن دیـر مـطـلسم سم
کـدامین اهـل دانش در جـهـان دیـدی نشنـیـدی
کـه از اشك روان نـبـود بـرویش هـمـچـو شبـنـم نم
مـرا جـز مـرگ نـرهـانـد ز آسیب کـم اوضاعـی
نسازد بـر مـعـاشم چـیـزکـی گـر صدر اعـظـم ضم
پـنـاه مـلك ومـلت، صدر دولت، حـضرت عـالـی
که باقدر و جلالش کمتر است از ابن ملجم جم
زبس عـدلش طـریـق راستـی جـویـد عـجب نـبـود
رود از ابروی خوبان کجی و او راز زلف پرخم خم
نـدانـی گـفت مـدحش ای (رضا) دست دعـا بـردار
الـهـی بـحـرمت بـطـحـاء و آب چشمـهء زمـزم
چـو آیین کـلـیـم الـلـه زحکمش هـر کـه سر پـیـچـد
کند غرقش بود گر فی المثل عیسی ابن مریم یم

---

(*) کێش: بەحری هەزەج مەسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: " شب تاریك بیم موج و گردابی چنین هایل
کجا دانند حال ما سبکباران ساحلها "

مزن بیهوده از فضل و هنر ای یار همدم دم: ئەی یاری هاودەم، بێ سوود دەم لە فەزڵ و هونەر مەدە. که از فضل و هنر بهتر بود دینار و درهم هم: چونکە دینار و درهەم لە فەزڵ و هونەر چاترە... شود أیام دولت با تو چون پروانه دشمن رام: دژمن

بە درێژاییی سەڵتەنەتت وەك پەروانە ڕامت بێ. شاعیر پەسنکراوی بە چرا و دژمنی بە پەروانە چوواندووە. واتە پەروانە چۆن ئاشقی ڕووناکییە و لە تاو ئەوین خۆی پێدا دەدا، خوایە دژمنیش ئەوها ڕامت بێ و وەك پەروانە ئاشقت بێ و خۆیت لە بۆ بەخت کا.. دیارە تەڵەبی مەحاڵە.. کند هنگام نکبت از تو چون بیگانە محرم رم: لە کاتی نەهامەتی و گلۆڵە لێژبوونەوەدا، خودا بیانیت لێ بکا بە مەحرەم و ڕامت بێ. غذا می سازد از خون جگر هر جا هنرمندیست: لە هەرکوێیەك هونەرمەندێ هەبێ، لە خوێنی جەرگ خۆراك دروست دەکا. نصیب روبە دائم دنبەء چرب است و ضیغم غم: بەشی ڕێوی هەمیشە دووگی چەورە و بەشی شێر خەم و کەسەرە. بە هر جا شاعری خوش لهجەای شیرن زبان بینی: لە هەر کوێ شاعیرێکی زارپاراوی زوان شیرین دەبینی. بود أوضاع او چون قوّەء گفتار أبکم کم: حاڵی وی وەك وتاری هێز لاڵ بوو، لاڵە. بدین اندك هنر کزمن خدایش باز بستاند – فراوان خوردەام از دست این دیر مطلسم سم: بەم نەختە هونەرەوە دەك خودا بیبڕێ – زۆرم لە دەستی ئەم دنیا تەلیسماوییە ژەهر چەشت. کدامین أهل دانش در جهان دیدی نشیندی – کە از اشك روان نبود بە رویش همچو شبنم نم: کێهە خاوەن زانستێکت لە دنیادا دیت و نەتبیست – کە نمی لە فرمێسکی ڕەوانەوە وەك شەونم و خوناو بە ڕوخسارەوە نەبێ؟ مرا جز مرگ نرهاند ز آسیب کم أوضاعی: لە مەرگ بەولاوە چیی دیکە لە ئازار و گەزەنم ڕەها ناکا. نسازد بر معاشم چیزکی گر صدر أعظم ضم: ئەگەر سەرۆك وەزیران شتێکم بۆ نەهاوێتە سەر مووچەکەم. پناە ملك و ملّت، صدر دولت، حضرت عالی: پەنای مەملەکەت و میللەت، سەردەستەی دەوڵەت، حەزرەت پایە بڵند. کە با قدر و جلالش کمتر از ابن ملجم جم: کە لە چاو قەدر و شکۆی، جەمشید لە کوڕی مولجەم کەمتر. کوڕی مولجەم: ابن ملجم، عبدالرحمن کوڕی ملجم مرادی حمیری، لە خەواریجان و لە ڕێبازی خۆیدا زۆر دەمار ئەستوور بوو. دەگەڵ وەبرەك کوڕی عەبدوڵڵای تەهیمی و عەمری کوڕی بەکری سەعدی لە ماڵی کابە سوێندیان خوارد لە ڕۆژێکی دەستنیشان کراودا عەلیی کوڕی ئەبو تالیب (د . خ.) و موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و عەمری کوڕی عاسیان کوشت و وایان دەزانی بەم کارە کێشەی نێوان موسڵمانان لە بەین دەبەن. ئیبن ملجم ١٩ی ڕەمەزان، ساڵی ٤٠ك. مانگی، لە کاتی نوێژی سبەینێدا بە ئامانجی خۆ

گەیشت، پاش شەهید بوونی حەزرەتی عەلی (د . خ.) بە سزای خۆی گەیشت. ز بس عدلش طریق راستی جوید عجب نبود: لەبەر زۆر عادڵیی ئەگەر پەیجۆری ڕێگای ڕاستی بوو بێ، سەیر نییە. رود از ابروی خوبان کچی و از زلف پرخم خم: کەچی و خواری لە ڕوخساری جوانان لادەچێ و پێچ و لوول لە زلفی پڕ پێچ و لوول، گرێ و پێچ و لوول نامێنێ. ئەم جۆرە هونەرە لە بەدیعدا حوسنی تەعلیلی پێ دەگوترێ. خزمایەتیی هەردوو مانایەکە لەوەدایە کە عەداڵەت پەروەری دەبێتە هۆی ئەوە کە کەچی و خواری لە ڕێگای هەقدا هەتا هەتایە هەر نامێنێتەوە، هەروەك ڕوخساری جوانان با کەم و کووڕییەکیشی تێدا بێ، زلف با پێچ و لوولیشی تێدابێ بەڵام هەر وا نامێنێتەوە، مشتوماڵ دەکرێ و باری جوانیی خۆی دەگرێتەوە. ندانی گفت مدحش ای (رضا) دست دعا بردار: ڕەزا، ئەگەر نازانی پەسنی بدەی، دەستی دوعا بڵند کە. الهی بحرمت بطحاء و آب چشمەء زمزم – چو آيين كليم اللّه ز حكمش هركه سر پيچد – كند غرقش بود گر فی المثل عیسی بن مریم یم: بێژە: خوایە، بۆ حورمەتی خاکی مەککە و ئاوی زەمزەم وەکو ئاینی حەزرەتی مووسا هەر کەسێ سەرپێچی لە فەرمانی دەکا دەریا نوقمی کا، هەروەك بە مەسەل دەگوترێ با عیسای کوڕی مریەمیش بێ.

## ٥٤

## قدّ موزون

(پیتی) میم

به گلشن قد موزون ترا تایاد می کردم[1]
خیابان تا خیابان سرو را آزاد می کردم
ندانستم گذار شانه بر زلف تو می افتد
وگرنه تا قیامت خدمت شمشاد می کردم
اگر يك تار مو كم می شد از زلف پريشانت
به زخم شانه ای در ناخن استاد می کردم
بەهر صحرا كه می ديدم بدام افتاده آهويی
فدای چشم تو می گفتم و آزاد می کردم

نشستم همچو مجنون بر سر بازار رسوایی
ترا با مدَّعی می دیدم و فریاد می کردم
فریب خویش می دادم که اینك یار می آید
بهر آواز پای خاطر خود شاد می کردم

---

(١) مەلا جەمیلی رۆژبەیانی لە ٩/ ٢/ ١٩٩٢دا ئەم چەند بەیتەی بۆ ناردم، دەڵێ لە کەشکۆڵەکەی بەهائوودین ئەفەندیدا نووسراون و ئی شێخ ڕەزان. خودا کاری راست کا...

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: " همه کارم به خودکامی به بدنامی کشید آخر
نهان کی ماند آن رازی کزو سازند محفلها"

به گلشن قدّ موزون ترا نایاد می کردم: بە باخچە و گوڵزاراندا دەگەڕام، تا بە ژنی شووش و ڕێکوپێکی تو وەبیر بێرمەوە. خیابان تا خیابان سر و را آزاد می کردم، شەقام بە ئەقام بە شەقام دەرۆیشتم، هەرچی دار سەروێکم دەدیت، وازم لێ دێنا. ندانستم گذار شانه بر زلف تو می افتد: نەمزانی کە شانە بە زلفی تۆدا ڕەت دەبێ. و گرنه تا قیامت خدمت شمشاد می کردم. دەنا تا ڕۆژی قیامەتێ خزمەتی داری شمشادم دەکرد. اگر یك تار موکم می شد از زلف پریشانت: ئەگەر تاڵێ موو لە زلفی پەرێشانت کەم دەبووەوە. بە زخم شانەای در ناخن استاد می کردم: بە برینی شانە دەم کر بە برینی "موو" لە نینۆکی "مشاطە"، وەستای خەت و میل کێشدا. بهر صحرا که می دیدم بدام افتاد آهویی: لە هەر بیابانێکدا مامزێکم دەدیت، بە داوەوە بووگە. فدای چشم تو می گفتم و آزاد می کردم: دەمگوت بە گوریی چاوی تۆ بێ و ئازادم دەکرد. نشستم همچو مجنون بر سر بازار رسوایی: وەك شێت، یا وەك مەجنوونی لەیلا، لە بازاڕی ڕسواییدا دام کوتا. تۆم دەگەڵ موددەعی، خەسم، نە یاردا دەدیت و و هاوارم دەکرد. فریب خویش می دادم که اینك یار می آید: فریوی خۆم دەدا، کە ئەمێستاکە یار دێ. بەهەر آواز پای خاطر خود شاید می کردم: بە ترپەی هەر پێیەك دڵی خۆم شاد دەکرد. ئەی ڕەزا ئەگەر ئاواتی عاشق بە هەوڵ و تێکۆشان بوایە، ئەن ئامادە بووم هێندەی سەد فەرهاد تێ بکۆشم من پێم وا نییە کە ئەم شیعرە ئی ڕەزا بێ.

## ٥٥

### کی بود یارب*

(پیتی) میم

کـی بـود یـارب طـواف کـعبـه و زمـزم کنم
بــعــد از ان رو در مــزار سیّــد عـــالـم کــنـم
روی خـود در سایـهء پـای رسول اللـه نـهـم
تـا غـبـار مـقـدمش بـر دیـدهء خـود جـا کنم
دست حـــاجت بـــرگشایـــم ازبـــر درگـــهش
ایـن دل مـجـروحـرا مـن زان دوا مرهـم کنـم
یـا رسول اللـه بـحـالـم گـوشهء چشمـی فـن
تـا شوم قربـان تو خودرا خلاص از غم کنم
سرفـــرازا از فـــراق روی تـــو در مـــاتمم
وعدهء وصل (رضا) ده ترك اين سودا کنم

.................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: " دو شرط مردان نیست در دل عشق جانان داشتن

پس دل اندر بند وصل و بند هجران داشتن"

کی بود یا رب طواف کعبه و زمزم کنم: کەی بێ خوایە بە دەوری کابە و زەمزەمدا بسووڕێمەوە. بعد ازان رو در مزار سیّد عالم کنم: لە پاشان ڕوو لە زیارەتگای گەورەی جیهان کەم. روی خود در سایهء پاك رسول اللّه نهم: ڕووی خۆم بخەمە سایەی پاکی رەسوولوڵڵا. تا غبار مقدمش بر دیدهء خود جا کنم: تا گەردی جێ پێی لەسەر دیدەم جێ بکەمەوە. دست حاجت بر گشایم از دعا بر درگهش: لە پێش دەرکەی دەستی دواعا بکەمەوە. این دل مجروح را من زان دوا مرهم کنم: ئەم دڵە برینداره لەو دەرمانە چارەسەر کەم. یا رسول اللّـه بـه حالم گوشهء چشمی فکن: یا ڕەسولەڵڵا گۆشە نیگایەکی چاوم تێ کە. تا شوم قوربان تو خودرا خلاص از غم کنم: تا ببم بە گوریی تۆ و خۆم لە خەم ڕزگار کەم. سرفرازا، از فراق روی تو در ماتمم: ئەی سەرفراز، من

لە جودایيی ڕوخساری تۆ لە ماتەمدام. وعدەء وصل (رضا) دە ترك این سودا کنم: بەڵێنی بەیەك گەیشتنم دەبێ، تاکو واز لەم سەودایە بێرم.

## ٥٦

### برای امین فیضی*

(پیتی) نوون

آنچنانم ز هجر کاکە امین
کە ندانم یساررا ز یمین
آن کند بخت قطّ نبینم یارا[١]
تا زنم خندە بر زمان و زمین
چند ریزم بیاد روی تو اشك
چند باشم ز دوریت غمگین
تا غمی را بەحیلە چارە کنم
دیگری سر برآورد زکمین
مستم از جام بادەء فیضت
چون مسیحا ز فیض روح آمین[٢]
سالهای دراز باقی باد
بەسلامت امین ما آمین[٣]

---

(١) کی کند بخت (ج).

(٢) زروح فیض امین (ت).

(٣) خاطرت شادباد امین فیض زانکە دریای دانش و دین است.

(*) کێش: بەحری خەفیف موسەددەس مەخبوون مەحزووف
(فاعلاتن مفاعلن فعلن)
وەك: " أی غمت مرغ آشیانەء دل
زلف و خال تو دام و داندەء دل"

آنچنانم ز هجر کاکە أمین: لە تاو دووری و لێکجودایيی کاکە ئەمین وام بەسەر

هاتووه. که ندانم یسارړا زیمین: که چەپ لە ڕاست جویٚ نەکەمەوە. آن کند بخت قطّ نبینم یار: بەخت کارێکم دەگەڵدا بکا کە هەرگیز یار نەبینم. تا زنم خنده بر زمان و زمین: تا بە زەمین و زەمان پڕ بە دنیا بکەنم. چند ریزم به یاد روی تو اشك – چند باشم ز دوریت غمگین: تا چەند لە دووریت هەروا خەمگین بمێنمەوە. چەند فرمێسکێك بە یادی ڕووی تۆوە بڕێژم. تا غمی را به حیله چاره کنم: تا خەمێك بە فێڵ چارەسەر کەم. دیگری سر بر آورم ز کمین: ئەوجا سەر لە بۆسە دەربێنم. مستم از جام بادهٔ فیضت: لە جامی پیاڵەی فەیزت مەستم. چون مسیحا ز فیض روح فیضی أمین: وەك حەزرەتی مەسیح کە مەستی ڕۆحی فەیزی خودا بوو.. سالهای دراز باقی باد – به سلامت أمین ما آمین: خوایە ساڵهای ساڵی درێژ ئەمینی ئێمە سەلامەت بیٚ، آمین.

## ٥٧

## در مدح ناظم بگ*

(پیتی) نوون

بـکـار آرد حـکـیـم مـصلـحت بین
گـهـی داروی تـلـخ و گـاه شیـریـن
بمحــروران نـبـایـد انـگـبین داد
نسازد بـــا مـــزاج گـــرم تسخین
مـیـاور شربت گـلـقـنـد و بـادام
پـی صفـرا مـزاجـان گرچـه زهـر است
بـــود (عین الشفـــا) حب السلاطین
چـو بـیـنـی خـون فـاسد در دمـاغش
فـــرو بـــرد قـــفـــایش نشتـــر کین
ز خـیـل شاعـران مـن هـم حکـیـمـم
گـهـی گـویـم نـکـویـانـرا ستـایش
هـمـی خـوانم بـدانـرا لـعن نـفـریـن
بـکـــام دوستـــان ریـــزم تـــبـــرزد
زنم بـر فـرق بـدخـواهـان تـبـرزیـن

کــریمان را دهـــانم کـــوزهء شهــد
لـــئـــیـــمـــان را زبـــانم تـــیـــغ رویین
مــــعـــــاذ الـــلـــــه زبـــــان آتشینم
(جـعـلـنـاهـا رجـومـا لـلشیـاطین)
ستـــایش راست نـــاظـــم بگ سزاوار
نـــظـــام مـــلك ومـــلت (نـــاصردیـــن)
جـهـان مـحـتـاج رایش زانکـه دارد
دل روشنـــتـــر از جـــام جـــهـــان بین
بـــیـــا روزی تماشا کـــن سواریش
بـــدوش اشقـــر انـــدر خـــانـــهء زیـــن
گـــــرفت آوازهء عـــدلش جـــهـــانـــرا
ز مــــــرز روم تــــــا دروازهء چین
چـــو بـــانگ ساز مـــی آید بگوشش
بـــرزم انـــدر خـــروش نـــای زریـــن
کنـد بـر فـرق مـحتـاجـان گهر پـاش
ز ابـــر رحـــمت از بـــالا بـــه پـــایین
نـــگـــهـــبـــان سریـــر شهـــریـــاران
بـلـی شهـرا نـگـهـبـان است فـرزیـن
عـروس فـکـر بـکـرم را بـخـواهـد
شبـــی در بـــرکشد تـــاداده کـــابین
ازیـن مـدحـم غـرض خشنودی اوست
بـــود آری دعــــا از بــــهـــــر آمین
اگـر خـواهـی بـچشم خـویش بـیـنـی
روان بـــربـــاد صرصر کـــوه تمکین
خـــداونـــدا بـــحـــق نـــور طـــه
خـــداونـــدا بـــجـــاه آل یـــــاسین

بــتـــابــد کــوکب جــاه و جــلالش
بــعــالــم تــا بــتــابــد مــاه پــرویــن

.............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەحزووف
(مفاعیلن مفاعیلن فعولن)
وەك: " حدیث جــان بجــز جانــان نداند
که جز جانان کسی از جان نداند"

بە کا آرد حکیم مصلحت بین – گهی داروی تلخ و گاه شیرین: بژیشکی مەسلەحەت بین – جارێ دەرمانی تاڵ و جارێ شیرین بەکار دێنێ. بە محروران نباید أنگبین داد: نابێ بە وانەی پلەی گەرمییان بەرز بوویێتەوە هەنگوین بدرێ. پی صفرا مزاجان گر چە زهر است – بود عین الشفا حبُّ السَّلاطین: حەببوسسەلاتین، گەرچی زەهرە بەڵام بۆ ئەوانەی میزاجیان سەفراوییە دەبێتە شفا. چو بینی خون فاسد در دماغش: کە خوێنی تێکچووی لە کەپوویدا دیت. فروبرد در قفایش نشتر کین: نەشتەری رکی لە مێشکی بردە ژوور. ز خیل شاعران من هم حکیمم: ئەمنیش لە نێو کۆڕی شاعیراندا بژیشکم. گهی گویم هجا و گاه تحسین: جارێ فڕ داوێم و کاوێ مەدح دەکەم. همی گویم نکویان را ستایش: بەڵام لە بۆ چاکان مەدح دەڵێم. همی خوانم بدان را لعن و نفرین: هەروەها لەعنەت و نەفرینیش لەبەدکاران دەکەم. بکام دوستان ریزم تبرزد: نوقڵی سپی بە مرادی دۆستاندا دەڕێژم. زنم بر فرق بدخواهان تبرزین: تەورزین بە تەپڵی سەری بەدخوایاندا دەدەم. کریمان را دهان کوزء شهد: زارم لە بۆ دەهەندە و دڵاوایان گۆزەی هەنگوینە. لئیمان را زبانم تیغ رویین: زمانم لە بۆ ناکەسبەچە و بەدنژادان تێخی بڕا و ئاسن. وشەی رویین، لە "روی" لە "رودیك"ی پەهلەوی ڕا کەوتووەتەوە. ئەمە فلزێکە بە ڕەنگی مشکی ئاماڵ شین، دەفر و ئامان و ئیربارانی لێ ساز دەکرێن. ژمارەی ئاتۆمیی وی ۳۰ی و کێشی وی ۳۸/ ٦٥. ئەگەر "رو" دەگەڵ"مس"دا تێکەڵ کرێ "برنج" (توج)ی لێ دێتە گۆڕێ و ئەگەر دەگەڵ ئاسندا تێکەڵ کرێ زوێڵی ناسکی حەڵەبی لێ پەیدا دەبێ. مەرتاڵێکی سەختە. معاذ اللّٰه زبان آتشینم: پەنا بەخوا زمانی ئاگرینم ئەو ئاتەش پارە ئەستێرانەیە کە شەیتانیان پێ ڕەجم دەکرێن. ستایشراست ناظم بگ سزاوار: نازم بەگ شایانی مەدح و ستایشە. نظام ملك و ملت (ناصردین): پێرۆی مەملەکەت و ئاین لە سای وییەوە

سەرکەوتووە. جهان محتاج رایش زانکه دارد– دل روشن تر از جام جهان بین: جیهان پێویستی بە ڕا و تەگبیری وییە؛ چونکە دڵی لە جامی جیهان بین ڕۆشنتری هەس. بیا رۆزی تماشا کن سواریش: ڕۆژێ وەرە بنوارە سوارچاکیی وی. بە دوش أشقر اندر خانەء زین: کە لە خانەی زیندا بەسەر پشتی ئەسپی سورخنەوەیە. گرفت آوازەء عدلش جهان را – ز مرز روم تا دروازەء چین: ناووبانگ و ئاوازەی لە کەوشەن و مەرزی ڕۆمەوە تا چین جیهانی گرتەوە. چو بانگ ساز می آید بە گوشش– بەرزم اندر خروش نای زرین – کند بر فرق محتاجان زر پاش: هەرکە دەنگی ساز و موزیکی بەر گوێ دەکەوێ و دەکەوێتە جۆش و خرۆشی ڕەزمەوە – زابر رحمت از بالا بە پایین: زێڕان لە هەوری ڕەحمەتەوە بە سەر سەری موحتاجاندا دەپرژێنێ، هەڵدەدا. نگهبان سریر شهریاران – بلی شە را نگهبان است فرزین: پاسەوانی تەختی پادشایان بۆ شا لە بۆ چاوێری وەك مۆرەی وەزیری شەترەنج وایە. عروسی بکر فکرم را بخواهد – شبی در بر کشم تا دادە کابین: بە ئاواتەوەم بووکی نەسمراوی بیرم بیەوێ، شەوێك لە باوەش بگرێ، تا مارەییی لەبۆ دابین کەم. واتە: ئاواتخوازم بووکی نەسمراوی بیرم شەوێك لە شەوان دە ئامێز بگرێ، تا مارەییی بدەم. بیرم بەکار کەوێ و خەیاڵم ببزوێ شیعرێکی مەدحی بۆ بڵێم. ازین مدحم غرض خوشنودی اوست: مەبەست لەم مەدحەم دڵخۆشکردنی ئەوە. بود آری دعا از بهر آمین: بەڵێ مەبەست لە دوعا ئامینە، واتە: بەجێبەجێبوونی دوعایە. اگر خواهی بە چشم خویش بینی: ئەگەر دەتەوێ بەچاوی خۆتی ببینی کێوی وەقار و پایەداری لە بەر بای سەختدا ڕەوان و لەسەرەخۆیە. واتە مەمدووح بە هیچ شتێ نابزوێ و تێك ناچێ. خداوندا بە حقّ نور طه: خودایە بە حەققی نووری تاها، کە پێغەمبەری خۆشەویستە. بتابد کوکب و جاه و جلالش – بە عالم تا بتابد ماه و پروین: هەتا مانگ و ئەستێرەی پەروین لە درەوشانەوەدایە. بتابد کوکب وجاه و جلالش: ئەستێرەی جاه و شکۆی بەسەر دنیادا هەر بدرەوشێتەوە.

## (۵۸)
## در ستایش مغفور له پرنس مصطفی فاضل پاشا بن محمد علی پاشای مصری در هنگامی که ناظر مالیهء دولت عثمانی بود*

(پیتی) نوون

مـرا بـه هـیـچ نـیـاسید این دل مـحـزون
مـگـر بـطـلـعت زیـبـا و قـامت مـوزون
گـهـی بـه پستـهء خـنـدان دلـبـری مـائـل
گـهـی بـه نـرگس فـتّـان شاهـد مـفـتـون
مـن آن قـلـنـدر آزاده مشربم کـه قـلـم
کشیـده بـر بـد و نـیـکـم جـهـان بـوقـلـمـون
گـر بـه آب   شوی خـدایـا جـریـدهء اخـبـار
کـه صرفـه‌ای نـبـرم زیـن فسانـه و افسون
بـه بـزم عشق مـگـو حـدیث مـهـر و وفـا
مـرا بـکـار نـیـایـد قـرال (نـاپـلـیـون)[۱]
مـر ازان چـه کـه پـیـروز گشت بسمـارك[۲]
مرا از ان چه که پامال گشت (ماکماهون)[۳]
کـدام خـار و خسم بـهـره از غـنـائم یـونـان[٤]
کـدام شال نـصـیـبـم زغـارت (شالـون)[۵]
بـجـز حـکـایت شیـریـن مـپـرس از (فـرهـاد)
بـجـز فسانـهء (لـیـلـی) مـجـوی از (مـجـنـون)
مـرا بـدیـن سر شوریـده بـا جـریـده چـه کـار
بـیـار ساقـی گـل چـهـره بـادهء گـلـگـون
مـی‌ای کـه روح رسانـد بـعـالـم وحـدت
مـی‌ای کـه راه نمایـد بـحـضرت بـی چـون
مـی‌ای کـه شبـهـه زدایـد ز رمـز قـال وقـیـل
(مـی‌ای کـه پـرده بـرآرد ز رمـز قـالـوا بـلـی)

مـی‌ای کـه پـرده گشایـد ز بـزم کـن فـیـکـون
مـی‌ای کـه گـر گـذرد بـر مشام آبستن
فـتـد بـه مـغـز جـنین در مشیمـه شور جـنون(۶)
کـه تـا بـیـاری آن عـنـدلـیب نـاطـقـه‌ام
یـکـی قـصیـده سرایـد چـو گـوهـر مـکـنـون
بمدح نـاظـر مـالـیـه مـصطـفـی پـاشا
مشیـر مـعـدلت آیین و مـرحـمت قـانـون(۷)
هـنـروری کـه بـه‌دورش ممالك اسلام
چـنـان شده است چـو یـونـان بـعـهـد افـلاطـون
خـجسته رای وزیـری کـه ساعـد هـنـرش
بـبـزم و رزم چـو آیـد زآستین بـیـرون
بـدشمـنـان بـنـمـایـد شجـاعت و قـهـرش(۸)
بـدوستـان بـفشانـد خـزانـهٔ قـارون(۹)
بـبین بـزیـر رکـابش سمـنـد صـاعـقـه‌رو(۱۰)
بـبین بـدست نـوالش پـرنـد آذرگون
کـه تـا مشاهـده بـیـنـی هـزبـر ثـعـبـان
کـه تـا مـعـایـنـه بـیـنـی جـحـیـم در جـیـحـون
نسیـم گـلشن مـهـرش اگـر و زد نـیسان(۱۱)
سمـوم آتش قـهـرش اگـر جـهـد کـانـون(۱۲)
بـبـاغ لالـهٔ نشکـفـتـه را بـریـزد بـرگ
بـبـاغ لالـهٔ افسرده را بـجـوشد خـون
کـفش پـیـالـه‌ای از بـادهٔ کـرم سرشار
دلش سفـیـنـه‌ای از گـنـج مـعـرفت مشحـون
یـکـی فـقـیـر بـود بـا سخـای او مـلـیـار(۱۳)
یـکـی پشیـز بـود بـاعـطـای او مـلـیـون
ایـا بـلـنـد جـنـابـا، وزیـر آصـف رای
بـه یمن اخـتـر مسعـود وطـالـع مـیـمـون(۱۴)

یــکـــی بــرای خــدا تــیــغ انــتــقـــام بــکش
بـــخـــواه کـــیـــنـــهء مـــن از زمـــانـــهء وارون
هــمــیشه تــا بــجــهــان خـلـق داستــان دانــنـد
بـــعـــدل داد بـــود، عـــمـــر دولـــتت افـــزون(١٥)

..............................................................

(١) ئەم ناپلیۆنە ناپلیۆنی سێیەمە کە پاشای فەرەنسا بوو و لە شەڕی ١٨٧٠ داو لەم شەڕەدا بە دیل گیرا. مرا بە چە کار مردم قرال ناپلیون (م)، مرا بە کار نیاید قرال ناپلیون (ت).

(٢) مەشهورترین سیاسی جیهانە، ماوەیی راوێژیاری سەرەك وەزیرانی ئەڵمانیا بوو. لە سەردەمی ئەودا شەڕی ساڵی ١٨٧٠ جاڕدرا لەم شەڕەدا فەرەنسا شکا.

(٣) ماکماهۆن سەرەك وەزیرانی فەرەنسا و سەرداری لەشکر بوو.

(٤) خاروخسم. (م) خاروخسم: (ت). کدام بهره مرا (ح.).

(٥) شالون: جەنگ گاهی ئەم شەڕەیە.

(٦) فتد بمغز جنیه در مشیمهء شور وخون: (م)، فتد بمغز چنین در مشیمهء.....: (ت).

(٧) ... ئایین مرحمت قانون (ت)... ئایین ومرحمت قانون: (م).

(٨) بنماید: (ت)، نماید: (م).

(٩) بیفشاند: (م)، بفشاند (ت).

(١٠) سمند صاعقەرو: (ت)، سمندر صاعقی: (م).

(١١) اگر جهد نیسان: (م)، اگر وزد نیسان (ت).

(١٢) اگر وزد کانون (م)، اگر جهد کانون (ت).

(١٣) فقیر: (ت)، نقره: (م).

(١٤) اشتر: (م)، اختر: (ت).

(١٥) داد کند: (ت، م).

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)
وەك: ″ دلا ز قـــید حریـــفان بـــی خرد بگـریز
تو مرنج زیرکی از دام دیو و دد بگریز″
مرا بە هیچ نیاساید این دل محزون: ئەم دڵە خەمگینەی من بە هیچ ئارام نابێ. مگر

بە طلعت زیبا و قامت موزون: مەگەر بە هەڵاتنی ڕوخساری جوانی وەکوو ڕۆژی و بەژنی شووش و ڕێکی وی: گهی بە پستەء خندان دلبری ماهر: جارێ بە لێوی وەکوو بستەی خەندانی دلبەری لە نوازشتدا بە مەهارەت و دەستوبرد: گهی بە نرگس فتّان شاهد مفتون: جارێ بە چاوی وەك نرگسی ئاژاوە هەڵایسێنی مەحبووبی دڵ بە جوانیی ئاشووب هەڵایسێن. من آن قلندر آزادە مشربم کە قلم – کشیدە بر بد و نیك جهان بوقلمون: کە قەڵەمی بە سەر خراپ و چاکی جیهانی وەك بۆقلەموونداکێشاوە. بە آن شوی خدایا جریدەء أخبار: خودایە ڕۆژنامەی هەواڵان بە ئاو بشۆوە. کە صرفەای نبرم زین فسانە و افسون: چونکە هیچ سوودێك لەم ئەفسانە و پڕوپووچ و ئەفسوون و جادووگەرییە وەرناگرم. بە بزم عشق مگر جز حدیث مهر وفا – مرا بە کار نیاید قرال ناپلیون: ئەمن لە بەزمی ئەویندا لە قسە و باسی میهر و وەفا بەولاوە، قراڵ ناپلیۆنم بە کار نایە: مرا ازان چە کە پیروز گشت بسمارك: بە من چی کە بسمارك سەرکەوت. مرا ازان چە کە پامال گشت ماکماهون: بە من چی ماکماهۆن پێخوست بوو. کدام خار وخسم بهرە از غنائم یونان: ئەمن چ پووش و پەڵاشێکم لە تالانیی یۆنان بەهرە پێ گەیشت. کدام شال نصیبم غارت شالون: کێهە شاڵم بەرکەوت لە چەپاوڵ و تالانیی شالۆن. بە جز حکایت (شیرین) مپرس از (فرهاد): لە داستانی (شیرین) بەولاوە چ لە (فەرهاد) مەپرسە. بە جز فسانەء (لیلی) مجوی از (مجنون): جگە لە ئەفسانەی (لەیلا) هیچ لە (مەجنون) مەپرسە. مرا بدین سر شوریدە با جریدە چە کار: من بەم سەرە هەراسان و ورووژاوە چ کارم بە ڕۆژنامەوە هەس. بیار ساقی گل چهرە بادەء گلگون: مەیگێڕ سا بێرە بادەی سووری گوڵ ڕوخسار. می کە روح رساند بە عالم وحدت: مەی بێنە، کە ڕۆح دەگەیەنێتە جیهانی یەکایەتی. می کە راه نماید بە حضرت بی چون: مەی کە ڕێ بەرەو حەزرەتی بێ چۆن و چییە نیشان دەدا.می کە شبهە زداید ز رمز قال و قیل: مەی کە شوبهە و گومانی نما و چەڵتە چەڵت خاوێن دەکاتەوە. می کە پردە گشاید ز بزم کن فیکون: مەی کە پەردە لە ڕووی "ببە و دەبێ" هەڵدەماڵێ. می کە گر گذرد بر مشام آبستن – فتد بە مغز چون در مشیمە شور جنون: مەی کە گەر بێت و بە لووتی ئاوسدا بگەڕێ. شۆڕشی شەیدایی بە گیانی پسدا، لە پسداندا دەکا. کە تا بیاری آن عندلیب ناطقەام: کە بە یارمەتیی ئەو بوڵبوڵە قسەکەرەم. یکی قصیدە سرایم چو گوهر مکنون: چامەیەك بچڕم وەك گەوهەری شاراوە. بە مدح ناظر مالیە مصطفی پاشا: لە مەدحی وەزیری دارایی، مستەفا پاشا.

مشیر معدلت آیین مرحمت قانون: ڕاوێژیاری دادی ئایین، بەزەیی یاسا. هنروری که به دروش ممالك اسلام – چنان شده است چو یونان به عهد افلاتون: هونەروەرێك که ولاتانی ئیسلام بەدەوریدا، یۆنان ئاسایی لە سەروبەندی ئەفلاتووندا، خڕبوونەتەوە. خجسته رای وزیری که ساعد هنرش – ببزم رزم چو آید ز آستین بیرون: وەزیرێکی پیرۆز ڕای کە مەچەکی هونەری لە سەرقۆڵی بۆ نەبەرد و گەڕ و گەڕناسی دەرێنێ. به دشمنان بنماید شجاعت و قهرش : ئازایەتی و قاری بە دژمنان دەنوێنێ. به دوستان بفشاند خزانهء قارون: بە دوستاندا گەنجینەی قاروون بڵاو دەکاتەوە. ببین به زیر رکابش سمندر صاعقەرو: تواشای سەمەندەری بروسکە ئاساکە دە بن ڕکێفیدا. سەمەندەر: سالاماندرا: سمندول: یۆ. Salamandra لا . salamandra، گیانلەبەرێکە دە پلەی دوڕەی کلکدار کە بۆ خۆی تیرەیەکی تایبەتی هێناوەتە گۆڕێ. ئەم گیانلەبەرە بەژنێکی مام نێوەنجی (بە زۆری ٢٥ سانتی مەتر) پۆستێکی ڕەنگ تاڵی پنت زەردی زۆپی هەس.

هێورگای سەمەندەر لە جێگای نمناك و تاریك و لە ئەشکەوتاندایە. خوروخۆراکی لە جڕ و جانەوەر و کرمە. لەشی لە چاو خۆیدا قەڵەوە و کلکێکی تیرۆکانەی دە شێوەی گوستیلك هەس. بێ وەی و گەزەنە، پێستی زوخاوێك دەردەدا تیژە.. ببین به دست نوالش پرند آذگون: بنواڕە شیری ئاورڕەنگ بەدەستی بەخششیەوە. که تا مشاهده بینی هزبر بر ثعبان: هەرچەندی لێ ورد بییەوە، هەر دەڵێی شێرە لە ئەژدیها ڕۆهاتووە. که تا معاینه بینی جحیم در جیحون: چەندی تواشاکەی، دۆژەهە و لە جەیحووندا. لەم وێنە شیعرییەدا شێخ ڕەزا وێنەی ئۆلیس، پاڵەوانی ناوداری شەڕی ترۆی کە لە ڕێی وەگەڕاندا تووشی ڕووداو و کەین و بەینی ناهەموار و سەراسیمەییەکی زۆر دەبێ و هاوسەرە وەفادارەکەی، (پەنلوپ) و فرزەندە پاکزێیەکەی، (تەلماك) چاوەنۆڕی دەبن، وەلێ گرۆیەك لە لەشخوازان، کە پێیان وا دەبێ، ئۆلیس لە ناو چووە و دەیانەوێ ژنەکەی ناچار کەن شوو بە یەکێکی دیکە بکا. ئۆلیس بە دزییەوە و بە نەناسراوی وەدەگەڕێتە زێدی خۆ و تۆڵەی ژنەکەی لە بێ ئابڕووان دەستێنێتەوە. ئەم داستانە هۆمەری نەمر بە نێوی داستانی دێرینی ″ئۆدێس″ەوەی بە شێوەیەکی پڕ نێوەڕك و شاعیرانە هۆنیوەتەوە. ئەمن پێم وایە ئەم داستانە لە سەروبەندی شێخ ڕەزا و پێش ویش لە نێو شاعیرانی کورددا نێووبانگی ڕۆیشتووە و شتێکیان لێ زانیوە... نسیم گلشن مهرش اگر وزد نیسان: ئەگەر شنەی

گوڵشەنی میهرەبانیی لە مانگی نیساندا هەڵکا. سموم آتش قهرش اگر جهد کانون: ئەگەر ڕەشەبا و زریانی قار و ڕکی لە مانگی کانوودا ببزوێ. دیارە مانگی نیسان مانگی باو بۆران و مانگی کانوونیش، مانگی تۆف و وەیشوومە و سەرما و سۆڵەیە... بە باغ لالەء نشکفتەرا بریزد برگ: گەڵاو وەڵگ بە گۆڵاڵە سوورەی باخی هێشتا چرۆنەکردگ دەبەخشێ و خوێن لە گوڵاڵە سوورەی باخی سیس بووگەوەدا دێتە جۆش. کفش پیالەای از بادەء کرم سرشار: بەری دەستی پیاڵەیە کە لە بەخششت، سەرڕێژ و پڕ. دلش سفینەای از گنج معرفت مشحون: دڵی کەشتییەکە لە گەنجی زانست و دانایی دارماڵ. یکی فقیر بود با سخای او ملیار: یەکێ هەژار بێ بە دڵاواییی وی خاوەن ملیار. یکی بشیز بود با عطای او ملیون: کەم نرخێك بە بەخششتی ئەو دەبێ بەخاوەن ملیۆن، وشەی بشیز بە ڕەچەڵەك پەهلەوییە، واتە کەمترین دراوی سەروبەندی ساسانییان. ایا بلند جنابا وزیرآصف رای: ئەی سەردەرانە بڵند هۆ وەزیری ڕا وەك ڕای ئاسەف. بە یمن اختر مسعود و طالع میمون: بە بەرەکەت بەختەوەر و یەغباڵ پیرۆز. یکی برای خدا تیغ انتقام بکشن: جارێك لە بۆ خوا تێخی تۆڵە هەڵکێشە. بخواه کینەء من از زمانەء وارون: تۆڵەی من لە زەمانەی بەرەواژ بستێنەوە. همیشە تا بە جهان خلق داستان دانند: هەتاهەتایە خەڵك لە جیهاندا بە داستانی بگێڕنەوە. بە عدل داد کند عمر دولتت افزون: تەمەنی دەوڵەتت بە عەداڵەت و داد زێدە بێ.

## ٥٩

### برای یونس خان بانه*

(پیتی) نوون

مــن در ایــن مــمــلــکت روم کــه بــادا ویــران
خـوار و بـدنـام شدم هـمـچـو عـمـر در ایـران
نــه بــه ایـران بـودم جـای اقـامت نـه بـه روم
گشتــەام زیــر فـلك هـمـچـو فـلك سرگـردان
شیـخـم و نـیست مـرا جـایـی بـرو تـکـیـه کـنـم
نــکــنــم تــکــیــه بــر کــرم یــونس خــان

مـــا بـــخــدمت نــرسيــديــم ولـــی مــيشنــويــم[1]
قـــهـــرمـــان است دريـــن نـــاحـــيـــهء كـــردستـــان

...............................................................

(١) لە دیوانە لە چاپدراوەکەدا نییە.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)
وەك: " باز در زلف بنفشه حركات افكنند
دهن زرد خجسته به عبير آكندند"

من درين مملكت روم كه بادا ويران: من لەم وڵاتی ڕۆمە هەی وێران بێ. خوار و بدنام شدم همچو عمر در ايران: بە چاوی کەم تەماشاکراو هەروەکو عومەر لە ئێران، بەدناو بووم. نه به ايران بودم جای اقامت نه به روم: نە لە وڵاتی ئێران جێگای مانەوەم هەس نە لە وڵاتی ڕۆم. گشته‌ام زير فلك همچو فلك سرگردان: لە ژێر گەردووندا وەك گەردوون خۆی، سەرگەردان بووم. واتە دەگەڕێم. شيخم و نيست مرا جای برو تكيه كنم: جێگایەکم نییە کە پشتی پێوە دەم. دیارە "تكيه" و "متكا" بە مانای جێگایەك دێ کە پشتی پێوە بدرێ، شانی لەسەر دابدرێ، شاعیر (تەکیە)ی مەبەستە. نكنم تكيه مگر بر كرم يونس خان: ئەگەر بە کەرەم و دەهەندەییی یونس پشت دانەدەم.

## ٦٠

### امير المؤمنين*

(پیتی) نوون

آسمـــانش آن چـــنـــاست و زمـــيـــنش آنچنين
چشم عــبــرت بــرگشا و قــدرت حــق را بــبــيــن
گــر چــه از روی زمــيــن مــن مــالك چــيــزی نــيــم
از زمــيـــن تـــا آسمــان (حــمــداً لــرب الــعــالــمــيــن)
كـــاش يك روزم بـــدرگـــاه هـــمـــايـــون ره دهـــنـــد
تـا (حميد خـان) را بگويم: (ای حميرالمؤمنين)
بـــعـــثت تـــو بـــرخـــلاف بـــعـــثت پـــيـــغـــمـــبـــر است
(انت مـــا ارسلت الا زحـــمـــه لـــلـــعـــالـــمـــيـــن)

(*) کێش: بەحری ڕەمەڵ موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: " آن کە نقشی دیگرش جایی مصَّور می شود
نقش او در چشم ما هر روز خوبتر می شود"
آسمانش آن چناست و زمینش آنچنین: ئاسمانی ئاوهاس و زەوینی وەی تەرحەس. چشم عبرت برگشا و قدرت حق را ببین: چاوی پەند و عیبرەت وەکە و توانستی خودای بەهەق ببینە. گر چە از روی زمین من مالك چیزی نیم: گەرچی من لە رووی زەوین، خاوەنی شتێك نیم. از زمین تا آسمان (حمداً لرب العالمین): هەر لە زەوینەوە، تا هاسمان سپاس بۆ پەروەردگاری جیهانان.

## ٦١

## باب همایون*

(پیتی) نوون

فرج دهن دریده ندار صدای کون
عالیست همچو باب همایون سرای کون
از کس بکار بردنش ابلهی بود
کیری کە آفریده خدایش برای کون
دل در برم چو خایەء حلاج می طپد
از شوق چون بگوش من آید صدای کون

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەتوی مەخبوون مەقتووع
(مفتعلن مفاعلن مفتعلن فعلن)
نموونەم دەست نەکەوت.
فرج دهن دریده ندارد صدای کون: کوزی زار دادڕاو ئاوازی قوونی نییە. عالیست همچو باب همایون سرای کون: سەرای قوون وەك دەرکەی (بابی عالی) بەرز و بڵندە. از کس بکار بردنش ابلهی بود: کێر گەمژەییە. کیری کە آفریده خدایش برای کون:

کێرێك له خوای خۆی بۆ قوونی دروست کردبێ. دل در برم چو خایهء حلاج می طپد:
دڵم له گیانمدا وەکوو گونی هەلاج دەلەرزێ. از شوق چون بگوش من آید صدای کون:
که ئاوازی قوونی بەر گوێ دەکەوێ.

## ٦٢

## در ستایش تحسین پاشا
## والی موصل*

(پیتی) واو

شاد از (خشه) بودیم هم أو رفت بطاپو[١]
بیهوده گذشت آن همهام سعی و تکاپو
میکارم وچون میدروم کشتهء خود را[٢]
در خرمنم آتش زند این چرخ جفاجو
بشکافت چو گندم فلك شعبدهبازم
تا مشت جوی گشت مرا حاصل ازین جو
(طاپوایله ویردی املم باد هوایه
خرمن کبی یانسون یورکی ناظر ویرگو
دست من و دامان تو، ای حضرت والی
ای واسطهء رزق گدایان دعا گو
عالی نسبا سیرەت و سیمای تو زیباست
تحسین لقبا اسم و مسمّای تو نیکو
گر بندهء پایت قدمی هست منم من[٣]
ور خواجهء صاحب کرمی هست توی تو
فرش است زخاك قدمت عرش سلیمان[٤]
جویی است ز بحر، حکمت هوش ارسطو[٥]
قطرهای بود از دائرهء جود تو قاآن[٦]
تابی بود از شعلهء قهر تو هلاکو

سر پـــنـــجـــهء تـــدبـــيـــر تـــو آرايش مـــــلك
بـــی مـــنَّـــت لشكـــر كشيـــد قـــوت بـــازو(٧)
ادراك تـــــو در تسويـــــهء أمـــــر سيـــــاسی
بشكـــافت بسی مـعـنـــی بـــاريـكـتــر از مـــو(٨)
گـــه جـلـوه‌و گـــه شاهـد وحـدت بـــود ايـــن بـــا غ
گــــه در صفت ژالـــــه و گـــا لالــــهء خـــودرو(٩)
تشريـــف بـــيـــــاريـــد اگـــر از سر اخـــلاص(١٠)
آرد بـــــنــــعـــال قـــدمت (شيـــخ رضا) رو(١١)

..............................................................

(١) بودم هم رفت: (ت) بودم، خشه هم رفت. (م).
(٢) كيشتهء خودرا: (ت)، كشتهء خودرا: (م).
(٣) گريبندهء پايت قدمی: (ت)، گر بندهء پابت قدمی... ئه‌م دێڕه‌كه‌ی پاشه‌وه‌ی له‌ چاپی (مه‌ريوانی)دا نييه.
(٤) عرش سليمان: (ت).
(٥) هوش ارسطو: (ت).
(٦) قطره بود: (ت ، م).
(٧) بی منت لشكر قوت بازو: (ت)، بیّ منت لشكر كش وقوت بازو (م).
(٨) (باريكتر) نه‌ختیّ قورس بخوێنه‌وه.
(٩) گل ژاله صفت: (م).
(١٠) دالی (بياريد) نه‌ختیّ قورس بخوێنه‌وه.
(١١) آيد بنعال قدمت (شيخ رضا) رو: (ت)، آيد بنعال قدمت (شيخ رضا) زو: (م)
(*) كێش: به‌حری هه‌زه‌ج موسه‌ممه‌ن ئه‌خره‌ب مه‌كفووف مه‌حزووف
(مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن)
وه‌ك: ″ آن را كه خدای از قلم لطف نگارد
شايـد كو براو مشّاطــه نيـــارد″

شاد از خشه بوديم هم او رفت به طاپو: زۆرم خۆش له‌وه هات كه (خوشه) بۆ تاپۆ چوو. بيهوده گذشت آن همه ام سعی و تكاپو: به به‌لاش چوو ئه‌و هه‌موو كر و

کۆششەم. می کارم و چون میدروم کشتەء خودرا: دەکێڵم و کاتێ کێڵدراوی خۆم دەدرووومەوە. در خرمنم آتش زند این چرخ جفاجو: ئەم چەرخە هەمیشە جەفا و مـەینـەتـی گـەرە ئـاور لـە خـەرمـانـم بـەردەدا. بشکافت چو گندم فلك شعبدە بـازم: گەردوونی فێڵبازم وەکوو گەندمی یەخەدادڕاوی دادڕیم: تا مشت جوی گشت مرا حاصل ازین جو: تا مستێ دەسکەوتم لەم جۆیە وەگیر کەوت. (طاپو ایلە ویردی املم باد هوایە): هەویای بە تاپۆ دام بە بادی هەوا، بە بەلاش. (خرمن گبی یانسون یورگی ناظر ویرگو): سەرپەرشتی باج دڵی وەك خەرمان بسووتێ. دست من و دامن تو ای حضرت والی: دەستی من و داوێنی تۆ ئەی حەزرەتی والی. ای واسطەء رزق گدایان دعاگو: لە پێناوی ڕۆزیی گەدایانی دوعاگۆ: عالی نسبا، سیرت و سیمای تو زیبا است: هۆ ڕەچەڵەك بڵند، ڕەوشت و سەر و سیمای جوان. تحسین لقبا اسم و مسمّای تو نیکو: نازناو پەسند، نێو و نێوەڕۆك چاك. بندەء پایت قدم هست منم من: ئەگەر بەندەیەکی پابەند  و پێ چەسپ هەبێ، منم من.
ور خواجەای صاحب کرمی هست تویی تو: ئەگەر گەورەیەکی خاوەن کەرەم هەبێ تۆی تۆ. فرش است ز خاك قدمت عرش سلیمان: خاکی بەر پێی تۆ ڕایەخی حەزرەتی سولەیمانە. جویی است ز بحر حکمت و هوش ارسطو: حیکمەت و هۆشی ئەرەستوو جۆگەلەیەکە لە دەریا. قطرە ای بود ز دائرەء جود تو (قاآن): قائان تنۆکێکە لە جغزی دەهندەییی تۆدا. تابی بود از شعلەء قهر تو (هلاکو): هۆلاکۆ ترووسکەیەکە لە شۆڵەی ڕکی تۆ. سرپنجەء تدبیر تو آرایش ملك: سەرئەنگوستی ڕا و تەکبیری تۆ بەزەکی مڵك و دەوڵەتە. بی منّت لشکر تو قوّت بازو: بێ میننەت لەشکری تۆ هێزی بازووە. ادراك تو در تسویەء امر سیاسی: فام و تێگەیشتنی تۆ لە یەکلاکردنەوەی کاری سیاسیدا: بشکافت بسی معنی باریکتر از مو: مانای لە موو باریکترت قەڵشاند. گە جلوە و گە شاهد وحدت بود این باغ: ئەم باخە گاهێ تەجەلاّ و خۆبەدیارخستن و گاهێ گەواهی یەکایەتییە. گە در صفت ژالە لالەء خودرو: گاهێ ژاڵە و گاهێ وەك مێلاقەی خۆڕوواو (لە خۆڕا ڕوواو). تشریف بیارید اگر از سر اخلاص: تەشریف بێرن، ئەگەر لە ڕووی دڵسۆزییەوە. آید بە نعال قدمت شیخ (رضا) رو: شێخ ڕەزا ڕوو بە کاڵەی پێتدا بێرێ.

۶۳

**در مدح سلطان عبدالعزیز خان***

(پیتی) هیٔ

کـردم بـکـارنـامـهء شاهـان بسی نـگـاه[۱]
بـرهـم زدم جـریـدهء ایـن کـهـنـه کـارگـاه
از حـــال خسروان زمـــان جستــم آگهی[۲]
آنـــان کـــه بـــودهانـــد خـــداونـــد دستـــگـــاه
ساسانیـان بـحکمت و سامانیـان بملك[۳]
عباسیـان بـه شوکت و سلـجوقیـان بـجـاه[٤]
هـرچـنـد کـه خـواستـم کـه بیـابـم نیـافـتـم[۵]
شاهـــی بـــفـــر و دولت (عـــبـدالـعـزیـز شاه)
چشم سپـــهـــرو دیـــدهء دوران نـــدیـــده است
شاهـــنشهـــی بـــدیـــن حشم ولشکـــر و سپـــاه
این تخت واین مسند این گنج و این گهر
وین تاج وتخت و این علم و چتر و بارگاه
ایـن لشکـر نـظـام کـه کـرد گوش چرخکر[٦]
از نـالـهء نـفـیـر بـهـهـر شام و صبـحـگـاه
خـورشیـد سایـه گستـر و جـمشیـد تـاجـور
دارای بـــنـــده پـــرور و سلـــطـــان دیـــن پـــنـــاه
فـــخـــر دول مـــلاذ مـــلـــل و مـــایـــهء امـــل
ظـــل خـــدا امـــام هـــدی، سایـــهء إلـــه[۷]
مـــی گـــفـــتـــم از ستـــایش او شمـــهای ولـــی
یـــارای هـــر کسی نـــبـــود مـــدح پـــادشاه
کـی دارد احـتـیـاج بـتـعـریـف چـون مـنـی
بسط جـلال شه کـه زمـاهـیست تـابـمـاه
خـواهـم یـکـی مساعـده از طبـع تـا دهـم[۸]
داد سخـــن بـــمـــدحت دستـــور پـــادشاه

صدری کـه گـر تـلافـی وافـی نـمـی شدی[٩]
دولت خـــراب گشتـــی و مـــلت شدی تـــبـــاه
محمود ندیم پادشه صدری که بر دوش[١٠]
کـردست چـرخ قـامت تـعـظـیـم را دوتـاه
یك یك بـــدست و بـــازوو رای زریـــن بست
هـر رخـنـهای کـه یـافـتـه ببنـیـاد ملك راه[١١]
دم در کش أی (رضا) کـه نـدارنـد نسبـتـی
دریا و قطره ذرَّه و خورشید وکوەو کاه[١٢]

---

(١) شاهنامه (ح) دوارن(خ).
(٢) خسروان جیهان (خ).
(٣) بحکمت (ت).
(٤) بدشت (ت).
(٥) خواستم. بیبام (ت).
(٦) این قوشن ونظام (خ).
(٧) سایەء الله (م).
(٨) مساعد در طبع: (م). مساعده از طبع (ت). مدحت دستور پادشاه (ت).
(٩) محمود ندیم پاشا: (ت)، محمود ندیم پادشهی (م).
(١٠) بدست بازود رأیی زرین: (ت)، بدست باری ره زرین: (م) بدست و بازوی رأی زرین (م . ك).
(١١) هر خندهء که یافت ببنیاد ملك راه: (م)، هر رخنهکه که یافته بنیاد ملك راه: (ت).
(١٢) دریا و قطره بود چو خورشید و کوه وکاه: (م).
(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون ئەهتەم
(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعول)
وەك: ″ ما را بآب دیده شب و روز ماجراست
زان رهگذر که بر سر کویش چرا آرد″
کردم به کارنامەء شاهان بسی نگاه: زۆرم ڕوانییە کارنامەی شاهان. بر هم زدم

جریدەء این کهنه کارگاه: ڕۆژنامەی ئەم کۆنە کارگایەم بە سەر یەکدیدا دا، هەمووم ئەم دیو و ئەودیو کرد. از حال خسروان زمان جستم آگهی: زانیارییەکەم لە حاڵ و ئەحواڵی پادشایانی زەمانە. پەیجۆر کرد. آنان که بودەاند خداوند دستگاه: ئەوانەی کە خاوەن داوودەزگای سەڵتەنەت و تەخت و تاج بوون. ساسانیان بە حکمت و سامانیان بە ملك: ساسانیان بە ژیری و سامانیان بە مڵك و دەوڵەت. ساسانیان زنجیرەیەك لە شاهەنشایان کە لە ٢٢٤پ.ز هوە تا ٦٥٢ز. لە ئێران فەرمانڕەوایییان کرد. وەجاغی بنەماڵەی ساسانی ئەیالەتی فارس بوو. واتە: هەر هەمان سەرزەوینی دێرینەی باشووری ڕۆژاوای ئێران کە نزیکەی پێش دوو هەزار ساڵ زێتر یەکەمین هۆزەکانی نەتەوەی پارس لەوێ دامەزرابوون. تاج و تەختی پادشاییی بە دەستی زنجیرەیەك لە پادشایانی نەتەوەکیی کەوت کە خۆیان بە میراتگری هەخامەنشییان جاڕ دەدا و بە بێبەشکردنی ئەشکانییان لەم مافە تەنیا خۆیان بە خێوی هەق دەزانی. ساسانییەکان پاش ئەوەی کە تاج و تەختیان لە دوای کێشە و هەرایەکی دوور و درێژ، بەدەست هێنا، فەرمانڕەواییەکی نەتەوەکییان دامەزراند، پشتی بە ئاینی زەرتوشتی و شارستانیەتێك ئەستوور بوو، ڕەنگە لە ڕووی ئێرانییەتەوە لە سەراسەری دیرۆکی دوورو درێژی ئێرانییاندا مانەندی نەبووبێ. شەرەفخانی بدلیسی بنەماڵەی خۆیان بە ڕەچەڵەك دەباتەوە سەر ساسانییان، سامانییان، دەچنەوە سەر سامان خودات، لە نەجیوزادانی بەڵخ، کە گەیشتە خزمەتی ئەسەد کوڕی عەبدوڵڵا، فەرمانڕەوای خۆراسان و لە ئاینی زەرتوشتی دەستی هەڵگرت و موسڵمان بوو. سامانییەکان بنەماڵەیەکی ئێرانین و لە خۆراسان و ماوەرای نەهر و بەشێ لە ئێرانی ناوەند، لە ساڵی ٢٦١ك. مانگی. ٨٧٤ز – هوە تا ساڵی ٣٨٩ك. مانگی ٩٩٩ز. فەرمانڕەوایییان کرد. عباسیان بە دولەت، سلجوقیان بە جاه: عەبباسییان بە دەوڵەت، سەلجووقییان بە جاه و شکۆ. عەبباسییان: زنجیرەیەك لە فەرمانڕەوایانی عەرەب لە ساڵی ٧٥٠ك. ١٢٥٨ز. هوە لە بەغدا فەرمانڕەواییی کرد و ٣٧ خەلیفەیان لێ کەوتەوە. دروشمیان ئاڵای ڕەش بوو. کوردێك بە نێوی ئەبو موسلیم خۆراسانییەوە سەرکردایەتی دامەزراندنی ئەو دەوڵەتەی بۆ کردن و زۆر بە نامەردی پاداشتی درایەوە. ئیمپراتۆڕییەتی ئیسلام لە سەروبەندی واندا بە چڵەپۆپە گەیشت. ئەمانە بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب، مامی پێغەمبەر (د. خ). سەلجووقییان: خانەدانێکی تورك کە لە ساڵی ٤٢٩ك. مانگی. – ١٠٣٧ز. هوە

تا ساڵی ٧٠٠ك. مانگی ١٣٠٠ز. لە ئاسیای ڕۆژاوا فەرمانڕەواییان کرد. هر چند خواستم که بیابم نیافتم – شاهی به فر و دولت (عبدالعزیز شاه) هەرچەندم ویست کە شایەتی بە فەڕ و دەوڵەتی وەکوو (عەبدولعەزیز شا)م بە دەست کەوێ، بەدەستم نەکەوت. چشم سپهر و دیدهء دوران ندیدهاست – شاهنشهی بدین حشم و لشکر و سپه: چاوی ئاسمان و دیدەی زەمانە، شاهەنشایەکی بەم هەیت و هووت و دەبدەبە و سەنسەن و لەشکر و سپایەوە نەدیتووە. این تخت این مسند و این گنج و این گهر: ئەم تەخت و ئەم پاڵپشت و ئەم گەنج و ئەم گەوهەرە. وین تاج تخت این علم و چتر و بارگاه: ئەم تاج و تەخت و ئەم ئاڵاو ئەم سەیوان و بارەگایە. این لشکر و نظام که کرده گوش چرخکر – از نالهء نفیر بهر شام و صبحگاه: ئەم لەشکرو نیزامە کە لە ناڵەی دەنگ دان هەموو ئێوارە و سبەینانێك بۆ شەڕ، گوێی چەرخ و گەردوونی کەڕ کردووە. خورشید سایه گستر و جمشید تاج و ور: خۆری سێبەر ڕائێخ و جەمشیدی تاجدار. دارای بنده پرورو سلطان دین پناه: دارای بەندەپەروەرو سوڵتانی پەنای ئاین. فخر دول ملاذ ملل مایهء أمل: جێ شانازیی دەوڵەتان و پەنای گەلان، مایەی ئاوات و هەویا. ظل خدا، امام هدا سایهء اله: سێبەری خوا، پێشەوای هیدایەت و ڕێبەدێیی، سایەی خوا. می گفتم از ستایش او شمهای ولی: ژەکێکم لە پەسن و ستایشی وی دەگوت، بەڵام یارای هر کسی نبود مدح پادشاه: پەسنی پادشا لە توانست و یارای هەموو کەسێکدا نییە. کی دارد احتیاج به تعریف چون منی: کەی ئەو پێویستی بە تاریفی ئی وەکە من هەیە. بسط جلال شه که ز ماهیست تا به ماه: شەرح و لێکدانەوەی شەوکەت و شکۆی شا کە لە ماسیڕایە تا مانگ، واتە: ماسی لە کوێ و مانگ لە کوێ. ئاسمان و ڕێسمانە... خواهم یکی مساعده از طبع تا دهم – داد سخن به مدحت و دستور پادشاه: یارمەتی لە سەلیقە و تەبع داوا دەکەم بۆ وەی بەخششی گوفتارم بە پەسنت و دەستووری پادشاوەم صدری که گر تلافی وافی نمی شود – دولت خراب گشتی و ملت شدی تبه: سەدرولئەعزەمێك کە ئەگەر بێت و نەگۆڕێ، هاکا دەوڵەت خرابوو و میللەت لەناو چوو. محمود ندیم پادشه صدر اعظم کـه بـر دوش – کـرده است چـرخ قـامت تـعظـیـم را دو تـاه: مـەحـمـوود نـەدیـم کـە سەدرولئەعزەمە، گەردوون بەژنی بە گەورەزانینی لە سەر پشت وەك دوو تای بار یا تەرازوو لێ کردووە. واتە: گەردوون بەرپرسیاریی دەوڵەتی وەك دووتای تەرازوو بە کۆڵیدا داوە، یا وەك دوو تابار بە سەر پشتیدا داوە. لە وێنەی یەکەمدا مەبەست ئەوەیە

کـە کـاروبـار بـە داد و عـەداڵـەتـەوە بـە ڕێوە دەبـا. لـە وێنـەی دووەمـدا، واتـە: بەرپرسیارییەکە وەکو دووتا بار بە کۆڵیەوەیە. دیارە لە ئی دووەمدا نەقیزەیەکەك هەس... یك یك بە دست و بازوت رأی رزین بست – هر رخنە ای یافتە بە بنیاد ملك راه: هەر کونێ کە ڕێی کەوتبێتە بنیاتی موڵك و دەوڵەت، یەکە یەکە بەڕای بەسەنگی تۆیە و دەست و بازووی تۆ گیرا چارەسەر کرا. لێرەشدا هەر نەقیزەیەك هەیە.. دم درکش ای (رضا) کە ندارد – دریا و قطرە ذرّە و خورشید و کوە کاه: چزووی زمان دەرێنە (ڕەزا) چونکە هیچ نیسبەتێك لە نێوان دەریا و تنۆك، گەرد و خۆر و کێووکادا نییە. واتە فەرقەکە وەك فەرقی نێوان ئەمانە وایە.

## ٦٤

### برای خودش*

(پیتی) هێ

چـە کـرامت چـە خـارق عـادە
جـلـق بـهـتـر ز دلـق و سجـادە
سخـن مـن مـفـیـد و مـخـتـصر
بـابت سادە بـابت سادە[١]
گر چـە نـتـوانـم از زمـیـن خـیـزم
بسکـە هستـم ضعـیـف و افـتـادە
گـر بـگـویـنـد هست در بـغـداد
سادەرویـی لـطـیـف و بـگـزادە
ذرّە آسا بـمـهـر و دیـدارش
(گـیـدرم بـاشم اوزە (بـغـدادە)
سوی مسجـد دوگـام مـی نـروم
سوی مـیـخـانـە تـنـد و آمادە
مشربم مشرب امین فیضی است
هـردو از هـردو عـالـم آزادە

ای رضا تــا بــەمــرگ رنــدی کــن
ایـــــن بـــــود دولت خـــــداداده

..........................................................................

(١) بابت ساده بابت ساده: (ت) بابەت ساده بابت ساده(م).

(*) کێش: بەحری خەفیف موسەدەس مەخبوون ئەسلەم

(فاعلاتن مفاعلن فع لن)

وەك: " آتشی از تو در دهـــان دارم

لیك صد مهر بر زبان دارم"

چە کرامت چە خارق عادە: ئەمە چ کەرامەتێکە، چ شتێکی لە دنیا بەدەرە. جلق بهتر ز دلق و سجّادە: دەسپەڕ لە پەلاس و سەجادە چێترە. سخن من مفید و مختصر: قسەی من بەمانا و کورت و موختەسەرە. بابت ساده بابت ساده: بابەتی ساده دەگەڵ بتی ساده. "بابت" بە مانای "باوك" یشت دەتوانی لێك بدەیەوە. "بابت ساده" لەگەڵ بتی ساده. گرچە نتوانم از زمین خیزم: بسکە هستم ضعیف و افتاده: گەرچی ناتوانم لەسەر زەوین ڕاست بمەوە، چونکە زۆر بێ هێز و پەککەوتەم. گر بنگویند هست در بغداد – سادەرویی لطیف و بگزاده: ئەگەر نەڵێن لە بەغدا – سادەڕوویێکی لەتیف و بەگزاده هەیە. (گیدرم باشم أوزوە بغداده) بە سەر سەرم بۆ بەغدا دەڕۆم. سوی مسجد دو گام می نروم: بەرەو مزگەوت دوو هەنگاو ناڕۆم. سوی میخانە تند و آمادە: بەڵکو بەرەو میخانە بە پەلە دەڕۆم. مشربم مشرب أمین فیضی است: میزاج و هاودەمیم میزاج و هاودەمیی ئەمین فەیزییە. هەردوو از هر دو عالم آزادە: هەردووکمان لە هەردوو دنیا ئازادەین. ای (رضا) تا بەمرگ رندی کن: ئەی ڕەزا تا مردن ڕەندی بکە، گوێ مەدە دنیایێ. این بود دولت خداداده: ئەمەیە دەوڵەتی خوا داو.

٦٥

**شیخ حسام الدین طویله***

(پیتی) یێ

نــــە سر از مــطـلـــع گـیـلان بـدر آرد مـاهـی
نــــە عـلـــم بـرکشد از سمت بـخـــارا شاهـی

نــــه ز رنـــدان صبـــوحـــی زده‌ء بـــزم است
هـــای و هــوی، طـربــی، خـنـده‌ای قـاه قــاهــی
نـه ز کـاشان بــه‌بـازار (انـا الـحق) گـویـان[۱]
مست وسرخوش گذرد بـاز فـنـا فـی الـلـهی[۲]
نــه بـدامـن چـکـد از دیـده‌ء گـریــان اشکــی
نـه بـه‌کـیـوان جـهد از سیـنـه‌ء سوزان آهی[۳]
اوحدی واحمدی، جامی و سریّ و معروفی[٤]
بــایـزیـدی، حسنـی خـواجـه عـبـیـدالـلـهی
زیــر ایــن گـنـبـد فـیـروزه نـیــابــی امــروز
پـــــی حــــق بـــــرده ز اسرار خـــــدا آگاهی
بــود هــر جــا در فـیض هـمـه را قـفـل زدنـد
الـــتــجــا کــار خـرد نـیست بـهـر درگــاهــی
قــرب یــزدان نــتــوان جست زهــر اهــرمــنــی
دست بـیــعت نــتــوان داد بـــهــر گــمــراهــی
کـرد هـر مـلـحـدکـی جـامـه‌ء تـقـوی دربـر
کـه مـنـم قـطب جـهـان تـا بـه کف آرد جـاهـی
فـیض خـواهــی ز مـریـدان (حسام الـدیـن) شو
آنـکــه پــیش کـرمش کـوه کـم است از کــاهــی
چــون نشیـنـد ز پــی خـتـم بـه خـلـوت گـوی
خــیــمـــه در وادی وحـــدت زده شاهـــنشاهــی
آنـــکـــه بـــا یك نـــظـــرش دست دهـــد سالك را
قــرب صد سالــه عــبـــادت بــه سلـوك مــاهــی
آرد از هـــمّـــت او دامـــن مـــقـــصود بـــدست
دست در دامــن مـقـصود چــو مـن کـوتــاهــی
حــاسدی گـر کـنـد انـکـار کـمـالش چـه عـجب
یــوسفــی را فــگــنــد دست حسد در چـــاهـــی

چـه غـم زنـد رهـزنـی نـفس گـرت بـدرقـه اوست
پـنـجـه بـا شیـرعلـی چـون فـگـند روبـاهـی
ای مـتـاع دو جـهـان جـائـزهء یك نـگـهت
خـواهـم از چشم (رضا) عطف نـگـاهی گـاهـی
از ثـنـا زود عـنـان بـاز کشیـدم کـه نـداشت
در خـور طـبـع روان قـافـیـه جـولان گـاهـی
تـا سری هست سر نـامـوران در قـدمت
تـا دلـی هست دلت نـائـل هـر دلـخـواهـی
بـوجـودت کـه بـود تـعـبـیـه در جـوهـر جـود
نـرسد رنـجـی و عـارض نشود اکـراهـی

---

(١) کاشان (ت).

(٢) پیر (ت).

(٣) جهد (ت).

(٤) اوحدی، سری، احمدی، معروفی: (ت)، اوصدی احمدی جامی سر معروفی: (م).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: "در بـرش برگ سمن مـی باید

و ز خطش مشك ختن می باید"

نە مانگێ لە هەڵاتگەی گێڵانەوە سەر دەردێنێ. نە شایەك ئالایەك لە لای بوخاراوە هەڵدەکا. نە ز رندان صبوحی زدەء ألست: نە لە ڕەندانی مەی سبەینان بردووی بەزمی ئەلەست. های و هویی، طربی، خندەای قاه قاهی: نە های و هووێەك، نە هاتنەجۆشێ، نە خەندەیەك قاقای پێکەنینێ هەس. نە ز کاشان ببازار أنا الحق گویان: نە بە ئەنەلحەق گوتنەوە لە بازاڕی کاشانەوە. مست و سرخوش گذرد پیر فنا فی اللهی: پیرێکی لە پرتەوی خوادا تواوە بەمەستی و سەرخۆشی بێ ڕابوێرێ. نە بدامن چکد از دیدەء گریان اشکی: نە فرمێسکێ لە دیدەی گریانەوە دەدڵۆپێتە داوێن. نە بە کیوان جهد از سینەء سوزان آهی: نە ئاهێك لە سینەی سۆزانەوە بەرەو کەیوان

دەجمیێ. أوحدی و احمدی، سرّی معروفی: نە ئەوحەدییەك و ئەحمەدییەك و سەری و مەعرووفیێ: بایەزیدی و حسنی خواجە عبیداللهی: نەبایەزیدییەك، نە حەسەنییەك، نە خواجە عوبەیدوللایێکت. زیر این گنبد فیروزە نیابی امروز: لە ژێر ئەم گومەزە ڕەنگ پیرۆزەیەدا ئەمڕۆ دەست ناکەوێ. ئەوحەدی: مەبەست ئەوحەدیی کرمانییە، کوڕی ئەبولفەخر نازناو ئەوحەدودین، لە نامێیانی عورەفا و مەشاییخی سەدەی شەشەم و سەرەتای سەدەی حەوتەمە. لە ساڵی ٦٣٥ ك. دا کۆچی دواییی کردووە. بۆ خۆی لە مریدانی شێخ ڕوکنودین سجاسی بوو و هاودەمیی شێخ موحیەدینی ئیبن عەرەبیش گەیشتووە، ئیبن عەرەبی لە بەشی هەشتەمی فتووحاتی مەککییەدا، حەکایەتێکی، کە خۆی دەماودەم لە زاری ئەوحەدودینی بیستووە، گێڕاوەتەوە و ئەمە لە نەفەحاتولئونس، لاپەڕە ٦٨٥، لە تەرجەمەی حاڵی ئەوحەدودیندا نووسراوە. لە کتێبی ئاسارولبیلاد، دانانی زەکەریا کوڕی محەمەد کوڕی مەحموودی قەزوینی، لە ساڵی ٦٨٢دا کۆچی دواییی کردووە، کورتە شرۆڤەیەکی حاڵی تێدا نووسراوە و ئەم دوو بەیتەش لەوێڕا نەقڵ کراوە:

"با دل گفتم خدمت شاهی کم گیر چون سر ننهادەء کلاهی کم گیر"

"دل گفت مرا از این سخن کمتر گو کردی و دهی و خانقاهی کم گیر"

"دهخدا" دەڵێ: وشەی "ننهادەء" لە ئەسڵی چاپدا "نهادەء" نووسراوە، کە کێشی شیعرەکەی پێ لەنگ دەبێ. هەروەها "کردی" لە باڵی دواییدا، (ك)ە بە بۆر نووسراوە، ئەگەرچی بنەماڵەی "کرکبوری"ی نێوبراو تورکمان بوون، بەڵام وادیارە ئەوحەدوددین لەبەر ئەوەی کە زوربەی نیشتەنییانی ئەربل (ئەربیل) و ئەوان دەڤەران کوردن بە کوردی لە قەڵەم داوە. لە کتێبی "الحوادث الجامعة"ی ئیبن فووەتی، لە ڕووداوەکانی ساڵی ٧٢٣دا کۆچی دواییی کردووە، باسی هاتووە. بەڵام پێم وایە ئەم ڕایە ڕاست نییە.. نێوبراو کوردە و خەڵکی هەولێرە..."کرکبوری"یش، "کورك بوریك"، (کڵاو لووا، تەپلە بەرگن)ە. ئەحمەدی: بەم نازناوە لە لغتنامەی"دهخدا"دا سێ نێوم بەرچاو کەوتن"

(١) یەکێ لە شاعیرانی کۆنی عوسمانیی خەڵکی گەرمیان، یا سێواس، کە لە سەروبەندی ییلدرم بایەزید خاندا هۆنراوەیەکی بە نێوی ئەسکەندەرنامە، کە بە نێوی شازادە سلێمانی کوڕی بایەزیدەوەی داناوە، پەسنی تەیمووری کویرەکانیشی داوە و دوعای خێری بۆ کردووە.

(٢) سەمعانی دەڵێ: ئەوەی بەم نیسبەتە نامێیە، ئەبو عیسا ئەلعە بباس، کوڕی ئەحمەد کوڕی مەترووح کوڕی سەڕراج کوڕی عەبدوڵڵا ئەزدی، نەحوی، ئەلحەصیبی ئەحمەدیی خەڵکی میسرە و جێی باوەڕ و پایەچەسپ بووە و فەرمایشتەکانی پێغەمبەریان (د . خ) لێوە دەبیست. لە جومادا ئەلئولای ساڵی ٣٥٤دا کۆچی دوایی کردووە.

(٣) ئەحمەدی شافیعی، ئەبولبەقا. المعتقد الإيماني على عقيدة الإيماني الشَّيباني... سەری: سەریی سەقەتی، ئەبولحەسەن کوری موفلیس (٢٥١ك. مانگی. / ٨٦٥ز.) لە دەستەی لەدنیا دەسبەردارانی گەورەی نامێ، پێشەوای بەرەی تەسەوف بوو. لە هەموو زانستەکاندا گەیشتبووە چڵەپۆچە. بایەزیدی: تەیفوور کوڕی عیسا کوڕی ئادەم کوڕی عیسا کوڕی سرووشان بە نازناوی بوستامیی سوڵتانولعارفین نامێیە. باپیرەی مەجووسی بووە و لەسەر دەستی ئیمام عەلی کوڕی مووسا ئەڕریزا موسڵمان بووە و بایەزیدی گەورەی پێ دەگوترێ. کۆچی دوایی لە ساڵی ٢٦١ یا ٢٦٢ی ك. دا بووە. نێو و سەربووروەی ئەم پیاوە مەزنە لە زۆر کتێباندا بە دوور و درێژی نووسراوە. ناسر خوسرەو دەڵێ:

"حسن كجا شد و كو بايزيد بسطامى     امير ادهم و فرزند آن هنر پرور"

مەبەستی لە "حسن" لەوە دەچێ حەسەنی بەسری و لە هنرپرور، ئیبراهیم بێ. هەروەها سەعدییش لە بۆستان دا دەڵێ:

"شنيدم كه وقتى سحرگاه عيد     ز گرمابه آمد برون بايزيد"

حەسەن: حەسەنی بەسری کوڕی یار خاوەن کونیەی ئەبو سەعید، یەکێ لە زاهیدانی هەشتەوانەیە. لە ساڵی ٢١ دا لە مەدینە لە دایك بووە و لە ساڵی ١١٠دا لە بەسرە کۆچی دوایی کردووە و ئارامگای لە ڕۆژاوای شەتولعەرەبە. باوی، ئەبولحەسەن یار خەڵکی مەیسانی بەسرە بوو. "تەفسیری قورئان" و "نامیلکەیەك لەمەڕ مەککە" و کتێبی "الخلاص"، ئی وین. خاوەنی کتێبی "بيان الأديان" بە پێشەوای دەستەی حەسەنییە، لە موعتەزیلەی لە قەڵەم داوە. حەسەنی بەسری لە پێشەوایانی ڕێبازی سۆفیەتییە و زانستی لە ئەنەسی کوڕی مالیك وەرگرتووە و بە خزمەتی ٧٢ کەس لە یارانی بەدر گەیشتووە. زير اين گنبد فيروزه نبابى امروز – پى به حق برده ز أسرار خدا آگـاهـی: لە بن ئەم گومەزە ڕەنگ وەك پیرۆزەیەدا وشیارێکت، کە پەی وە نهێنییەکانی خودا بردبێ، وەچەنگ ناکەوێ. حافز دەڵێ:" جنگ هفتادو دولت همەرا

غدر بنه چون ندیدند حقیقت ره افسانه زدند.

بود هر جا در فیض همه را قفل زدند: دەبێ لە هەموو شوێنێ دەرکەی فەیزی هەمووان کلیل درێ. التجا کار خرد نیست به هر درگاهی: پەنا وەبەر هەر دەرکەیەك بردن، کاری ئاوەز و ئەقڵ نییە. قرب یزدان نتوان جست ز هر أهرمنی: هەڵپەی لە خوا نزیکبوونەوە لە هەر ئەهریمەنێك دەردەست ناکرێ. دست بیعت نتوان داد به هر گمراهی – کرد هر ملحد که جامه وتقوا در بر – که منم قطب جهان تا به کف آرد جهی: دەستی بەیعەت کردن بە هەر گومڕا و مولحیدێکەوە نادرێ کە کراسی لە خوا ترسیی لەبەر کرد و گوتی منم قوتبی جیهان بۆ وەی جاه و شکۆیەك دەردەست کا. فیض خواهی ز مریدان (حسام الدین): ئەتۆ ئەگەر فەیزت دەوێ لە موریدانی حوسامەددینی بخوازە. آن که پیش کرمش کوه کم است از کاهی: ئەو کەسەی کە لە چاو کەرەمیدا کێو لە کا کەمترە. چون نشیند ز پی ختم به خلوت کوی – خیمه در وادی وحدت زده شاهنشاهی: شاهەنشایێکە ئەوەی کە بۆ خەتم لە خەڵوەتخانەی گەڕەکدا دادەنیشێ. خیمه در وادی وحدت زده شاهنشاهی: خێوەتی لە شیوی تەنیاییدا هەڵداوە و. آنکه با یك نظرش دست دهد سالك راه – قرب صد ساله عبادت به سلوك ماهی: ئەوەی ڕێبواری ڕێی تەریقەت بە تەوەججوهێکی دەردەستی دەکا – نزیکیی سەد ساڵەی خواپەرستی بە ڕیازەت و سولووکی تەریقەت، بە مانگێك دەبڕێ. آرد همت او دامن مقصود بدست: – دست در دامن مقصود چو من کوتاهی: یەکێکی وەکو منی دەستکورت بە هیممەتی وی داوێنی مەبەست وەدەست دێنێ. حاسدی گر کند انکار کمالش چه عجب: ئێرەیی بەرێك ئەگەر نکوولی لە کەماڵی بکا سەیر نییە. یوسفی را فگند دست حسد در چاهی: دەستی ئێرەیی یووسفێك لە چاڵ دەهاوێ. چه غم از رهزنی نفس گرت بدرقه أواست – پنجه با شیر علی چون فگند روباهی: چ باك بە ڕێگریی نەفس، گەر ئەو ڕێنما و ڕێبەر بێ – ڕێوییەك چۆن دەتوانێ پەنجە دەگەڵ عەلی شێردا بدا. ای متاع دو جهان جائزه یك نگهت – خواهم از چشم (رضا) عطف نگاهی گاهی: ئەی ئەوەی کە هەرچی کاڵای هەردوو جیهان پاداشتی یەك نیگای تۆیە. جارێك، نیگایەکم لە چاوی ڕەزاوە دەوێ. از ثنا زود عنان باز کشیدم که نداشت – درخور طبع روان قافیه جولانگاهی: لە سەناخوانیت زوو ڕێشمەم کێشایەوە، چونکە مەیدانێکم، کە بە کەڵکی سەلیقەی ڕەوانی قافیە بێ، وەگیر نەکەوت. تا سری هست سر ناموران در قدمت: تا سەرێك هەبێ، سەری ناوداران لە

پێش پێت. تا دلی هست دلت نائل هر دل: تا دڵێك هەبێ، دڵت هەموو دڵخوازێکی وەگیر دەکەوێ. بە وجودت کی بود تعبیه در جوهر جود: ئەو بەزەك و دۆزەکەی یا ئەو ئامادەگی و لێوەشاوەیییەی لە وجوودی تۆدا هەیە، کەی لە جەوهەری فەرددا هەیە. نرسد رنجی و عارض نشودا اکراهی: کە ئەگەر بشیەوێ هەبێ هەر وا بەبێ ماندووبوون و ڕەنج و ئازار زۆر لە خۆکردن پێك نایە.

٦٦

## در ستايش حفيدان كاك أحمد شيخ و شيخ سعيد و شيخ معروف شيخ مصطفى*

(پیتی) یێ

تـوکـز نـبـیـرەء کـاك احـمـدی وآل نـبـی
کـفـایت است ازیـن خـوبـتـر چـه مـی طلبـی
بس است قدر و شرف این قدر که جد شماست
شفـیـع روز قـیـامت، محـمـد عـربـی
نـیـا محـمَّـد ومـادر بـتـول وحـیـدر بـاب
زهـی سلالـەء طـاهـر (فـدیتکم بأبي)
بـهـر کـجـا کـه نسب نـامـەء شما خـوانند[١]
کـرا رسد کـه کـنـد ادعـای ذو نسبـی[٢]
اگـر بـحـرمت آل نـبـی نـمـی بـودی[٣]
بـه نـیـمـراه بـمـاندی دعـای نـیـمـه شبـی
اگـر گـذشت نـزاعـی مـیـان مـا چـه عـجب
زمـانـەراست کـز انسان هـزار بـو الـعـجبـی[٤]
تـهـی نـبـود زحـکـمت بـخـیـر مـنـر شد
بـخـوان (حـکـایت خـضر نبـی و قـتـل صبـی)
هـزار سال بـگـویـم اگـر ثـنـای شمـا
سخـن هـنـوز بـود در مـقـام بـی ادبـی

مــــحب آل رسول از گـــنــــه كـــى تــــرسد
(فــقــل لــمــذنــبــه ذنــبــه عــلــى رقــبــى)
بس است عرض خلوص اى (رضا) زبان دركش
بـنـزد آن كـــه بـــود در مــقـــام (يسمـــع بـــى)
جـنـاب شيـخ سعـيد آن حـفـيد قطب جـهـان
كـه يـافـتـه است زجـدش نشان مـنـتـخـبـى(٥)
دوم نـبـيـرهء فـرخـنـده (شيـخ مـعـروف) است
بــه فـضل و دانش او مـعـتـرف ذكـى و غـبـى
سوم سلالـــهء والا گـــهـــر جـــنـــاب نـــقـــيب
كـه شيـر رم كـنـد از وى بـگـاه پـر غـضبـى(٦)
دعـــاى ايـــن سه حـفـيـد است ورد روز و شبـم
بــه لـطـف خـود هـمـه را دست گـيـر يـا ربَّـى

..............................................................

(١) هركجا (خ).

(٢) خود كه كند ادعاى...(خ).

(٣) اگر بحرمت آل نبى بردار (خ).

(٤) زمانه را ست ازين سان (خ).

(٥) كه يافت است (ت).

(٦) سوم نبيرهء(م.).

(*) كێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون مەحزووف

(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)

وەك: ″ منم كه شهرهء شهرم به عشق ورزيدن

منم كـــه ديده نيالـــودهام به بدديدن″

تو كز نبيرهء كاك احمد (آل نبى): تۆ كە لە نەويرەی كاك ئەحمەدی شێخی و بەرەی پێغەمبەر. كفايت است ازين خوبتر چە مى طلبى: لەمە چاترت چ دەوێ؟ بس است قدر و شرف اين قدر كه جد شما است: ئەوەندە قەدر و شەرەفە بەسە كە كاك ئەحمەد باپیرەتانە. شفيع روز قيامت محمد عربى: محەمەدی عەرەبیش شەفاعەتخوازی

ڕۆژی قیامەتە. نیا محمد و مادر بتول و حیدر باب: باپیرە محەمەد و داك بەتوول و حەیدەر کە ئیمامی عەلییە، دەرگا: دیاردییەکی بۆ قەڵای خەیبەر تێدایە.. زهی سلالەء طاهر (فدیتکم بأبي): ئافەرین بترەژم، بنیچەی پاك و خاوێن (بابمتان بە گوری بێ). بەهر کجا کە نسب نامەء شما خوانند: لە کوێ ڕەچەڵەك نامەی ئێوە وەخوێنن. کرا رسد کە کند ادعای ذو نسبی،:کێ دەیپەرژێتێ لافی خاوەن سەیدایەتی لێ بدا. اگر بە حرمت آل نبی نمی بودی: ئەگەر بە حورمەتی بەرەی پێغەمبەر نەبا: بە نیمراه بماند دعای نیمەشبی: دوعای نیوە شەوێی لە نیوەی ڕێیێ دەمایەوە. اگر گذشت نزاعی میان ما چە عجب: ئەگەر کێشەیەکمان لە نێواندا ڕووی دابێ سەیر نییە. زمانە راست کز انسان هزار بوالعجبی: زەمانە هەزار مام عاجباتیی لە مرۆڕا بە خۆوە دیتووە. تهی نبود ز حکمت بخیر منجر شد: لە حیکمەت خاڵی نییە، کارەکە بە خێر گەڕا.. بخوان حکایت خضر نبی و قتل صبی) حەکایەتی حەزرەتی خدر پێغەمبەر و باسی منداڵە سێوییەکە وەخوێنە. هزار سال بگویم اگر ثنای شما: ئەگەر هزار ساڵ مەتح و پەسنی ئێوە بێژم. سخن هنوز بود در مقام بی ادبی: قسە دەکەوێتە باری بێ ئەدەبییەوە. محب آل رسول از گنە کی ترسد: هەواخواز و ئاشقی بەرەی پەیامبەر کەنگێ لە گوناه دەترسی؟ (فقل لمذنبە ذنبە علی رقبی): بەو کەسەی کە گوناهان دەکا، بێژە گوناهی لە ئەستۆ. بس است عرض خلوص ای (رضا) زبان درکش: (ڕەزا) عەرزی دڵسۆزی بەسە ئیدی، زمان وەکو شیری بڕندە دەرکێشە. بە نزد آن کە بود در مقام یسمع بی: لە خزمەت ئەوەی کە گوێ لە قسەم دەگرێ. جناب شیخ سعید آن حفید قطب جهان: جەنابی شێخ سەعید، ئەو نەوەیەی کە تەوەرەی جیهانە. کە یافتە است ز جدش نشان منتخبی: ئەوەی کە لە باپیریەوەی نیشانەی هەڵوژێردەیی دەس کەوتووە. دوم نبیرەء فرخندە (شیخ معروف) است: نەویرەی پیرۆزی (شێخ مەعروف)ە. بە فضل و دانش او معترف زکی و غبی: لە ئەردەو و زێدە زانایی و هونەردا زیرەك و کەودەن ددانی پێدا دەنێن. سوم سلالەء والا گهر جناب نقیب: سێیەم بنیچەی گەوهەر بڵند، جەنابی نەقیب. کە شیر رم کند از وی بە گاە پر غضبی: کە لە کاتی پڕ تووڕەییدا شێری لێ دەپرینگێتەوە. دعای این سە حفید است ورد روز و شبم: دوعا بۆ ئەم سێ نەوەیە ویردی سەر زمانی ڕۆژ و شەومە. بە لطف خود همە را دستگیر یا ربی: بە نوازشت و کەرەمی خۆت دەستگیری هەموویان بە.

## ٦٧

### برای امین فیضی*

(پیتی) یێ

الا ای هـــنــرمـــنـــد یـــار قـــدیـمـــی
تـــوئـــی خسروانـــرا سزای نـــدیـمـــی
زحـکـمـت بـپـرداخـتـی نـامــهء تـو
بـــــدادی در آن نـامــه داد حـکـیـمـی
هــوای (نسیــمــی) ازان گشتــه نــامش
کــه جــان پــرورانــد هــوای نسیــمــی
بـدانش تـرا هـیـچ هـمـتـا نـدیـدم
مــگــر جـوهــر فــرد و درّ یـتـیـمـی
تـو خـواهـی سفـر از یـمـن دورتـر کـن
امـیـن فـیـضـیـا در دل مـن مـقـیـمـی(١)

---

(١) تو در عین انجمن ما مقیمی(م).

(*) کێش: بەحری موتەقاریب موسەددەس
(فعولن فعولن فعولن)
وەك: ″ چە در پاش گردد بە معنی ز بانم
رسد مرحبا از زمــین و زمـــانم″

الا ای هنرمند یار قدیمی: هۆ هونەرمەندی یاری دێرین. توی خسروان را سزای ندیمی: هەر تۆ شایانی هاودەمیی پادشایانی. ز حکمت بپرداختی نامەای تو: لە حیکمەت و دانشتت سەربووره نامەیەك سەرووبەر ناوە. بداد در آن نامە داد حکیمی: لەو نامەیەدا دادی حەکیمیت دا. هوای نسیمی از ان گشتە نامش: شنەبای فێنك یا ″نسیمیی شاعیر″ لەوڕا نێوی وەرگرتووە. کە جان پروراند هوای نسیمی: چونکە شنەبای فێنك گیان دەپەروەرێنێ. نەسیمی: عیمادوددین نازناو نەسیمی لە ساداتی شیراز و شاعیرانی سەدەی نۆیەم، بە قسەی تەزکەرەی ″روز روشن″ سۆفی مەشرەب و مەلەوانی دەریای تەوحید بووە و قسەگەلێکی پێچەوانەی زاهیری شەرع بە زاردا

دەهات. لەبەر هەندێ بە فەتوای مەلایانی شیراز لە ساڵی ۸۳۷دا لە حەڵەب پێستیان گروو.

٦٨

## مناجات از درگاه قاضی الحاجات*

(پیتی) هێ

ای ریـز خـور خـوان نـوالت مـه و مـاهـی
جـودت چـو وجـودت ابـد و نـامـتـنـاهـی
بـر نـامـهء اعـمـال سیـاهـم قـلـم عـفـو
بـرکش کـه بـدل کـن سفـیـدیـم بسیـاهـی
بـودم مـن اگـر بـنـدئـی از خـواجـه گـریـزان
بـاز آمـدم ای بـنـدگـیت عـزّت شاهـی
بـر عـفـو وعـقـوبت نـبـود سود و زیـانت
ایـن هـر دو بـه پـیش تـو مساویست الـهی
بـیـرون شدن از ساحت مـلك تـو مـحـالست
من عبد توام، ملك توم، خواهی نخواهی[1]
ایـن دیـدهء گـریـانـم ویـن سیـنـهء سوزان[2]
بر صدق سخن می دهندم هر دو گواهی
صد بار امید است (رضا) را بەتو هر چند
سر تـا قـدمش غـرق گـنـاه است و مـنـاهـی

---

(۱) عبد توام وملك توام: (ت)، عبد توام در ملك توام: (م).

(۲) گریانم و وین: (ت، م).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)
وەك: ″ اندوه تو شد وارد کاشانەام امشب
مهمان عزیز آمده در خانەام امشب″

ای ریزه خور خوان نوالت مه و ماهی: ئەی بەرماوخۆری سفره و خوانی بەخششت مانگ و ماسی. جودت چو وجودت ابد و نا متناهی: سەخاو بەخششت هەتا هەتا دوایی نەهاتوو. برنامەء اعمال سیاهم قلم عفو – برکش که بدل شود به سفیدیم سیاهی: قەڵەم بەبەرنامەی کردەوە ڕەش و خراپەکانمدا بێنە، تا بە سپی وەگەڕێ. مەبەستی ئەوەیە تۆبەی کردووە و دەستی لە خراپە هەڵگرتووە. بودم من اگر بندەای از خواجه گریزان: ئەگەر منی بەندە لە خواجە هەڵاتووم. باز آمدم ای بندگیت عزّت شاهی: وا دووبارە وەگەڕام ئەی بەندەگیت شاهی. واتە من کۆیلەی لە ئاغای خۆ هەڵاتووم. بر عفو عقوبت نبود سود و زیان: سوود و زیان لە بەخشین و سزادان ناکەوێتەوە، چونکە ئەمانە بە لای تۆوە هەرتك یەك شتن خوایە. بیرون شدن از ساحت ملك تو محال است: لە قەڵەمڕەوی تۆ وەدەرکەوتن کارێکی نەکردەنی و مەحاڵە. عبد توام و ملك توام، خواهی نخواهی: ئەمن هەر بەندەی تۆم و موڵکی تۆم، بتەوێ و نەتەوێ. این دیدهء گریان و این سینهء سوزان: ئەم چارە بە گریانە و ئەم سینە سووتاوە: بر صدق سخن می دهندم هر دو گواهی: هەرتك شایەتی بۆ ڕاستی قسەم دەدەن. صد بار امیداست (رضا) به تو هر چند: (ڕەزا) صەد جار، ئومێدی بە تۆیە هەر چەندی. سر تا قدمش غرق گناه است و مناهی: سەرتاپای نوقمی گوناه و کاری خودا نە لێ کردووە.

## ٦٩

### در مدح کمالی پاشا*

(پیتی) یێ

دلـم از غـصّه پـر و کـیسەام از زر خـالـی
نـه عـطـا از مـتـصرف، نـه کـرم از والـی
نـه زمـالـیـه اعـانت، نـه ز اوقـاف مـدد
نـەز مـابـیـن هـمـایون، نـه ز بـاب عـالـی
قـبـلـەء اهـل کـمـالست کـمـالـی پـاشا
(مـن جـمـیـع الـوزرا، غـیـر کـمـالـی مـالـی)
داعـیـان را نـبـود طـاقت تـأخـیـر مـعـاش
بـنـگـر بـر سر احـوال پـریشان حـالـی

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەمەن مەخبوون ئەصلەم

(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: " صنما مردەء آنـــم کە تـــو جانـــم باشی

می دهم جان کە مگر جان جانم باشی"

دلم از غصّە پر و کیسەام از زر خالی: دڵم لە خەم و کەسەر پڕ و کیسەم لە زێڕ خاڵی. نە عطا از متصرّف، نە کرم از والی: نە بەخششت لە موتەسەڕیف و نە کەرەم و سەخا لە والییەوە. نە زمالیە اعانت، نە ز اوقاف مدد: نە لە مالییەوە یارمەتی و نە لە ئەوقافەوە بە دەنگەوە هاتنێك. نە ز مابین همایون، نە ز باب عالی: نە لە مابەینی هومایوونەوە، نە لە بابی عالییەوە. مەبەست لە "مابینی هومایوون" سەلاملغ و تەشریفاتی ڕەسمیی پیرۆزی پادشای دەوڵەتی عوسمانی. بابی عالی: بەو مەڵبەندی بڕیارە ڕەسمییەی، کە تا لەبەریەك هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەردەوام بوو، دەگوترا. قبلەء اهل کمال است کمالی پاشا: کەمالی پاشا ڕووگەی ئەهلی کەماڵە. من جمیع الوزرا غیر کمالی مالی: لە وەزیران لە کەمالی پاشا بەولاوە کەسی ترم نییە. داعیان را نبود طاقت تأخیر معاش: دوعاگۆیان تاب و تاقەتی دواکەوتنی مووچەیان نییە. بنگر بر سر أحوال پریشان حالی: بڕوانە حاڵ و باڵی حاڵ پەرێشانێ.

## ٧٠

## در تاریخ وفات شاکر افندی مکتوبچی می گوید*

(پیتی) یێ

ایـــــام چـــو پـــــروردەء خـــــود را کشد آخر

ای دوســـــــت دل آن بــە کــە بــە نـبـنـدی

دیـدی کــەچسان بستــەء فـرمــان اجـل شد

مـکـتـوبـچـی بـغـداد بـە آن پــایــە بـلـنـدی

سیــد نسب از سلسلــەء خــواجــەء چــاکــر

معروف بەخوش خلقی و مشهور بە رندی

تـأريـخ مـجـوهـر ز (رضـا) خـواسـتـم و گفت

(شد زيب گـلستــان جـنــان شاكـر افـنـدى)

.................................................................

(*) كێش: بەحری هەزەج ئەخرەب مەكفووف مەحزووف

(مفعولُ مفاعيلُ مفاعيلُ فعولن)

وەك: ″دردى كه مرا هست به مرهم نفروشم

ور عافيتش صرفه دهى هم نفروشم″

ايام چو پرورده‌ء خود را كشد آخر: ڕۆژگار لەبەر ئەوەی پەروەردەی خۆی دەكوژێتەوە. اى دوست دل آن به كه به أيام نبندى: ئەی دۆست وا چاكە كە دڵ بە ڕۆژگارەوە نەبەستی. ديدى كه چسان بسته‌ء فرمان اجل شد – مكتوبچى بغداد به آن پايه بلندى: دیدت مەكتوبچیی بەغدایێ چۆن بوو بە دابەستەی ئەجەل. مەكتەبچی، یا مەكتووبچی، بەو كارمەندە كە كاروباری ڕەسمیی دائیرەكانی بەڕێوە دەبرد، دەگوترا. سيد نسب از سلسله‌ء خواجه‌ء چاكر: بەرەچەڵەك لە نەژادی پێغەمبەر و لە جەلەی خواجەی خزمەتكارە. معروف به خوش خلقى و مشهور به رندى: بە خۆش ئاكاری و زیرەكی و وریایی نامێ. تاريخ مجوهر ز (رضا) خواستم و گفت: مێژووی گەوهەرداریم لە ڕەزا ویست، گوتی: (شد زيب گلستان جنان شاكر أفندى): شاكیر ئەفەندی بوو بە زینەتی گوڵستانی بەهەشتان.

٧١

**غوث ثانی***

**(پیتی)یێ**

مشهـور جـهـان بـه غـوث ثـانـى

شيـخ عـبـدالـرحـمـن طـالـبـانـى(١)

مـحـمـودش جد و احـمـدش بـاب

هــرسه ولــيــنــد قـطب اقـطــاب

مـحـمـود مـريـد پـيـر لاهـور(٢)

هـر چـند بـه زنگنه است مشهور؟

در اصل و نسب (گلی) است سوری
از گـلـبـن بـاغ کـاکـه سوری

..............................................................

(١) عبدالرحمان طالبانی: (ت ، م).

(٢) مریدی پیری لاهور:(ت).

(*) کێش: بەحری ڕەجەز مورەببەع مورەففەل

(مستفعلاتن مستفعلاتن)

وەك: " زاهد چە سازم با چشم و ابرو

آن ناوك افكن این سخت بازو"

مشهور جهان بە غوث ثانی: مەلا ئەوڕەحمانی تاڵەبانی بە غەوسی دووەم نێوی ڕۆیشتوو. محمدش جدّ و احمدش باب: محەمەد باپیری و ئەحمەدیش باویەتی. هر سە قطب اقطاب: هەرسێکیان وەلین و تەوەرەی تەوەرانن. محموود مرید پیر لاهور: مەحمود مریدی پیری لاهوورە. هر چند بەزنگنە است مشهور: هەر چەند بە زەنگنە نامێیە. در اصل ونسب (گلی) است: بە ڕەگ و ڕەگەما (گلە). از گلبند باغ کاکە سوری: لە چەپکە گوڵی باغی کاکە سوورییە.

## ٧٢

## جنگ طالبانی و زنگنە با داودە*

(پیتی) هەمەجۆر

از آن سو چـو (داودە) لشکـر کشیـد
از ایـن سو بـجـنـبـیـد (عـبـد الـحـمـیـد)
بـفـرمـود تـا (طـالـبـانـی) گـروه
نشستـنـد بـرخـانـەء زیـن چـو کـوه
بـرانـگـیـخت آن اشقـر دیـو زاد
چـو رستـم یـکـی سان لشکـر بـداد
جـنـاح از چـپ و راست بـر پـای کـرد
بـەقـلـب انـدرون خـویش را جـای کـرد

گروهی فرستاد بر میمنه
ز گردان گردن کش (زنگنه)
یکی زاندرون در کمین مصاف
گروهی ز فولاد خایان (جاف)
پی چرخ گردون گروهی دیگر
ز چابك سواران سیته به‌سر
به‌دست دگر رزم جویان (گل)
زبردست و زورآور و شیردل
نخستین از (گل) علم بر فراخت
به (تاویر) و (تالاو) و (نیجول) تاخت
ز آن هر دو ده جای (داوده) بود
به مردان جنگی بر آموده بود
(ممد) نام سالار آن انجمن
که گفتی کسی نیست همتای من
جهان را سزاوار سرعسکری
نژادم ز (خورشید خاور زمین)
منم نسل خاقان و سالار چین
به من راست شد پشت (داود) یان
زبن برکنم بیخ محمودیان
بگفت این دو لشکر به نیجول ماند
خدا صد سواری به تعجیل رساند
رسیدند سر ره گرفتند تنگ
برانگیخت دهمان آمد به‌جنگ
برادرش مدحت پس پشت او
تفنگ سه لوله در مشت او
برآورد چند آتش کارزار

بسی بــرنــیــامــد کــه بــرگشت کــار
جــوانــی زخــویشان او گــنــجــه نــام
هــمــی رانــد بــه تــوسن تــیــزگــام
زونــدش یــکــی کــلــه بــر تــوسنــا
بــغــلــطــیــد بــرخــاك لــرزان تــنــا
دلــیــران گــرفــتــنــد پــیــراهــنش
کــفــن گشت بــر گــنــجــه پــیــراهــنش
برآن خــاك شد پــیــکــر جــان چــاك
یــکــی گــنــج را کــرد بــایــد بــه‌خــاك
تــنــی چــنــد کــه بــودنــد خــویشان او
در آن حــمــلــه گشتــنــد قــربــان او
چــو (داوده) دیــد آتشی تــیــزخــیــز
هــمــان گــه گــرفــتــنــد راه گــریــز
بــطــاس انــدرون مــهــر انــداخــتــن
تــکــاور سوی قــلــعــهــا تــاخــتــنــد
دبــیــری کــه خــوانــدنــد اورا (امــیــن)
بــر آغــا (مــحــمــد) حــملــه بــردار کــین
بــر او بــانگ بــرزد کــه سرعسکــرا
مــرو تــا بــدانــی نشان مــرا
مــنــم پــور قــادر زلــیــخــای شیــر
شنــیــدم کــه آغــا در آن گــیــرودار
هــمــی رانــد مــرکب سراسیــمــه وار
فــرومــانــده گــفــتــی بــدست اجــل
چــو مسهــل خــورانش عــمــل بــر عــمــل
عــنــانش زکــف رفــتــه لــرزان چــوبــیــد
امــیــن در پش هــمــچــو دیــو سفــیــد

در ایــن بــود کــارو سرشرا بــبــنــد[۱]
چـو جـادوگـران را کـنـنـد حـیـلـه‌بند
بــزیــر زمــیــن کشتــه شد بــاز مــا
بـتـمـثـال آن مـــــرد جــــنگ آزما
بــه اسب دیــگــر تــا امــیــن شد سوار
بــزد خــیــمــه آغــا بــصـحــن حــصار
چـــو پـــوشیـــده رویـــان بـــی آبرو
بـکـنـجـی در آن قـلـعـه بـنـهـفت رو
دریـــده شدش پـــردهٔ نـــام و نـــنگ
زنـــام آوری بــاد مــانــدش بــه‌چـنگ
بسر بـــرد آن روز بـــا صد هـــراس[۲]
در آن قـلـعـه تـا رفت از شب دو پـاس
شبـی تـیـره فـرصت غـنـیـمت شمـرد
بـــه‌بـــیـــرون رفت راه دراجـــی سپـــرد
بـــه‌دراجـی آمـد جـگـر خستـه بـاز
چـــو دراج بـــرجستـــه از چـــنگ بـــاز
چـنـــان مـلك و مـالش بـه تـاراج شد
بـــه‌یك بـــازی چـــرخ بـــی تـــاج شد
کسی را کـــه بـــرداشت پـــاشای جـــاف
تـــوانـد کـنـد بــرنــظـر کـوه قـاف
چـو مـحـمـود پـاشا دراین ملك نیست[۳]
(دراجـــی) کـــدام است (داوده) کـــیست
سگ کـــــــیست (داوده)ء دودکـــــــی
زنـد پـنـجـه بـا جـعـفـر بـرمـکـی
عشایـــر هـــمـــه بـــنـــدگـــان وی انـد
برآوردهٔ دودمـــــــــان وی انـــــــد

پس ایــن دودمـــان واجب الــحــرمــتــنــد
اگــر راست خــواهـــی ولـــی نــعــمــتــنــد
یــکـــی از دعـــا گـــوی ایشان (رضـا) است
(رضـا)یـــی کـــه گـــرخشم گـــیـــرد قـــضـا

.............................................................

(١) در این بود ... ... (ت)، درین بود کار و سرشرا ببند: (م).

(٢) بسربر ..... هراس: (ت)، بسر برد آن روز باصد هراس: (م).

(٣) مەحموود پاشا کوڕی محەمەد پاشای جافە.

(*) کێش: بەحری موتەقاریب موسەممەن مەحزووف

(فعولن فعولن فعولن فعول)

وەك: "چو آن فتنه از خواب سر بر گرفت

صراحی طلب کرد و ساغر گرفت"

ز سویی چو داوده لشکر کشید: کە هۆزی داوودە لە لایەکەوە لەشکری کرد. ازین سو بجنبید عبدالحمید: لەم لاوە عەبدولحەمید جمیا. بفرمود تا طالبانی گروە: فەرمووی تا دەستەی تاڵەبانی. نشستند بر خانەء زین چو کوە: وەك چیا بە سەر خانەی زینەوە هەڵنیشتن. واتە سواری ئەسپەکانیان بوون و دەتگوت کێون. بر انگیخت آن أشقر دیو زاد: ئەو مارۆ دێو زادە بزووت. چو رستم یکی سان لشکر داد: یەکێك وەك ڕۆستەم لەشکری ریز کرد. جناح از چپ و ڕاست برپای کرد: باڵی لەشکری لە چەپ و ڕاستەوە ئامادە و تەیار کرد. بە قلب اندروون خویش را جای کرد: خۆشی لە پێشەوە، لە ناوەندێ جێی خۆی گرت. گروهی فرستاد بر میمنە: دەستەیەکی هەناردە باڵی چەپ. ز گردان گردن کش زنگنە: لە ئازایانی گەردن بڵندی زەنگەنە. تری زاندرون و در کمین مصاف: یەکێ لە نواوە لە بۆسەی شەڕو هەڵمەتدا. گروهی ز فولاد خایان جاف: دەستەیەك لە گیان پۆڵایانی جاف. پی چرخ گردوون گروە دگر: دەستەیەکی دیکە بۆ چەرخەو سوڕ و گوڕ، ز چابوك سواران سیتە بە سر: لە چاپك سوارانی سێتە بەسەر، واتە کوڕانی شۆڕەسوارانی تیرەی هەمەوەند، کە مێژەری فرێتیان بە سەرەوە دەبەست. بە دست دگر رزم جویان (گل): دەستەیەکی تر لە گەڕناسانی گل. زبر دەست و زورآور و شیر دل: زەبردەست و بەهێز و شێردڵ. نخستین از (گل) علم بر فراخت: بۆ یەکەم جار لە گلەوە ئاڵای هەڵ کرد. (تاویر) و (تالاو) و (نیجول) تاخت: هێرشی کردە سەر

تاوێر و تالاو و نەیجوول. ز آن هر دوو جای داوده بود: لەو دوو شوێنەوەی کە داوودەی پێ دەڵێن. بە مردان جنگی بر آمد و بود: بەرەنگاری پیاوانی شەڕکەر بۆوە. ممد نام سالار آن انجمن – کە گفتی کسی نیست همتای من: مەمەد ناوێك، سەرکردەی دەستەی شەڕکەر، دەیگوت، کەسێ نییە هاوتای من. منم وارث تخت اسکندری: منم میراتگری تەختی ئەسکەندەری مەکەدۆنی. جهان را سزاوار سر عسکری: شایستەی سەر لشکریی جیهانم. نژادم ز خورشید خاور زمین: ڕەچەڵەك و نژادم لە خورشیدی خاوەر زەمینەوە کەوتووەتەوە. منم نسل خاقان سالار چین: منم نەویرەی خاقان و سالاری چین. بە من راست شد پشت داودیان: بە من ڕاست بووەوە پشتی داوودییەکان. ز بن بر کنم بیخ محمودیان: ڕەگ و ڕیشەی مەلا مەحموودی زەنگنە لە بن دێنم. بگفت این دو لشکر بە نیجول ماند: گوتی، ئەم دوو لەشکرە با لە نەیجوول بمێنێتەوە. خدا چند سواری بە تعجیل نارد: خواوەند چەند سوارێکی بە پەلە هەنارد. رسیدند سر رە گرفتند تنگ: گەیشتن، سەری ڕێیان گرت. بر انگیخت دهمان آمد بە جنگ: دەهمان بزووت، هاتە بەر مەیدانی شەڕ. برادرش مدحت پس پشت او: مەدحەتی برای لە پشتیەوە. تفنگ سە لولە در مشت او: تفەنگی سێ لوولەی بە دەستەوە. بر آورد چند آتش کارزار: چەند تەقەیەکی کرد. بسی بر نیامد کە برگشت کار: زۆری نەخایاند، کە کار بە بارێکی دیکەدا وەرگەڕا. جوانی ز خویشان او گنجە نام: لاوێك لە خزمانی وی گەنجە نێو. همە راند بر توسن تیز گام: ئەسپە سەرکەشەکەی تاو دابوو. زوندش یکی کلّە بر توسنا: یەکێك کەللەیەکی لە سەرشەق دا. بغلطید بر خاك لرزان تنا. لەشی بە لەرزە تخێڵی عاردی بوو. دلیران گرفتند پیرامونش: دلێران دەوریان دا. کفن گشت بر گنجە پیراهنش: کراسەکەی بوو بە کفنی. بر آن خاك شد پیکر جان چاك: لەسەر ئەو خاکە بوو بە پەیکەری گیانی شەقکراو. یکی گنجەرا کرد باید بە خاك: دەبووا یەکێ گەنجە بە خاك بسپێرێ. تنی چند کە بودند ز خویشان او: چەند کەسێك کە لە خزمانی وی هەبوون. دران حملە گشتند قربان او: لەو هەڵمەتەدا بە گوریی وی بوون. چو داودە دید آتش تیزخیز: ئەوجا کە داودە ئاوری تێسکەیان دیت. همان گە گرفتند راە گریز: هەر لەو دەم ڕێی هەڵاتنیان وەبەر گرت. بە طاس اندرون مهر انداختن. مۆرەی بەختیان بۆ نێو کاسە هەڵدا. تکاور سوی قلعها تاختند: بە تکان و هەڵمەت هەڵیان کردە سەر قەڵایەکان. دبیری کە خواندند اورا أمین: میرزایەك کە ئەمینیان پێ دەگوت: بر آغا ممد حملە بردار کین:

هەڵمەت هێنی لە مەمەد ئاغا بە کین. بر او بانگ برزد کە سر عسکرا: تێی ڕاخوڕی، هۆ سەرلەشکر. مرو تا بدانی نشان و مرا: تا بزانی ناوونیشانی من. منم پور قادر زلیخای شیر: منم قادر زڵێخای شێر. چە قادر زلیخا و چە اردشیر: چ قادر زڵێخا و چ ئەردەشێر، واتە فەرقیان نییە. شنیدم کەآغا در این گیرودار: بیستم ئاغا لەو شەڕەدا. همی راند مرکب سراسمەوار: ئەسپی تاو داوە سەرگەردان و سەر لێشێواو. فرومانده گفتی بە دست أجل: هەر دەتگوت بە دەستی ئەجەلەوە داماوە. چو مسهل خورانش عمل بر عمل: وەك دەرمانی ڕەوانی خۆر، عەمەل لەسەر عەمەل. دەی فیرکاند. عناش ز کف رفته لرزان چو بید: دەستە ڕێشمەی لە دەست ترازاوە وەکوو بیی نێو ئاو هەڵدەرزی.

امین در پسش همچو دیو سفید: ئەمین لە پشتیەوە وەکوو دێوی سپی. در این بود .............. (ئەم بەیتە هەر ئەوەندەی هەیە). چو جادوگرانرا کنند حیله بند: وەك فێڵ لە جادووگەران بکەن. بە زیر زمین کشته شد بازما: بە تمثال آن مرد جنگ آزما: وەك ئەو مەردە گەڕناسە. بە اسب دیگر تا امین شد سوار: تا ئەمین سواری ئەسپێکی دیکە بوو. بزد خیمە آغا بە صحن حصار: ئاغا خەیمەو خەرگای لە ناو حەوشەی حەسار هەڵدا. چو پوشید روی بی آبرو: کە ڕووی بێ ئابڕووی داپۆشی. بە کنجی در آن قلعە بنهفت رو: خۆی لە کونجێك، لە نێو ئەو قەڵایەدا وەشێرد. دریدە شدش پردەی نام و ننگ: پەردەی عەیب و عاری دادڕا. بە سر....... (ئەم بەیتە بەم پنتانە پڕکراوەتەوە) در آن قلعە تا رفت از شب دو پاس: لەو قەڵایەدا تا شەو دوو بەتری چوو. شبی تیرە فرصت غنیمت شمرد: شەوێکی تاریك هەلی وەدەست هێنا. بیرون رفت راه دراجی سپرد: وەدەرکەوت، ڕێ سپاری ڕێی دوڕاجی بوو. بە دراجی آمد جگر خستە باز: بە حاڵێکی زۆر پەرێشان و بەبرینداریيەوە گەیشتە دوڕاجی. چو دراج بر جستە از چنگ باز: پۆڕێك لە چەنگی باز ڕاپەڕیبێ. چنان ملك و مالش بە تاراج شد: ماڵ و سامانی بە جۆرێ بە تالان و بڕۆ چوو. بە یك باز پی چرخ دراج شد. بە بازێك بەچەرخە وەدووی باز کەوت. کسی را کە برداشت پاشای جاف: کەسێك پاشای جاف بە باڵیەوە بگرێ. تواند کند بر نظر کوە قاف: دەتوانێ کێوی قاف ڕەچاو کا، کێوی قاف، بگرێتە بەر چاوی خۆی. چو محمود پاشا درین ملك نیست: یەکێکی وەکوو مەحموود پاشای جاف لەم وڵاتەدا نییە و نابێتەوە. دراجی کدامست داودە کیست: دوڕڕاجی کێیە داودە کێیە. دیارە مەحموود پاشا یارمەتیی تاڵەبانیی داوە. سگ کیست (داودە)ء

دودکی: داوده‌ی دوودەکی سەگی کێیە. زند پنجه با جعفر برمکی: پەنجه لەگەڵ جەعفەری بەرمەکیدا بدا. عشایر همه بندەگان توینند: خێڵات سەرلەبەر کۆیلەی تۆن. براوردەء دودمان توینند: پەروەردەی بنەماڵەی تۆن. پس این دودمان واجب الحرمتند: ئەم بنەماڵەیە دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێ. اگر راست خواهی ولی نعمتند: ئەگەر ڕاستت گەرەکە خاوەن نیعمەت و پیاوەتین. یکی از دعا گویی ایشان (رضا) است: یەکێ لە دوعاگۆیانی وان (ڕەزا)یە.

## ٧٣

## جنگ کردن زنگنه وهموند*

(پیتی) هەمە جۆر

(هماوند) جمله بەسالار خان[١]

شبـیـخـون نـمـودنـد از بـازیـان

تـکـاپـوی جولان بـەسر حد جنگ

در آنجا بهم بر زدند چون پلنگ

پس از حرب و جنگ و جدال کثیر

ز خـانـچـی برآمـد یـکـی نـره شیر

فــرو آمـــد از اسب فـــرزنـــد زال

غـفـور دلاور تــهـمـتــن مـثــال

تـفـنـگـی بـەکردار آذر گشسب

برآورد بـنـــهـــاد بـــر زیـــن اسب

بەسوراخ جاسوس بردوخت چشم

بــەابــرو گـره بـرزد از روی خشم

چـو انـگشت بـر پـای چـقـمـاق زد

تـوگـفـتـی کـه آتـــش در آفـاق زد

چـو زد گـولـلـه بـرسینـه فتَّاحرا

بـــدست اجـــل داد مــفـــتـــا حـــرا

بـــخـــاك انــدر آورد سر چــنــگــنــه
نــه‌خواب است پـرخـاش بـا زنگنـه
چو دیدند این گونه زخم درشت
سپـــاه مـــخـــالـف نـــهـــادنـد پشت
گـــریـــزان زبـــیـــم سواران خـــان
تـــبش درتـــن ولـــرزه در اسـتـخـوان
ز جـنـگـــاوران روی بـــرتـــافــتـنـد
پــزی چــنـد بــا خـویش بـرداشتند
تــلـف شد اگـر گـوسـفـندی دویست
بسی شد اگــر گـوسفـنـدی دوسیت
بسی دیده برکشته‌ها خون گریست
اگـــر گـــلـــه‌ای چـــنـــد تـــاراج شد
بسی کــلــه بــر نـیـزه‌هــا تـــاج شد
دلـیـری شش آتـــش در آن کـــارزار
شنـیـدم فـرومــانـده اسبش ز کـــار
پـــیـــاده بـــر آویـــخت بـــاسرکشان
تفنگی بـه‌کف داشت آتش فـشان
امـیـن حـاجـی آن بـرگـزیـده سوار
نــهــان شد زپـیـچش بـه‌تـاریك غـار
دویـــد در پـــی او بـــه‌غـــار انـــدرون
ربوده چو گرگ و کشیدش بیرون
به‌خربی سرش را زتن دور کرد
گـــرو بـــرده از پـــهـلـــوانـــان پـــیش
بمردی (ششه) رستم عصر خویش
درآنجا که جولانگه (جاسم) است
چه جای(فتاح)و (عزه)و(رستم) است

هــر آنکـه ببـیند جـهانبـخش را
فــرامش کــنــد رستــم و رخش را
سیـــر بـــرسر آورد  آغــا (کـریـم)
بەقلب سپه تاخت بی ترس بیم
پس پشت او تـــــا رسیـــــده بسر
شنـیـدم هــمــیـن گفت بــا او پـدر
تـو کـه آیـدت از دهــان بـوی شیـر
کـه گفـتت بـیـایـی بـجـنگ دلـیـر
چـنــان پــاسخش داد آن شیـرزاد
که فرزند چنین را ز مادر مباد
کــه پشت پــدر را بــدشمــن دهــد
همان به که خود را بکشتن دهد
تـو گـویـی (فـرامـرز) مـن بـیـژنـم
بــەهـر جـنگ پشت و پـنـاهت مـنـم

.................................................................

(١) از بهر سازان و خان: (ت)، جمله سالار خان(م).

(*) کێش: بەحری موتەقاریب موسەممەن مەحزووف

(فعولن فعولن فعولن فعول)

وەك: ″ بزرگان ایران پر از داغ و درد

رخان زرد و لبها شده لاز ورد″

هماوند از بهر سازان و خان: هەمەوەند بۆ سازان و خان. نێوی دوو شوێنن. شبیخون نمودند از بازیان: لە بازیانەوە شەوەیخوونیان کرد، شەو لە ناکاو لە دژمنیان هەڵکرد. تکاپوی جولان به سرحد جنگ: وەرە و برۆی هێرش و هەڵمەت بۆ سەر سنوور دەستی پێ کرد. در آنجا بهم برزدند چون پلنگ: لەوێندەر وەك پڵینگ بە یەکیاندا دا. پس از حرب و جنگ و جدال کثیر: پاش شەڕ و شۆڕێکی زۆر. ز خانچی برآمد یکی نره شیر: نەڕە شێرێك لە خانچییەوە هەڵستا. فرو آمد از اسب فرزند زال: فرزەندی ڕۆستەمی زاڵ لە ئەسپ پیادە بوو. غفور دلاور تهمتن مثال: غەفووری

دلاوەر، لە گوێن توهەمتەن. تفنگی بە کردار أذر گشسپ: تفەنگێکی لە کردەی ئازەر گوشەسپ دەرهێنا و لە سەر زینی ئەسپی دانا. وشەی آذر گشسپ: (ف.) لە "آذر" بە مانای ئاگر و "گشن"، بە مانای نێر، یا بە خوایشتە. "اسب" بە مانای ئەسپە. ئەسڵەکەی "اذر گشنسب"ە.. یەکێ لە سێ نێوی پیرۆزی پارێزگاری جیهان. نێوی ئاورخانەی وشتاسبە، کە لە بەڵخ بووە. گەنجینەکانی گوشتاسبیش لەوێ بوون ئەسکەندەری مەکەدۆنی تالانی کردوون. هێندێ دەڵێن، کتێبی ئاڤێستا و زەند ئاڤێستاش لەوێندەر بوون. گوشتاسب: بە هەموو ئاورخانەیەکیش دەگوترێ. بە مانای کارەباش هاتووە. نێوی فریشتەیەکیشە کاری ئاوری لە ستۆیە، هەمیشە لە دوڕ ئاوردا دەژی. میر وەیسی دەڵێ:" سە آتش فروزان ببردی بدست چو آذرگشسب و چو خرداد و مهر".

بە سوراخ جاسوس بردوخت چشم: کەسیلە و نیشانەی گرت. بە ابرو گره برزد از روی خشم: لە تووڕەییيان کرچ هەڵات و گرێی کەوتە هەنیە. چو انگشت بر چقماق زد: کە پەنجەی بە پەلەپیتکەی تفەنگدا نا. تو گفتی کە آتش در آفاق زد: هەر دەتگوت ئاوری لە دنیایێ بەردا. چو زد گولله بر سینهء فتاح را: کە گوللەیەکی لە سینگی فەتاح دا. بە دست اجل داد مفتاحرا: کلیلی بە دەست ئەجەلەوە دا. دیارە لە نێوان فەتاح و مفتاحدا جیناسێك هەیە. بە خاك اندر آورد سر چنگنە. سەری چنگانەی بە عاردیدا دا. وشەی "چنگنە" بە مانای قەرەج دێ.. ئەم وشەیە لە کتێبی "کردلر" ی د. فرێجی درۆزنانەدا کە بە ئەسڵ ناجی ئیسماعیل پەلستەری ئاڵبانی بە ناوی د. فرێجەوەی داناوە، بە دوورو درێژی باسی لێوە کراوە. بە هەموو زمانە ئەورووپاییەکان هەیە.. وشەی چینگەنە بە ڕەچەڵەك فارسییە. بە خەڵكێك دەگوترێ کە گۆیا لە هندستانەوە کۆچیان کردووە و بە هەموو دنیادا پەرت بوون و وەك ڕەوەند و کۆچەر لە هەموو دنیایێ دەگەڕێن. لە بیرم دێ لە ساڵی ١٩٥٦دا لە ئەستەمبوڵ لە بەی ئۆغلوو، لە ئاپارتمانێکدا، لە کن پیرەژنێکی ئاڵمانی تەبار ژوورێکم بە کرێ گرتبوو، ڕۆژێکیان لە باڵکۆنی ژووری سەرووترەوەم دانیشتبووم، لە سەرەوە تەق و هۆڕێکی ناخۆش دەهات، ناڕەحەتی کردبووم. لە شووشەبەندی باڵکۆنەکە نزیك کەوتمەوە، سەرێکم هەڵبڕی، تواشام کرد کرێکارێك لە پانسیۆنەکەی سەرووی منەوە خەریکی پەنجەرە چاکردنەوە بوو... بە دەست سڵاوێکم لێ کرد، سڵاوی ساندمەوە، گوتم کەنگێ لێ دەبیەوە؟ گوتی: زۆری نەماوە. لە کاورام پرسی خەڵکی کوێی؟ گوتی ئیتالیانیم و

خەڵکی فلۆرەنسەم. کاورا بە تورکییەکی ئەستەمبۆڵیی ڕەوان قسەی دەکرد. پرسی: تۆ خەڵکی کوێی؟ گوتم عیراقیم و کوردم. گوتی: جینگەنەی؟ منیش گوتم نەخێر. من کوردم. کوردت نەبیستووە؟ خۆ تورکیا بیست میلیۆن کوردی تێدا دەژی. کابرا گوتی: تورکەکان لە ئەستەمبۆڵ بەم کوردانە چینگەنە دەڵێن.. منیش تێم گەیاند وا نییە و دەبێ ئەو وەك ئەورووپاییەك بە قسەی تورك نەکا. قسە قسە دێنێ. بڕێ قسەی قۆڕ و دژمنانە لەمەڕ کورد لە پێشەکیی کتێبی "کرد"دا کە بە ناو ئی د. فرێجی ئاڵمانییە، نووسراوە... لەم پێشەکییەدا نووسراوە ژمارەی وشەکانی زمانی کوردی لە ۳۲۲ وشەی زێتر کوردی تێدا نییە. لە باسی هۆزی "زەنگنە"دا، زەنگنە بە قەرەج لە قەڵەم دراون.. نە خوب است پرخاش با زنگنە: سەر خستنە سەر زەنگنە باش نییە. چو دیدند این گونە زخم درشت: کە ئەم جۆرە برینە درشتەیان دیت. سپاه مخالف نهادند پشت: سپا پشتیان لە شەڕ کرد. گریزان زبیم سواران خان: بە هەڵاتن لە ترسی سوارانی خان. طپش در لب و لرزە در استخوان: لێو بە تەتەڵە و هێسك بە لەرزە. ز جنگ آوران روی بر تافتند: ڕوویان لە جەنگاوەران هەڵگێڕایەوە، هەڵاتن. پزی چند با خویش برداشتند: چەند پەزێکیان بە گەڵە خۆدا برد. تلف شد اگر گوسفندی دویست: ئەگەر چی دوو صەد مەڕێك لە ناو چوو. بسی دیدە بر کشتەها خون گریست: بەڵام زۆر چاو لە وەگەڕانەوەکاندا خوێن گریان. اگر گلەای چند تاراج شد: ئەگەر چەند مێگەلێکیش بە تاڵان چوو. بسی کلە بر نیزها تاج شد: زۆر لە سەر و کەللان بوون بە تانجی سەرە نێزە. دیارە لە نێوان وشەی "گلە"دا جیناس هەس. شاعیر بە ئاوڕدانەوە لە کەللە بە تانج بووی سەرە ڕمی کوژراوان، کەللەیانی بە تانج شوبهاندووە.. تەشبیهێکی جوانە. دلیری شش آتش در این کارزار: دلێرێکی شەش ئاتەشە، واتە ئازا، لەم شەڕەدا. شنیدم فرومانده اسبش ز کار: بیستم ئەسپەکە پەکی کەوتووە، پیادە بر آویخت با سرکشان: بە پیادەیی هەڵی کردە ئازایانی سەرکێش: تفنگی بە دەست داشت آتش فشان: تفەنگێکی بەدەستەوە بوو، ئاور پژێن امین حاجی آن برگزیدە سوار: ئەمین حاجی ئەو سوارە هەڵوژێردەیە. نهان شد زپیخش بتاریك غار: لە پڕ لە تاریکیی ئەشکەوتدا ون بوو. دوید پێ او بە غار اندرون: لە نێو ئەشکەوتەکەدا وەدووی کەوت. ربودە چو گر کشیدش بیرون: وەکوو گورگ ڕفاندی و لە ئەشکەوتی وەدەرهێنا. بە ضربی سرش را ز تن دور کرد: بە یەك لێدان سەری لە کەلەشی دوور ئێخست. بسی چشم بدخواهرا کور کرد: زۆر چاوی بەدخوای کوێر کرد. گرو بردە از پهلوانان پیش:

گرێوی لە قارەمانانی عەیام زوو بردەوە. بە مردی (ششه) رستم عصر خویش: بە مەردیی شەشە، کە ڕۆستەمی سەردەمی خۆی بوو. مەبەستی ئەورەحمان شەشەیە کە پیاوێکی قارەمانی سەروبەندی خۆی بووە. در آنجا کە جولانگە (جاسم) است: لەوێدا کە جەولانگای جاسمە. چە جای فتاح و عەزەم و رستم است: جێی فەتاح و عەزەم و ڕۆستەم لە کوێ دەبێتەوە.. هر آنکه ببیند جهان بخش را: هەر کەسێ جیهانبەخش ببینێ. فراموش کند رستم و رخش را: ڕۆستەم و ڕەخشی وی لە بیر دەکا. مەبەست لە ڕەخش: ئەسپەکەی ڕۆستەمە. سپر بر سر آورد (آغا کەریم): کریم ئاغا مەرتاڵی بڵند کرد. بە قلب سپە تاخت بی ترس و بیم: بێ ترس و خۆف هەڵی کوتایە سەر سپا. پس پشت او تا رسیدە پسر: تا کوڕەکەی لە پشتیەوە پێڕا گەیشت. شنیدم همی گفت با او پدر: گوێم لێ بوو بابی پێی گوت: تو کە آیدت از دهان بوی شیر: تۆکە بۆنی شیری خاوت لە زار دێ. کە گفتت بیایی بە جنگ دلیر: کێ گوتی بێیە شەڕی دلێرانەوە؟ چنان پاسخش داد آن شیرزاد: ئەو بەچکە شێرە بەو جۆرەی بەرسڤ دایەوە: کە فرزند چنین را ز مادر مباد: کە فرزندێکی وا قەت لە دایك نەبێ. کە پشت پدررا بە دشمن دهد: پشتی باب بە دژمن بدا. همان بە کە خودرا بە کشتن دهد: وا چاکە خۆی بە کوشتن بدا. تو گویی فرامرز من بێژەنم: تۆ دەڵێی فەرامەرزی و من بیژەنم. بە هر جنگ پشت و پناهت منم: لە هەموو شەڕێکدا پشت و پەنات منم.

## ٧٤

### ترجیع بند در نعت سرور کائنات*

(پیتی) هەمەجۆر

ای جـــهـــان آفـریـن ثـنـا گـویت
وی دو عــالــم مــعــطًـر از بــویت
ساکــنــان سرادق مــلــکــوت
هــمــه قــربــان یك سر مــویت
گــل زخــونــیــن دلان رخسارت
لالــــه از هــنــدوان گــیسویت
لالــــه در بـــاغ داغــــدار رخت
سرو مــــائــــل بــــقــــد دلجویت

سرمه مفتون چشم (مازاغ) است
نافهء دلریش خال هندویت
عارضت (والضحی) خطت (والليل)
(قل هوالله) حرز بازویت
(قاب قوسین) را نمی دانم
جز کمانهای هردو ابرویت
نسخهء کائنات هر چه دروست
شرح رمزی زمصحف رویت
باز گویم غم اسارت خویش
بزبان فصیح لاهویت
عرش کمتر بهای مشت گلی
که بر او آرمیدهٔ پهلویت
روز و شب جبرئیل در پرواز
بی سر و پا همی دود سویت
روضه خوانی کند بنظم در پرواز
همچو درویش بر سر کویت
(کز سرا پردهء مقدس ذات)
بر سراپای انورت صلوات)
ای منادی به کاف و هایا عین
وی منادی (انا النبی بحنین)
جبرئیل امین به امر خدا
وحیت آور کای شه کونین
خیز برنه قدم بهکوی قدم
خیز برکش علم زعلم بعین
به مقامی درآمدی که در او
نه (متی) را مجال بود، نه (این)

(قـــاب قـــوسيـــن كـــان او ادنـــی)
بـیـن مـولـی الـوری وبـیـنك بـیـن)
قسمت مـــی دهـــم بـــهجـــان حسن
بسر مـــرتـــضی بـــخـــون حسیـــن
روز وا (أمـــتـــی) کـــه پـــیشروی
بـــه امـــیـــد شفـــاعت ثـــقـــلـــیـــن
کـــن در آن روز یـــا رسول الـــلـــه
نـظری سوی مـن بـه گـوشهء عـیـن
بـــنـــواز و مـــرانـــم از لب شوض
تـــر کـــن از آب کـوپـرم (شفـتـین)
ای بـــکـــویت سعـــادت ابـــدی
وی ز رویت شرافت حـــرمـــیـــن
مـــا از امـر تـو غـافـل و تـو بـه مـا
مشفـق و مـهـربـان تـر از ابـویـن
در فـرار ایـن درود مـیـخـوانـم
بـــاز پـــرسنـد از تـوام مـلـكـیـن
(کـــز سراپـــردهء مـــقـــدس ذات)
بـــر سراپـــای انـــورت صلـــوات)
خـواجـهء انـبـیـاء وخـتـم رسول
هـــادی خـــلـــق و پـیشوای سبـــل
ای همه ممکنات جسم و تو جان
وی هـمـه کـائـنـات خـار و تـوگل
مـحـرم کـردگـار و مـهـبـط وحـی
مـهـتـرا اصفـیـاء و مـظـهـر کـل
(لـم تـلـد مـثـلـك الـنساء فـتـی
لـم یـجـد شبـهك الـزمـان رجـل)

صفت شانئت هو الابتر
لقب باغضت زنیم و عتل
در قیامت چو ذوالجلال ترا
میدهد رخصت شفاعت کل
آید از بارگاه قدس خدا
(لك ماشئت یا نبی فقل)
فکر من کن که کردهام تسبیح
در خرابات رهن شاهد مل
تا مرا چون توی شفیع چه باك
ز آتش دوزخ و سلاسل و غل
فیل [خیل] محمودم نمی ترسم
از دم کرنا و بانگ دهل
به هوای تو مست و بی پروا
نعت گویان خرامان از سر پل
(کز سراپردهء مقدس ذات
بر سراپای انورت صلوات)

---

(*) کێش: بەحری خەفیف موسەددەس مەخبوون مەحزووف
(فاعلاتن مفاعلن فعلن)
**ای جهان آفرین ثنا گویت:** ئەی جیهان دروستکەر مەتح و سەنا وێژت. **وی عالم معطَّر از بویت:** وەی هەردوو دنیا بە بۆن و بەرامە لە بۆنت. **ساکنان سرادق ملکوت:** نیشتەنییانی سەراپەردەی مەلایەکەتان. **همه قربان یك سر مویت:** هەموو بە گوریی یەك سەری موویەکت. **گل ز خونین دلان رخسارت:** گوڵ لە دڵ خوێناوییانی ڕوخسارت. **لاله از هندوان گیسویت:** لالە لە هندیانی پرچت. **لاله در باغ داغدار رخت:** لالە لە باغ داخداری ڕووت. **سرو مائل بند دلجویت:** سەروی مل لارکەرەوە بەندی یاڵای دڵڕفێنت. **سرمه مفتون چشم (مازاغت):** کل ئاشقی نیگای ڕاست و ڕەوانت. ″ما زاغ″ لە ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێ: **مازاغ البصر وما طغی.** **نافه دلریش**

خال هندويت: نێوك دڵ برينداری خاڵی ڕەشی وەك كيژە هنديی ڕەشت. عارضت (والضحی) خطت (والليل): ڕوومەتت وەك هەتاوی چاشتان و برۆت وەك شەوەزەنگ. ديارە لە هەردوو تەشبيهەكەدا، جەمسەر، يەكەميان سپێتيی ڕۆشنايی و دووەميان ڕەشيی تاريكييە.. قل هو اللّه حرز بازويت: ئايەتی قل هو اللّه بازيبەندی بازووت.

قاب قوسين نمی دانم: ئەمن ئەوەندكۆكە مەسافەيەی نێوان كەوان و مشتووی كەوان نازانم. واتە ئەتۆ لە خواوە نزيكتری تا پێغەمبەر.... جزكمان های هر دو ابرويت: تەنیٚ هەر كەوانەكانی هەردوو ئەبرۆت دەزانم. نسخەء كائنات هر چە دروست: نوسخەی جيهان هەرچييەك لەوێدايە. شرح رمزی ز مصحف رويت: شرۆڤەی نمايەكە لە قورئانی ڕووت: شێخ ڕەزا ديارە دياردیی بۆ ئۆلی ″حرووفی″ و ″نوقتەوی″ فەرمووە، كە لايان واسە، قورئانی پيرۆز سەرلەبەر لە ڕوخساری ئەفراندەی خوا خۆيدا دەتوانی وەخوێنی. باز گويم غم اسارت خويش: با خەمی ئەسارەت بەدبەختيی خۆمت بۆ بگێڕمەوە. بە زبان فصيح لاهويت: بە زمان فەسيحی لاهووتت. عرش كمتر بهای مشت گلی: عەرش و بارەگای خوا لە بەهای مستیٚ گڵ كەمترە. كە برو آرميدە پهلويتك، كە پاڵت لەسەر داوەتەوە. روز و شب جبرئيل در پرواز: ڕۆژ و شەو حەزرەتی جبرائيل لە فڕيندايە. بی سر و پا همی دود سويت: شپرزە وەك سەرو پێی پێوە نەبیٚ لە دووت هەڵوەدا و سەراسيمە و سەرگەردان. روضەخوانی كند بە نظم در پرواز: لە هەڵفڕيندا ڕەوزەخوێنی بە شيعر هۆنينەوە دەكا. همچو درويش بر سر كويت: هەروەكو دەروێش لەسەر سيلەی گەڕەكت (كز سراپردەء مقدس ذات): كە لە سەراپەردەی پيرۆزی زاتی خواوە. (بر سراپردء انورت صلوات): سڵاوات لە سەراپەردەی ڕووناكترت. ای منادی بە كاف و ها، يا عين: ئەی بە كاف ها، يا عەين بانگكراو. وەی منادی (انا النبي بحنين): وەی بانگ ڕاهێڵ (منم پەيامبەر لە حونەين). شەڕی بەدر و حونەينی مەبەستە. جبرئل امين بە امر خدا: جبرئيلی ئەمين بە فەرمانی خوا. وصيت آورد كای شە كونين: وەسيەتی هێنا، كە ئەی شای هەردوو جيهان. خيز بر نە قدم بە كوی قدم: هەڵستە سەر پێيان، بەرەو گەڕەكی هەر هەوە و هەس. بە مقامی درآمدی چو در او: لە پلەيەكەوە سەرت دەرهێناوە. نە (متی) را مجال بود و نە (اين): نە (كەنگیٚ) بواری هەس و نە (كویٚ). واتە لە وێدا حيسابی زەمان و مەكان، بە پێی حيساباتی سەرزەوی نييە. بەڕاستی ئەم قسەيە لە ڕووی زانستەوە ڕاستە. كات و شوێن شكڵ و شێوەی مادەن. هەموو شتێك درێژا و ئەندازەی دياريی خۆی و قەوارەی

هەس، واتە دوورایی (بعد) درێژی و پانی و بەرزی، شوێنێکی داگیر کردووە. جگە لەوەش، شت یەکێ نییە و دوو نییە، بە ملیارد و لە ژمارە نەهاتووی هەس. ئەمانە هەریەکە بە جۆرێ دەگەڵ یەکدیدا هەن... لێکدی دوورتر، یا نزیکتر، لێکدی بڵندتر یا نەویتر، لای ڕاستەوە، لای چەپەوە. ئەمەش واتە: ئەمانە سەرلەبەر لە شوێندا هەن و مەحاڵە بەم جۆرە نەبن. دەبێ هەروا بن. دەڵێ هەموو دەزانین، کە سەرلەبەری شتەکانی جیهان، لەوەی پێی دەڵێین مادە، پێك دێن. کەواتە لەمەڕا ئەوە دەکەوێتەوە، کە مادە ناکارێ لە شوێندا نەبێ، بێ شوێن نابێ. جا ئەمەیە وای کردووە، کە شوێن بەم جۆرە تاریف کەن و بناسێنن کە شکڵ و شێوەی مادەیە. ئەوجا هەرچی دیاریدەکانی جیهان هەن، هەمیشە لە بارێکی هەر وادا بووگە و هەر واش ئەوێ و هەر لە عەزەڵەوە تا ئەبەد و هەتا هەتایی و سەرومڕ لە گۆڕان و بزووت و گەشەکردندان. سەربارێش هەرچی دیاریدەکانی دنیا هەس، یەك لە دوو یەك، بەشێوەی دیاری، بە نۆرە پەیدا دەبن. ڕۆژ پاش شەو هەڵدێ، لەق لەق و پەڕەسێلکە لە بەهاردا دێن، لە بەسرە ئاوی شەتولعەرەب دەگەڵ خولی مانگدا بڵند و نەوی دەبێ، نەتەوەگەرایی نوێی ئەم سەردەمە لە پاش گۆڕانی فیوداڵ هات و دێ، شۆڕشی کورد لە ئاکامی گەشەکردنی بیروبڕوای نەتەوایەتی لە مێشکی ڕۆشنبیرانی کورددا پەیدا بوو. بیروبڕوای ڕژێمی سۆسیالیزم لە پاش گەشەکردنی سەرمایەداری هاتە گۆڕێ. ئەتۆ دەبینی یەکێ لە ڕووداوەکان، زووتر و ئەوی تریان درەنگتر دێتە گۆڕێ و هەر هەموویشیان درێژایەکی دیارییان هەیە. ئەم گۆڕان و گەشەکردنە، ئەم بە نۆرە هاتن و یەك لە دوو یەکتری هاتن و درێژایەی ڕووداوان، ڕوودانی لە دەرەوەی چوارچێوەی کاتدا ڕوو بدا. کەواتە: هەرچییەکی لە جیهاندا ڕوو بدا، لە چوارچێوەی کاتدا ڕوودەدا. جا لەوڕا کاتیش شێوەی مادەیە. لەم جیهانەدا ئەوەی بەر هەست بکەوێ لە مادەی بەبزووت بەولاوە چیی دیکە نییە. مایەی بە بزووتیش تا لە چوارچێوەی کات و شوێندا نەبێ، ناکارێ ببزوێ. شوێن ئەو شکڵ و شێوەی هەبوونی مادەیەیە، کە جێگای هەڵکەوت و ڕەهەند (بعد) و قەوارەی لەشی مادەکە دیاریی دەکا. هەرچی کاتە، ئەوە لایەنێکی تری هەبوون و گەشەکردنی مادە سنوور و کەوشەن دەکێشێ: ئەویش یەك لە دوو یەکتری هاتن و مەودای ئەو گۆڕانانەنن کە بەسەر لەشە مادەکییەکاندا دێن. لەمەڕا ئەوە دەفامرێ کە خەسیەتەکانی شوێن و کاتیش لێکدی جودان، لێکدی ناچن. دەی باشە، ئەدی ئەو خەسیەتانەی کە وەك سێبەر لە شوێن و

کات جودا نابنەوە و ناگۆڕێن؟ شوێن سێ ڕەهەند، دوورایی (بعد)ی هەن. واتە: درێژی و پانی و بڵندی. ئەمانە سەروساختێکی تەواوی شوێنمان بەدەستەوە دەدەن. کەواتە: ئەم سێ ڕەهەند (بعد)ە خەسیەتەکانی هەرە گرینگی شوێنن. هەموو دەزانین گۆڕانی دیاریدەکانی سەرلەبەر لە شوێن، کاتدا بە بەریاندا ڕوودەدەن، لە ڕابردوودڕا بۆ نهۆ و دوارۆژ، کەچی بە پێچەوانەوەیە. بەڵام خەڵك تەنێ لە چیرۆك و داستانی خەیاڵیدا کاریویانە ئامێری کات دروست بکەن و باڵەکانی کاتژمێر "بەرەواژ" بگەڕێن، واتە مەحاڵە سەرلەبەری پلەکان، بە بەریانی بەرەواژدا دووبارە ببنەوە. ئەوەش واتە: خەسیەتی هەرە گرینگی کات ئەوەیە کە بەرەو پاش وەناگەڕێ. کاتێ کە شت لە شوێندا، جێگایەکی داگیرکردبێ، واتە ئەوە یا ئەورۆ یا سبەی ڕووداوێکە، بە کورتی لە کاتێکدا مومکینە. "لە کوێ" و "کەنگێ" دوو پرسیاری دەگەڵ یەکدیدا هاوپێوەند و چەسپن و کاتی ڕووداو جێگایەکەی لە شوێندا وەسف دەکەن.

بەم پێیە، شوێن و کات دەگەڵ یەکیدا هاوسەروکارییەکی بتەو و توند و تۆڵیان هەس. لێکتر هاوێرکردنیان کارێکی کردەنی نییە. شوێن بە بێ کات بوونی نییە و کاتیش بێ شوێن وجوودی نییە. بەو پێیە کە مادە لە شوێن و کاتدان لێکتری هاوێر ناکرێن و کارێکی مەحاڵە. نەك هەر ئەمە، بگرە لە مادە هاوێرکردنیشیان هەر مەحاڵە. پێش دەسپێکی سەدەی بیستەم ئیسحاق نیوتن (١٦٤٢ – ١٧٢٧) لەو باوەڕەدا بوو، کە کات و شوێن بێ مادده و سەربەخۆ وجوودیان هەیە.. پێی وابوو شوێن وەك سندووقێکی گەورە یا ژوورێکی بێ سەرحەد و بێ دەر و دیوار و سەربان بێ بن میچ و زەوین دەچێ کە وەك شتی تێدا دابندرێ و لێی دەربهێندرێ.. وەك بێژی ئەم جیهانە لە نێو ئەم سندووقە یا ئەو ژوورەدا "داندراوە". نیوتن لەمەڕا وای لێك دایەوە کە شوێن ڕەها (مطلق)ە. واتە وجوودی بە بێ مادده هەیە. سەربەخۆیە. هەروەها بەو پێودانەش نوارییە کاتیش، کە بوونی بە بێ بوونی مادە هەیە. بەڵێ ئەمە ڕای ماددیەتی میتافیزیك بوو. وەلێ فیزیك زانی مەزنی سەدەی بیستەم ئەلبێرت ئەنیشتاین (١٨٧٩ – ١٩٥٥) کە تیوریی ڕێژەکی (نیسبی)ی داهێنا، کێشەی شوێن و کاتی بە تەرزێکی زۆر جیاواز چارەسەر کرد. ئەنیشتاین، زانستانە، بە دنیای سەلماند، وەك لە مارکس و ئەنگلس بنیاتنێیانی ماددەگەراییی دیالێکتیکیانە (ماتەریالیزم دیالەکتیك) بنەمایان چەسپاند و گوتیان: شوێن و کات دەگەڵ یەکدیدا وەکو یەکدی هاوسەروکارن و بەبێ خەسیەتەکانی مادە هەبوونیان نییە.

ئەتۆ پێت وایە کات لە نێو مووشەکێکی ئێکجار تیژڕەودا بەهەمان تیژی و خێرایی بەسەر دەچێ کە لەسەر زەوین بەسەر دەچێ. بەلاّم لە ڕاستیدا کارەکە بەو جۆرە نییە. ئەگەر خێرایی مووشەکێك هێندەی خێرایی ڕووناکی بێ، هەنگین کات لە نێو مووشەکەکەدا زۆر سستتر، لەسەر ڕووی زەوین بەسەر دەچێ.
ئەتۆ وا بزانە بە مووشەکێك سەفەرێکمان کرد و بڵێ سێ ساڵان بە حەواوە بووین. بەلاّم کاتێکی وەدەگەڕێینە سەر زەوین سەرسام دەبین. ٣٦٠ ساڵ لە سەر زەوین بە سەر چووە، چۆن؟ کارێکی سەرسوڕهێنە و لە تەسەورکردن نایە، وەلێ ڕاستیت گەرەکە کارەکە وەی تەرحەس.. کەواتە زەوین کاتێکی هەس و مووشەکەکەش کاتێکی نزیك بە خێرایی ڕووناکی هەس. کات ڕێژەکی (نیسبی)یە و کورتی و درێژیی بە پێی خێرایی بزووتنەوەی مادەیە. تەنێك چەندە لە شوێنێکدا خێراتر بێ، کات لە چاو وی سستتر بە سەر دەچێ. بەلاّم شوێن بۆ خۆشی ڕێژەکییە. گریمان شەمەندەفەرێك بە خێرایی ڕووناکی، بەلای شۆسەی ئیزگەیەکدا تێ دەپەڕێ (خێرایی ڕووناکی لە سەعاتێکدا دەگاتە ٣٠٠ هەزار کیلۆ مەتر لە چرکەیەکدا). سەرنشینانی شەمەندەفەرەکە، کە بەو خێراییەی دەبینن، دەنوارن شۆسەکە تەسك دەبێتەوە، بەلاّم ئەوانەی لەسەر شۆسەکە ڕاوەستاون، دەبینن شەمەندەفەرە خێرا وەك تیر دەرپەڕیوەکە تەسك هەلاّتووە. ئەمەش فێڵی چاو نییە، شتێکی ڕاستە و هیچ سێ و دووی لەسەر نییە. بەم پێیە کەواتە "شوێن"یش ڕێژەکی "ئیزافی: نیسبی"یە.
ئایدیالیستانی هاوچەرخ هەوڵ دەدەن ئەم کەشفی زانستەکییە بشێوێنن. دەڵێن، مادامێکی شوێن و کات ڕێژەکین، کەواتە وجوودێکی بابەتەکی لەدەرەوەی زەینی مرۆڤانی نییە. ئەوان کەشفێن نوهـ بیر و هزرا ماددەگەراییێ دەربارا جهـ و گاڤ نەهەڕفاندینە. سیستێمەکە ژ ئیحداسییات کو مینا فیزیکزانان دبێژن گاڤا خوە هەیی و گاڤا ویژی ڕێژکییە، نیسبییە.. لێ بەلێ بێ ئەو یەکی کو زەینا مرۆڤ هاتبیتە پەیدا بوونێ یا پەیدا نەبوونێ، ئان ژی بەرێ ئەو یەکێ مرۆڤ بێتە پەیدا بوونێ، هەیە، گاڤ ژی ب وی جورەیی هەیە. باشە هە کە گاڤ و جهـ بۆنا خوە، جودا ژ زەینا مرۆڤ هەین، چ باکا وان بە بوونا مرۆڤ توننە، چما مرۆڤ هەمبەرا گاڤ بهوورینا بێ بەزە، دەستە پاچە تونینە؟ بەلێ، مرۆڤ چو دەسەلات بۆنا ڕاوەستاندنا چەرخا گاڤ توننە، لێ ئەو هەمبەرا بهوورینا ژ دەستەلاتا وی بەدەردا، دەستەپاچە نییە. چما مێژە ناکی هەرتشتەکی ژ بۆ جلەڤ کرن ئو ڕامکرنا وی دەست بدت، ئەو دەردەستا خوە

دکـە؟ ئـێمـە چـەنـدی فـێرە کـات دە کـاربـردن بـین، کـارەکـە لـە بـەرژەوەنـدی مـە سەرکەوتووانە تر، کار دەکا. بەنموونە: ئەگەر کورد یەك بگرن، دەتوانن پتر سوود لە کات ببینن و داوا ڕەواکانیان زووتر بچەسپێنن.
قاب قوسین کان أو ادنی – بین مولی الوری وبینك بین: مەبەستی ئەوەیە کە لە خودا زۆر نزیك کەوتووەتەوە. قسمت می دهم بە جان حسن: سوێندت بە گیانی حەزرەتی حەسەن دەدەم. بە سر مرتضی بە خون حسین: بە سەری ئیمامی عەلی، بە خوێنی ئیمام حوسەینت سوێند دەدەم. روز وا (امّتی) کە پیشروی: ڕۆژی هاوار بۆ ئۆمەتم، کە لەو ڕۆژەدا پێشڕەوی. بە امّید شفاعت ثقلین: بە ئومێدی شەفاعەتی هەردوو دنیٚ. کن در آن روز یا رسول اللّە – نظری سوی من بە گوش و عین: یا هەناردەی خواوەند لەو ڕۆژەدا چاوی لوتفێکت بە منەوە بیٚ. بنواز و مران از لب حوض: بملاوێنە و لە گویٚ حەوزی کەوسەرم دەرمەکە. تر کن از آب کوثرم (شفتین): لێوانم لە ئاوی کەوسەر تەڕ بفەرموو. ای بە کویت سعادت ابدی: ئەی ئەوەی بەختەوەریی هەتا هەتا لە گەڕەکی تۆس. وی ز رویت شرافت حرمین: وەی گەورەیی و شەرافەتی لە حورمەتی ڕووی تۆوەیە. ما ز أمر تو غافل و تو بە ما – مشفق و مهربان تر از أبوین: ئێمە لە فەرمایشتی تۆ بیٚ خەبەر و تۆ بۆ ئێمە بە بەزەتر و میهرەبانتر لە داك و باب. در مزارت این درود می خوانم: لەسەر زیارەتگای پیرۆزت، ئەم درووده دەخوێنم. باز پرسند از توام ملکین: ئەگەر هەردوو مەلایەکەت لە بارەی تۆوەم لیٚ بپرسن. (کز سراپردەو مقدّس ذات – بر سراپای انورت صلوات): لە سەراپەردەی پیرۆزی زاتی خوداوە – سەلاوات لە سەراپای لە هەموو ڕووناکتر. خواجە و انبیاو ختم رسل: گەورە و دوا ئالقەی پێغەمبەران. هادی خلق و پیشوای سبل: ڕێشاندەری خەڵك و پێشەوای ڕێی ڕاست. ای هـمـە ممکـنـات جسم و تـو جـان: ئـەی هـەمـوو لـە خـانـەی شیـا و وموەمکیناتدا لەش و تۆ گیان. وی همە کائنات خار و تو گل: وەی هەموو کەون و کائینات دڕك و تۆ گوڵ. محرم کردگار و مهبط وحی: مەحرەمی خوای هەموو شتێك لە توانست لە جیٚ هاتنە خوارێی سرووش. مهتر اصفیا و مظهر کلّ: وەی هەرە گەورەی لە تڵپە پالاوتە و جیٚ ڕەنگدانەوەی کوللییات. مەبەستی وەحدەتی وجوودە. لم تلد مثلك النّساء فتیً: ژنان ڕۆڵەیەکی وەکو تۆ نەزاون. لم یجد شبهك الزّمان رجل: زەمان پیاوێکی لە وێنەی تۆی نەبووە. دەبوا "رجلاً"ی گوتبا، بەلام لەبەر ناچاریی کێش (مەنسووبی بە مەرفووع نووسیوە). صیفەت شانئت هو الأبتر: وەسفی گزارە لیٚ

کێشت، ئەو بۆ خۆی بێ سەروپایە. لقب باغضت زنیم و عتلّ: "زنیم" بە عەرەبی بە کەسێ دەگوترێ کە لە قەوم زێدە بێ، بەلام جێ گومان نەبێ. بە: الزَّنمتان"، وەوەی بە هەردوو گوێی مەڕدا شۆڕ دەبنەوە، تەشبیهـ کراوە. ئەوە لە ئایەتی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێ: "عتلٍّ بعد ذلك زنیم" بە بەندەیەك دەگوترێ، کە خۆی بە قەومەوە هەلاواسیبێ و بە ڕەچەڵەك لەوان نەبێ. شاعیر دەڵێ:

"فأنت زنیمُ نیط فی آل هاشم      کما نیط خلف الرَّاکب القدح الفرد"

بەیتەکە ئی حەسسانی کوڕی سابیتە، فڕی ئاوێتووەتە ئەبو سوفیان کوڕی حاریس.

کێشەکە لە بەحری تەویلی مەخبوونە (فعولن مفاعلن فعولن مفاعلن).

مانایەکەی بە کوردی:

ئەی بە ڕەچەڵەك ناڕەسەن و بە بەرەی هاشمەوە خۆ هەلاواس، وەك چۆن کاسەی بەتاڵ بە تەرکی ئەسپەوە هەڵدەواسرێ ئەتۆش بەو جۆرەی. واتە بە لاف و گەزاف و خۆ بە ڕەسەن دەزانی. نازناوی ئەوەی ڕکی لێتە خۆ هەلاواس و ناڕەسەن و زۆر خۆری بە هەڵپەیە. عوتلّ: زۆر خۆری بە زۆر بە سەر سفرە و خواندا خۆ سەپێن. لە (عەتل)ەوە هاتووە، واتە: بە زۆر لەسەر خوان هەڵپە و پارووی چەور بۆ پێشە خۆ دەر. دەڵێن جارێکیان – ئەگەر بە ڕاستم بیستبێ – مەلای گەورەی بەهەشتی بە یەکێ لە میوانانی بە هەڵپەی بە چەپ و گوپ لەسەر سفرە و خوان دەفەرموێ: "بەعەرەبی" خذ مما یلیك وا تێ مەگە ئالیکە". در قیامت چو ذو: الجلال ترا / می دهد رخصت شفاعت کل: خودای خاوەن شکۆ لەو دنیا نۆرەی شفاعەتی هەمووانت دەدا. آید از بارگاه قدس خدا – لك ماشئت یا نبی فقل: فەرمایشتی چت ئارەزوو لێیە، ئەی پەیامبەر جێبەجێ دەبێ، بفەرموو لە بارەگای پێروزیی خواوەندەوە دێ. فکر من کن کە کردەام تسبیح: بیر لە من بکەوە، در خرابات رهن شاهد مل کە تەزبیەم لە مەیخانە بە بارمتە داناوە: تا مرا چون تویی شفیع چە باك: هە کە تۆ شفاعەت خوازێ من بی چ باکم هەس. ز آتش دوزخ و سلاسل و غلّ: لە ئاوری دۆژە و کۆت و زنجیر. فیل محمودم و نمی ترسم: فیلی مەحموودم و ناترسم. از دم کرنا و بانگ دهل: لە سلکی کەڕەنا و بانگی دەهۆڵ. بەهوای تو مست و بی پروا: بە ئەشقی تۆ مەست و بێ پەروام. نعت گویان خرامان از پل: ئەوانەی پەسنیان داوی لەسەر پردی سیراتێ لەسەرخۆ و بە لەنجە و لار دەڕۆن. کز سرا پەردەء مقدس ذات: کە لە سەرا پەردەی پیرۆزی زاتی خواوە. (بر سرا پای انورت صلوات): سەلاوات لە سەراپای بارەگای ڕووناکترت.

# مقطّعات

٧٥

**دو شیر مرد***

(پیتی) ئەلف

در مـیــان دو شیـرمـرد خـدا
عــار بــاشد کسی رسد بــجـزا
شیخ رضا گفت بهر تأریخش
جای او گشت (جنّة المأوی)

.............................................................

(*) کێشی دوو دێری یەکەم: بەحری خەفیف موسەددەس مەخبوون مەحزووف
(فاعلاتن مفاعلن فعلن)
وەك: ″ چرخ از من قرار من بستد
تا ز دستم نگـار من بستد″
وەك: کێشی دوو دێڕی دووەم: بەحری خەفیف موسەددەس مەخبوون ئەصلەم
(فاعلاتن مفاعلن فع لن)
″تا کـی از عشــق تو کـشم خواری
تــا کی از هجر تـــو کـنم زاری″

در میان دو شیر مرد خدا: لە نێوان دوو شێری مەردی خوادا. عار باشد کسی رسد بە جزا: نەنگ و فەهێتە کەسێ بە سزا بگا. شیخ (رضا) گفت بهر تاریخش: شێخ ڕەزا بۆ مێژووی گوتی جای او گشت (جنه المأوا): بەهەشت بوو بە جێی وی. دیارە، ئەگەر پیتەکانی (جنّة المأوی) کۆ کەیەوە دەکاتە ١٢٧٣ی کۆچی.

٧٦

**نقیب غوث***

(پیتی) ئەلف

چون شد بأمر مظهر رحمن نقیب غوث
تـعـمـیـر آشیــانــهء شهـبــاز کـبـریـا

تـأريخ تـام خواند بگوش (رضـا) سروش
آراستـــنـــد بـــارگـــهـــی شاه اولـــیـــا

(*) کێش: بەحری ڕەجەز مەخبوون مەربووع
(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعل)
وەك: ″ سیل آســـت دیـــده و هر کس کـــه بگذرد
گر خود دلش ز سنگ بود هم ز جا رود″
چون شد به امر مظهر رحمان نقیب غوث: کاتێ بە فەرمانی جێ شەوقدانەوەی خوا، نەقیبی غەوس. تعمیر شد آشیانەء شهباز کبریا: هێلانەی شابازی خوا ئاوەدان کرایەوە. تاریخ تام خواند بگوش (رضا) سروش: سروش (وەحی) مێژووی تەواوی بە گوێی ڕەزادا خوێند. آراستند بارگه شاه اولیا: بارەگای شای وەلیانییان ڕازاندەوە.

٧٧

## سجّاد*

### (پیتی) ئەلف

ریـــخت جـــودت آبـــروی گـــوهـــر بـــیـــجـــاده را
ورع و شرع ومعرفت طی کرد هرسه (جاد) را
هـــمـــچـــو سنگ کـــعـــبـــه سربـــر آستـــانـــم تـــا ابـــد
سر ز سجـــده بـــرنـــدارم شکـــر ایـــن سجّـــاده را

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صحبت گـــل بـــــایدش
بر جفای خار هجـــران صـــبر بلـــبل بایدش″
ریخت جودت آبروی گوهر بیجاد را: دەهەندەییت گەوهەری بیجادی ڕشت. ″بیجاد یا بیجادە بەردێکی بە نرخی وەکو یاقووتی سوور وایە.″ ورع و شرع و معرفت طی کرد هر سه جاد را: پارێز و شەرع و خواناسی هەر سێ ڕێگای پەی کرد. همچو سنگ کعبە

سر بر آستانم تا ابد: هەتا هەتایە سەرم لە هاسانەی بەرز و پیرۆزتدایە، وەك بەردی کابە وایە، هەر نابزوێ. سر ز سجده بر ندارم شکر این سجَّاد را: لە شوکرانەی ئەم سەجادەدا سەر لە کڕنووش بردن هەڵناگرم.

٧٨

**سیِّد برزنجه***

(پیتی) ئەلف

شاه حسین را خواب دیدم در ملا
گـفـتـم ای شاه شهـیـد کـربـلا
سیِّـد (بـرزنـجـه) از نسل تـوانـد
(قـال لا والـلـه هـذا مـفـتـری)

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەڵ موسەددەس مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
وەك: " هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم
عالمـی از عـالم فکـرت بە کـف مـی آورم"

شا حسین در خواب دیدم در ملا: شا حوسەینم لە نێو خەڵکدا، دە خەوندا دیت. گفتم ای شاه شهید کربلا. گوتم ئەی شای شەهیدی کەربەلا. سیّد برزنجه از نسل تواند: ساداتی بەرزنجە لە بەرەی تۆن. قال لا واللّه هذا مفتری: گوتی نا وەڵڵا ئەمە بوختانە.

٧٩

**ابن ملجم***

(پیتی) ئەلف

نخواهم ملك کیخسرو نجویم مسند جم را
بەنرخ نیم جو نخرم متاع هردو عالم را
نگـردم روز مـحشر عـهد بـاشد داخل جنَّت
بـحـق شاه مـردان تـا نگـایـم ابـن مـلـجم را

(*) كێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: ″ ترا من دوست می دارم ندانم چیست درمانم

نه روی هجر می بینم نه راه وصل می دانم″

نخواهم ملك کیخسرو نجویم مسند جم را: موڵکی کەیخوسرەوم ناوێ، لە تەختی جەمشید ناگەڕێم. بە نرخ نیم جو نخرم متاع هر دو عالم را: سەرلەبەری دارایيی دنیا بە نیو دەنکە جۆ ناکڕم. نگردم روز محشر عهد باشد داخل جنَّت: گفت و پەیمان بێ، ڕۆژی حەشر، نەچمە بەهەشتەوە. بە حقّ شاه مردان تا نگایم ابن ملجم را: بە هەقی شای مەروان، تا کوڕی مولجەم نەگێم.

## ٨٠

### ابو جمیل*

(پیتی) ئەلف

قـبـیـل الموت قـال ابـو جـمـیل

لزوجته اصبری صبراً جمیلا

فلم تصبر علی الفحشاء یوما

وقـد جـعـلت سبـیـلـیـها سبـیـلا

(*) كێش: بەحری وافیر موسەددەس مەقسوور

(مفاعلتن مفاعلتن فعولن)

نموونەم دەست نەکەوت.

قبیل الموت قال أبو جمیلٍ – لزوجته اصبری صبرا جمیلا: باوی جەمیل نەختۆکەك پێش سەرەمەرگ، بە ژنا خوه گۆت کەمەك سەبر بگرە. فلم تصبر علی الفحشاء یوماً: بەڵانەکێ هیچ ڕۆژەك سەبری نەگرت. وقد جعلت سبیلیها سبیلا: هەردوو ڕێگایەکەی کرد بە یەك ڕێگا، واتە لە هەردوو کونەوەی دەدا.

٨١

## تشطير شعرى از حافظ در هجو محمود پاشاى جاف*

(پيتى) ئەلف

مـگـر يـزدان كـنـد كشف كـف (مـحـمـود پـاشا) را
كه كس نگشود و نگشايد به حكمت اين معمّا را
بـدست كـهـنـه دلـقـى گر بـبـيـنـد صورت جـلـقـى
(چنان بربايد از دستش كه تركان خوان يغمارا)

(*) كێش: بەحرى هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن)
وەك: " نگـارا وقـت آن آمد كـه دل با مـهر پيـوندى
كه ما را بيش از اين طاقت نماندست آرزومندى"

مگر يزدان كند كشف كف محمود پاشا را: مەگەر خوا هەر بۆ خۆى نێو لەپى مەحمود پاشا وەكە. كه كس نگشود و نگشايد به حكمت اين معمّارا: چونكە كەس لەو سرِە سەر دەر ناكا، ئەو لەغزە كەس هەڵى نايەنێ. بەدست كهنه دلقى گر ببيند صورت جلقى: ئەگەر شكڵى پووڵە كۆنێك بە دەستى سواڵكەرێكەوە ببينێ. (چنان بربايد از دستش چو تركان خوان يغمارا): وەك چۆن توركى درِندە سفرە و خوان تاڵان دەكەن ئەوژى وسايە.

٨٢

## عزم سفر*

(پيتى) بێ

يـار مـن عـزم سفـر بـنـهـاد پـا انـدر ركـاب
خـانـەء زيـن شد مـزيَّـن، خـانـەء مـن شد خراب
خـلـق را خـورشيـد شام از ديـده غـائب مـيشود
مـن سحـرگـاهـان ز چشمـم گشت غـائب آفتاب

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: " باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش

بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش"

یار من عزم سفر بنهاد پا اندر رکاب: یاری من نیازی سەفەری هەیە و پیّ لە ڕکێف، یا پێی بڵند کرد بۆ تیّ خستن. خانەء زین شد مزین، خانەء من شد خراب: خانەی زین ڕازایەوە، خانەی من وێران بوو، خانەی چەك کە کوزە، ڕازایەوە، "زین" بە مانای چەکیش هاتووە. دیارە دەکاتە خانەی کێر، کە چەکی شێخە.

هەروەها خانە واتە ئافرەتێك کە ناوی خانەیە، لە داخان شەقی برد، چونکە من فلأنم گا. خلق را خورشید شام از دید غائب میشود: خۆر بۆ خەڵك ئێواران، لە دیدە ئاوا دەبیّ. من سحرگاهان ز چشم گشت غائب آفتاب: کە چی من لە بوومەلێڵەدا خۆرم لیّ ئاوا بوو. یا خەڵك خورشید خانمی ئێواران، دەست ناکەویّ بیگێن، کەچی من سبەینان ئافتاو خانمم بۆ دابین نابیّ بیگێم... واللّه أعلم بالصَّواب.

## ٨٣

## کیر*

(پیتی) تیّ

شخصی بکیر گفت که ای سربریده پوست

کون بهتراست یاکس بی مو نیکواست

آهسته سر بلند کرد و آشفته بگفت(١)

(درویش هر کجا که شب آید سرای اوست)

---

(١) کون سفید خوبتر یاکه نیکواست (ت). آهسته سربلند کرد و بجنبید و گفت.

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەتوی مەخبوون مەربووع

(مستفعلن مفاعلن مفتعلن فعل)

وەك: " خورشید خاوری کند از شك جامە چاك

گر ماه مهر پرور در قبا رود"

شخصی بە کیر گفت کە ای سر بریدە پوست: یەکێ بە کێری گوت کە ئەی پێست سەربڕاو. کون سفید خوبتر یا کە کس نیکوست: کونی سپی، یا کە کوز چاکە؟ آهستە سر بلند کرد بجنبید گفت: لە سەرەخۆ، سەری بڵند کرد، بزووت، گوتی، (درویش هر کجا کە شب آید سرای اوست): دەروێش کە شەوهات، لە هەر کوێیەك بێ، کۆشکی وییە.

## ٨٤

## بلباس و خوشناو*

(پیتی) تێ

آنچە بلباس بە خوشناو و بە آکو کردەاست
نشنیدم کە بە بغداد (هلاکو) کردە است
گرچە میران خدر بگ نە بە حقّ شد مقتول
کشتنش بە کە بسی غصب تماکو کردەاست

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)
وەك: "دو عالم دامن جان درکشم هر صبحدم
پای نومیدی بە دامان درکشم هر صبحدم"

آنچە بلباس بە خوشناو و بە آکو کردە است! ئەوەی بڵباس بە خۆشناو و ئاکۆی کردبێ. نشنیدم کە بە بغداد هلاکو کردە است! نەمبیستووە کە هۆلاکۆ بە بەغدای کردووە. گر چە میران خضر بگ نە بە حقّ شد مقتول: گەرچی میرانی خدر بەگ بە هەق نەکوژرا، یا نەبوو بە جیوە. مەقتوول بە جیوەش دەگوترێ. کشتنش بە کە بس غصب تماکو کردە است: کوشتنی چاکە، چونکە توتنی هەموو دنیای داگیر کردووە، یا تووتن چاندن لەوەی کە مەنعی کەی چاترە... دیارە بوون بە جیوە، سستایش کردنە، چونکە جیوە دەکرێتە خەنەوە و لە قژ دەگیرێ، واتە: لەسەر سەر دادەندرێ. هەرچی مانای "غصب"ە، ئەوە وەك سەید شەریفی جورجانی لە "تعریفات"دا دەفەرموێ، کەسێ ئیسپاتی موقەدیمەی خۆی بکا، تۆ بەر لەو نەفیی دەلیلەکەی ئەو بکەی، یەڵلای دەکرد ئیسپاتی حوکمی بە بگرە و بەردە، بە زیمنی و ناواخن لێ لازم بێ، یا نا.. خوا بۆ خۆی دەیزانێ.

٨٥

**دروغ***

(پیتی) تێ

پرسیدم از دروغ که مارا بگوی راست
اهل کدام مملکتی، خانەات کجا است
گـفـتـا مـن و نـفـاق دو ابـلـیس زادەایم
در خطّەء عراق که مأوای جد ماست

...............................................................

(*) کێش بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون مەجبووب
(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعل)
نموونەم دەست نەکەوت.
پرسیدم از دروغ که مارا بگوی ڕاست: لە درۆم پرسی کە ڕاستیم پێ بڵێ. اهل کدام مملکتی تو خانەات کجاست: خەڵکی کێهە وڵاتی، تو ماڵت لە کوێیە؟ گفتا من و نفاق دو ابلیس زادەایم: گوتی من و دووڕوویی، دوو شەیتان زادەین. واتە: هەرتکمان کوڕی شەیتانین. در خطّەء عراق که مأوای جد ماست: لە مەڵبەندی عیراق کە مەنزڵی باپیری مەیە.

٨٦

**غوث الثّقلین***

**(پیتی) تێ**

این بـارگه حضرت غوث الثقلین است(١)
نـقـد کـمـر حـیـدر و نـجـل حسنـیـن است
مـــادرش حسیـــنـــی نسب است و پـــدر او
ز اولاد حسن، یـعـنـی کـریـم الابـوین است

...............................................................

(١) لـەسەر قـەفـەسی مـەرقـەدی مـوبـارەکی حـەزرەتـی گـەیـلانـی وە لـەسەر هـەردوو قاپییەکەیشی نووسراوە.

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعولُ مفاعیلُ مقاعیلُ فعولن)
وەك: ″ اندوه تو شد وارد کاشانـــەام امشب
مهمان عزیز آمده در خانەام امشب″
این بارگه حضرت غوث الثَّقلین است: ئەمە بارەگای حەزرەتی غەوسی هەردوو جیهانە. غەوس بە مانای فریارەسە. نقد کمر حیدر و نجل حسنین است: نەختینەی پشتی ئیمامی عەلی و رۆڵەی هەردوو حەسەنە. مەبەستی حەسەن و حوسەینە بە تەغلیب. وەك ″القمران″ لە بۆ خۆریش و مانگیش. مادرش حسینی نسب است پدر او: داکی حوسەینی رەچەڵەکە و باوی. ز أولاد حسن یعنی کریم الابوین است: لە کوڕانی حەسەنە، واتە: باویشی و داکیشی شەریف و موکەڕەمن. ز أولاد بە حەزفی هەمزەکەی وەخوێنە.″

٨٧

**ابن مفتی بغداد***

(پیتی) دال

زدم بـه کـون (جـمـیـل ابـن مـفـتـی بـغـداد)
کشیـد گـوزی و گـفـتـم بـەروح ابـن زیـاد
کشیـد گـوز دیـگـر چـون فـرو کشیـدم از او
از آن مـزیـد تـعـفًّـن یـزیـدم آمـد یـاد

................................................................

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون مەقسوور
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)
وەك: ″ سپیدەم دم کە شدم محرم سرای سرور
شنیدم آیــت توبوا الی اللّه از لب حور″
زدم بە کون جمیل ابن مفتی بغداد: لە قوونی جەمیلی کوڕی مفتی بەغدایەم برد. کشید گوزی و گفتم بە روح ابن زیاد: تڕێکی بەردا و گوتم بەرۆحی کوڕی زیاد. کشید گوز دیگر چون فرو کشیدم از او: کە جڵەوی کێرم لێ کێشایەوە تڕێکی تری کەندەوە. ازان مزید تعفُّن یزیدم آمد یاد: لەو هەموو بۆگەنییە زۆرە یەزیدم بەبیرهاتەوە. ″زیاد″ و ″مزید″ سەروکاریان دەگەڵ یەکدیدا هەس. جیناسی ناقیسە.

## ٨٨

## این قحبه نه مریم است*

(پیتی) تیٚ

نــاجــی چــو زنش حــامــلــه شد زار گــریست
گــفــتــار ز سر گــریــه کــه ایــن واقــعــه چــیست
مــن پــیــرم و کــیــر مــن نــمــی جــنــبــد هــیــچ
این قحبه نه مریم است و این بچه ز کیست(؟)

................................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)
وەك: ″ هرگز نبود سرو به بــالاکه توداری
یامه به صفای رخ زیبا که توداری″

ناجی چو زنش حامله شد زار گریست: تاجی کە ژنەکەی ئاوس بوو، زۆر دەستی بە گریانێ کرد. گفتا ز سر گریه که این واقعه چیست: بە گریانەوە گوتی، ئەم ڕووداوە چییە؟ من پیرم، کیر من نمی جنبد هیچ: ئەمن پیرم و کێرم هەرگیز نابزوێ. این قحبه نه مریم است، این بچه ز کیست؟ خۆ ئەم قەحبەیە مریەم نییە، ئەدی ئەم زارۆکە لە کێیە؟

## ٨٩

## به وجود تو بنازد*

(پیتی) دال

چــه عــجب گــر بــوجــود تــو بــنــازد بــغداد
ای وجود تو محیط دوجهان استعداد
گــرو ز مــهــر بــرد ذرّه بــدیــن نــاچــیــزی
اگــر از نــیِّــر اعــظــم بــکــنــد اســتــمــداد

................................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەسلەم موسەبەغ

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)

وەك: ″ باز در زلف بنفشه حركات افكندند

دهن زرد خجسته به عبير آكندند″

چه عجب گر كه به وجود تو بلرزد بغداد: چە سەیر نییە ئەگەر بەغدا بە بوونی تۆ بلەرزێ. ای وجود تو محیط دو جهان استمداد: ئەی بوونی تۆ بۆ هەردوو جیهان مەدەدکار. گرو از مهر برد ذّره بدين ناچيزى: ئەگەر گەرد بەم هیچیەی گرێوی لە خۆر بردەوە. اگر ازنيِّر اعظم بكند استمداد: ئەگەر لە رۆژ داوای یارمەتی بکا، گرێو لە تابانی هەرە گەورە دەباتەوە.

٩٠

## گر بلرزد به چه ارزد*

(پیتی) دال

گـويـنـد اگـر وطء كـنـى عـرش بـلـرزد(١)

عرشى كه به يك وطء بلرزد به چه ارزد

مـاييم و يكـى حـجرهء تـاريك كه در وى

صد بـچّه بگـاييم و يكـى خشت نـلـرزد

---

(١) (ئەم چوارینەیە هی عوبەیدی زاکانییە نەك شێخ رەزا (شێخ محمدی خاڵ گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق – دەستەی کورد، ساڵی ١٩٨٩)

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف

(مفعولن مفاعيل مفاعيل فعولن)

وەك: ″ سـالها مى گذرد كـز غم او بيمارم

مگر امشب به عيادت به سر آيد يارم″

گويند اگر وطء كنى عرش بلرزد: دەڵێن پێ لەسەر بارەگای خوا دانێی، دەلەرزێ. یا ئەگەر قوون بگێی، بارەگای خوا دەهەژێ. دیارە وشەی ″وطء″ بۆ قوون گاینیش و کوز گایـنیش دەگوترێ. بەڵام شێخ ئەوەکەی یەکەمیانی مەبەستە... واللّه اعلم بالصواب. عرش كه به يك وطء بلرزد به چه ارزد: بارەگایەك کە بە یەك پێ لە سەردانان بلەرزێ بە کاری چ دێ؟ یا بە گاین وەلەرز کەوێ بەکاری چی دێ؟ ماییم

و یکی حجرهء تاریك که در وی: هەر ئێمەین و ژوورێکی تاریك، کە لەوێدا. صد بچّه بگاییم و یکی خشت نلرزد: ئەگەر لەوێدا سەد منداڵ بگێین خشتێکی لێ ناڵەرزێ، دیاره وشەی "وطء" بە دوو مانا هاتووە: یەکێکیان " پێ لە سەر عارد دانان"ە. شاعیر لە هەردوو مانایەکە ئەم هەنگامەیەی دروست کردووە. تەشبیهی ژووری تاریك ئەستەغفیروڵڵا بە بارەگا و سوود لە هەردوو مانای "وطء" وەرگرتن هەر لە شاعیرێکی زەبر دەستی وەك شێخ ڕەزا و عوبەیدی زاکانی دەوەشێتەوە، بەڵام بێ ئەدەبییە.

۹۱

**رشید پور عمم***

(پیتی) دال

فریاد کە در (نصیبینم) کشتند
وز خشم مـرا بــخــون آغشتند
وای ازین مردم بی شرم و حیا
مـانـند رشید پورعمم پشتند

---

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەددەس مەتوی
ئەم چوارینەیە ناڕێکوپێکە، تەنیا دێڕی سێیەمم بۆ چووە سەر ئەم کێشە..
(مستفعلن مفتعلن مفتعلن)
فریاد کە در (نصیبینم) کشتند: هاوارە! لە نسێبینیان کوشتم. و زخشم مرا بخون آغشتند: لە ڕکان خڵتانی خوێنیان کردم. ای وای ازین مردم بی شرم وحیا: وای لە دەست ئەم خەڵکە بێ شەرم و حەیایە، مانند رشید پور عمم پشتند: وەك ڕەشیدی ئامۆزام پوشتن.

٩٢

**دفتردار***

(پیتی) ڕێ

مـی کـنـم هـجـو اگـر لـطـف خدا بـاشد یـار
مـویـی از خـایـهء مـن بـر نـکـنـد دفـتـردار
خایهء همچو جبل دارم و کیری چو منار
هـردو، هـرسه هـمـه در کس زن دفـتـردار

............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)
وەك: " در ازل عکــس می لعل تو در جــام افتاد
عــاشق ســوخته دل در طمع خام افتاد"

می کنم هجو اگر لطف خدا باشد یار: فرِی خۆم داوێم ئەگەر لوتفی خوا یار بێ. مویی از خایەء من بر نکند دفتردار: دەفتەردار موویەك لە گونی من ناتوانێ هەڵبقەنێ. خایەء همچو جبل دارم و کیری چو منار: گونێکی وەکو کێوم هەس و کێرێکی وەکو مـنـاره. هـردو، هـرسه، هـم در کس زن دفـتـردار: هـەروەك هـەسێك لـە کـوزی ژنـی دەفتەردار.

٩٣

**قائممقام شهر گلعنبر***

(پیتی) ڕێ

ورق از بـرگ گـل بـایـد مـداد از سودهء عـنـبـر
دوات از نــافــهء آهـو قـلـم از غـمـزهء دلـبـر
یکی زین چار جوهر گر بود ناقص خلل یابد
ستـایشنـامـهء قـائـمـمـقـام شهر گـلـعـنـبـر

............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: " همه کارم به خودکامی به بدنامی کشید آخر

نهان کی ماند آن رازی کزو سازند محفلها"

ورق از برگ گل باید، مداد از سودەعنبر: دەبێ کاغەز لە گەڵای گوڵ و مەرەکەب لە هاڕاوەی عەنبەر بێ. دوات از نافەء آهو، قلم از غمزء دلبر: مەرەکەب لە نێوکی مامز و خامە لە غەمزەی دلبەر. لە غەمزەی دلبەردا لەتافەتێك هەیە؛ چونکە غەمز بە مانای تێژەنینیش دێ. یکی زین چار جوهر گر بود ناقص خلل یابد: ئەگەر یەکێ لەم چوار جەوهەرە ناتەواو بێ تێك دەچێ. چی؟ ستایشنامە قائممقام شهر گل عنبر: پەسەندنامەی قایمقامی گولعەنبەر لە ناوچەی خورماڵە.

## ٩٤

## خر نر*

(پیتی) ڕێ

بــه خــر نــر بـرسد شیـخ رضا مــی کـنـدش

هر کرا یافت بەزور و بەرضا می کندش

گرچه در جوف حرم دست دهد مغبچەای

از خـدا شرم نـدارد بــەخـدا مــی کـنـدش

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل مەخبوون مەحزووف

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)

وەك: " هر گه در کوی خرابات ترا بـــار دهد

به کمال و کرمش جان من اقرار دهد"

به خر نر برسد شیخ (رضا) می کندش: شێخ ڕەزا بە نێرەکەر بگا پێوەی دەکا، دەیگێ. هر کرا یافت به زورو به رضا می کندش: هەر کەسێکی، چ بە زۆر و چ بە خوایشت وەگیر کەوێ، دەیگێ. گر چه از جوف حرم دست دهد مغبچەای: با لە نێو جەرگەی حــەرەمــیشدا بــەچـکـە مـوغـێك وە دەست کـەوێ. "مـغ" بـە ئـاخـونـدی ئـاورخـانـەی زەرتوشتییان دەگوترێ. از خدا شرم ندارد به خدا می کندش: شەرمی لە خوا نییە بە خوا هەر پێوەی دەکا، دەیگێ.

٩٥

**شکم***

(پیتی) عەین

دارم شکمی که بس حریص است و هلوع
چـون طـبـل صدا مـی کـنـد الـجـوع الـجـوع
در پــیشت سرم چــنــانــکــه ایستـد بــەنماز؟
بـــــادش بـــــبـــــرد کـــــلا در وقت رکـــــوع

..............................................................

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەددەس مەتوی
(مفعول مفاعل مفاعل فعول)
وەك: ″ چل سال پیش رفت که من لاف می زنم
کز چاکـــــران پیرمـــفان کمترین منم″

دارم شکمی بس حریص است و هلوع: زگێکم هەس یەکجار چنۆك و بێ ورە. چون طبل صدا می کند الجوع الجوع: وەکو تەپڵ هاوار دەکا برسیەتی برسیەتی. در پشت سرم چنانکه ایستد بە نماز: کە لە پشت سەرەوە بۆ نوێژ ڕادەوەستێ. بادش ببرد کلاه در وقت رکوع: لە وەختی چوونە ڕوکووعێکدا با کڵاوی دەبا.

٩٦

**میل پهلوانان***

(پیتی) فێ

شب که خسبم کیر من بر دوش می گیرد لحاف
مـی نـخسبـد تـاسحـر چون زاهـدان از اعتکـاف
چـو مـیـل پــهـلـوانــان دائـمـا درجـنـبش است
گـاه مـی غـلطد بـزانـو گـاه مـی خسبـد بـەنـاف[١]

..............................................................

(١) لە دیوانەکەیدا نییە (لە بەیازێکی قزڵجیم دەست کەوتووە).
(*) کێش: بەحری رەمەڵ مەسوممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش

بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش″

شب که خسبم کیر من بر دوش می گیرد لحاف: شەو کە لە نێو جێدا دەهێوریم کیرم لێفە بە کۆڵەوە دەگرێ. می نخسبد تا سحر چون زاهدان از اعتکاف: تا بەرەبەیان وەك لە دنیا دەسبەرداران لە خۆ بۆ خواپەرستی تەرخان کردن ناسرەوێ. چو میل پهلوانان دائما در جنبش است: هەمیشە وەك میلی پاڵەوانان لە جموجۆڵدایە. گاه می چسپد بزانو گاه می چسبد به ناف: جارێ بەر ئەژنۆم دەکەوێ، جارێ لە نێو نێوکمدا دەسرەوێ.

٩٧

**وحدك لا شريك لك***

(پیتی) کاف

هشت بهشت و شش جهت هفت زمین و نه فلك

جمله تو آفریدەای (وحدك لا شريك لك)

من چیم ای فدای تو دم زنم از ثنای تو

ای همه ما سوای تو در کف قدرت تو يك

---

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون

( مفاعلن مستفعلن مفاعلن مستفعلن)

وەك: ″ هر که پرست رخ بنما که این همه

هر که زمان گویدت بام آ که این همه″

هشت بهشت و شش جهت، هفت زمین و نه فلك: هەشت بە هەشت و شەش لا، حەوت زەوین و نۆ گەردوون: جمله تو آفریدەای وحدك لا شريك لك: هەموو خۆت ئەفراندووتن، هەر خۆتی و بێ هاوتای. من چیم ای فدای تو دم زنم از پنای تو: من چیم، گوریا تە بم، دەم بژەنمە پەسندانی تۆ. ای همه ماسوای تو در کف قدرت تو يك: ئەی هەموو غەیری تۆ سەرلەبەر لە دەستی توانستی تۆدا یەك.

## ٩٨

### سگ اصحاب کهف*

(پیتی) واو

یار سول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف
داخـل جـنَّـت شوم در زمـرءه اصحـاب کـهـف
او رودر جـنَّـت و مـن در جـهـنَّـم کـی رواست
او سگ اصحاب کهف و من سگ اصحاب تو

(*) کێش: بەحری ڕەمەڵ موسەممەن مەحزووف
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)
یا رسول اللّه چه باشد چون سگ اصحاب کهف: ئەی پەیکی خواوەند چ دەبێ وەکو سەگی یارانی ئەشکەوتی گۆڕین. داخل جنَّت شوم در زمرءه اصحاب تو: دە زیمنی یارانی تۆدا بچمە بەهەشتەوە. او رود در جنَّت و من در جهنم کی رواست: ئەو بچێتە بەهەشت و من بچمە دۆزەخەوە، کەی ڕەوایە. او سگ اصحاب کهف و من سگ اصحاف تو: ئەو سەگی یارانی ئەشکەوت و من سەگی یارانی تۆم.

## ٩٩

### اصطبل خرابات شده*

(پیتی) هـێ

تـنـهـا نـه کـتـاب شرع بـر بـاد شده[١]
شهـنـامـهء عشق نـیـز از یـاد شده
از خـرقـهپوشان عصر هـر صومعـهای[٢]
اصطـبـل خـرابـات خـر آبـاد شده

(١) بر باد شده: (ت)، بر باد شده: (م).
(٢) از خرقهء نشان: (ت)، از خرمنشان: (م).
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەقسوور مەحبووب

(مفعول مفاعيل مفاعيل فعل)

نموونەم دەست نەکەوت.

تنها نه کتاب شرع بر باد شده: نەك تەنیا هەر کتێبی شەرع بەرباد بووە. شهنامەء عشق نیز از یاد شده: شانامەی عەشقیش لە بیر کراوە. از خرقه پوشان عصر هر صومعەای: لە پەلاس لە بەرانی هەر کولبەیەك. اصطبل خرابات خر آباد شده: تەویلەی مەیخانە بووە بە (کەرئاوا).

١٠٠

## اژدها برگشته*

(پیتی) هێ

حاجی کە ز (صفا) و (مروه) برگشته

گر مار بوده اژدهایی برگشته

تنها نه ز خانەءخدا برگشته

آن خانه خراب از خدایش برگشته

---

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەددەس مەخبوون

(مستفعلن مفاعلن مفاعلن)

نموونەم دەست نەکەوت.

حاجی کە ز صفا و مروه برگشته: حاجی کە لە سەفا و مەروە گەڕاوەتەوە. گر مار بوده اژدهایی برگشته: ئەگەر مار بوو بە ئەژدیهایەك گەڕاوەتەوە. تنها نه ز خانەء خدا برگشته: نەك تەنیا لە ماڵی خوای گەڕاوەتەوە. آن خانەء خراب از خدایش برگشته: ئەو ماڵوێرانە لە خوای خۆی هەڵگەڕاوەتەوە.

## ١٠١

### شاه رسالت*

(پیتی) یێ

زبـان فـارسیـم هست ولـهـجـهء عـربـی
بەصد زبان دیگر عاجزم ز نعت نبی
بەقدر علم خدا از خدا صلوات و سلام
بــەروح شاه رسالت، مــحــمــد عـربــی

(*) کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون مەقسوور
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)
وەك: " بە حسن و خلق وفا کس بە یار ما نرسد
ترا در این سخــن انکــار کار ما نرسد"

زبان فارسیم هست، لهجهء عربی: زمانی فارسیم هەس و زاری عەرەبی. بە صد زبان دیگری عاجزم ز نعت نبی: بە سەد زمانی تر لە مەتحی پەیامبەر ناتەوانم. بە قدر علم خدا از خدا صلوات و سلام: هێندەی زانستی خوا سەڵاوات و سڵاو لە خواوەت لێ بێ. بر روح شاه رسالت محمد عربی: لە گیانی پاکی شای پەیام، محەمەدی عەرەبی.

## ١٠٢

### عبدالغنی البغدادی*

(پیتی) یێ

مــــن سرمــــازده را داد زغـــم آزادی(١)
خـرقــه و شام ز (عـبـدالـغـنـی الـبـغـدادی)
خرقه یا خود شفقت نامه و از جانب دوست(٢)
کــه نمایــم بــکــدامین یك ازیــنــهــا شادی

(١) سرمازدرا: (ت)، سرمازدەرا: (م)
(٢) از جانب دوست: (ت)، معطلم: (م).

(٥) مەبەست مەحمود پاشای جافە کە پێی گوتووە: (مگر یزدان کند کشف محمود پاشارا).

(٦) اول (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: "یار پیـــمـان شكـنم مـی آید

مژدەء جان بە تنم مـی آید"

مدنیت ایكنجی عنقادر: شارستانییەت سیمرخی دووەمە. أو دخی اسم بی مسما در: ئەویش نێوی بێ نێوەڕۆکە. مدنیت مكارم أخلاق: شارستانییەت مەکاریمی ڕفتار و ئاکارە. بذل و احسان فضل وتقوادر: دەهندەیی و چاکە و فەزڵ لە خواترسییە. معرفت گر صقّال اوزاتمق ایسە: ئەگەر زانین بە ڕدێن درێژ کردن بێ. بز أخفش حكیم و دانادر: بزنەکەی ئەخفەش فەیلەسووف و دانایە. ئەخفەش زانایەکی نەحو و سەرف زانە. سرو دستاردن عبارت ایسە: ئەگەر زانین بە سەرو مێزەر بێ. جحش قاضیدە (ابن سینا) در: جاشولکەی قازیش کوڕی سینایە. صورت مادەدن كنایت ایسە: ئەگەر سوورەت کینایە بێ لە مادە. آدم إبلیس، حیَّە حوَّادر: دەبێ حەزرەتی ئایەم شەیتان بێ و مار حەووا بێ. گر عبادت حجازە گیتمك ایسە: ئەگەر خواپەرستی بە چوونە حیجاز بێ. خر صوفیدە حاجی بابا در: کەری سۆفیش دەبێ باوە حاجی بێ. حسنی اوصافی اولمیان آدم: ئەگەر مرۆ خەسیەت و ئاکاری جوانی نەبێ. شكل آدمدە بر مقوَّادر: شکڵی مرۆش دەبێ مقەبا بێ. شخص أگر بولونسە بو گون: ئەگەر ئەمڕۆ کەسێکی پێکەڵ و بێ کەموکووڕی هەبێ. مرحمتلو مجید پاشا در: خاوەن بەزە، مەجید پاشایە. دودمان ملوك بابانك: لە بنەچەکەی فەرمانڕەوایانی بابان. قالمیش بر شمس عالم آرادر: مابێتەوە، خۆری جیهان ڕازێنەوەیە. دست گوهەر فشانی غبطەء كان: دەستی گەوهەر پڕژێنی وی ئێرەیی کانگایە: كف احسانی، رشك دریادر: بەری دەستی دەهندەیی وی، ئێرەیی دەریایە. واتە: دەریا ئێرەیی پێ دەبا. دستی، أول دستە بكزمز كە دیدم: دەستی وەك ئەو دەستە ناچێ، کە گوتم. حلّی مشكل أولان معمَّادر: ئەوەی هەڵێنانی سەخت بێ لەغز و موعەممایە: مەبەستی مەحموود پاشای جافە کە وەختی خۆی شاعیر گوتوویە: " مگر یزدان کند كشف كف محمود پاشارا" منَّت ایتمز جهانی ایتسە نثار: منەت بەسەر کەسدا ناکا، ئەگەر سەرلەبەری جیهان بەسەر خەڵكدا بپرژێنێ. همتی تا أو رتبە بالادر: هیممەتی تا ئەو ڕادەیە بڵندە. شعرە قارشی أقل جائزەسی: بەش بە حاڵی ڕێز لە شیعر گرتنی، کەمترین بەخششی. یا

أوطوز يا ايگرمی ليرادر: يا سی ليره، يا بيست ليرەيە. جيبە گيرمز محاسن شيمی: جوانيی ئاكاری پەنا ناگریّ. ماه تابان گبی هويدادر: وەك مانگی تاودار ئاشكرايە. وعدەء جود حاتمانەلری: بەڵێنی دڵاوايیی وی. رستەء انتظار فردا در: نێژراوی چاوەنۆڕی سبەينێيە. واتە: هيچی تێدا بەستە نييە. بزه إكرام منعمانەلری – اسكيدن قالمە ارث آبادر: بەخششی نيعمەت بەخشەكانی، هەر لە باو و باپيرانەوەی بۆ مە ماوەتەوە. دولتی وقف و ثروتی مبذول: دەوڵەتی وەقفە و سامانی هێند زۆرە بە بەخشش دەدریّ. نعمتی سائلينە يغمادر: بەخشش و نيعمەتی تالاّن و چەپاوڵی داخوازكارانە. لێرەدا حوسنی بە دووفاقی دەربڕين بەر سرنج دەكەویّ. چونكە تالاّنكردنی سامان و بەخشش ڕادەگەينیّ. لە داخوازكار پاوان كرابیّ... بەڵام ئەمە دەبێتە هەجو، ئەم بە مانای كەڵك وەرگرتن لە هونەری دووفاقی (نقيض)يە هونەرێكە لە بەلاغەتدا بۆ تەوس دە هەمبەر ماڵی دنيا، كە دەكاتەوە پەسن و ستايشی پەسنداری. ساحەء مدحنی مساحه ايدان – كلك تحرير هرزه پيمادر: بۆ ئەو كەسەی مەيدانی پەسنی پێوانە كردبیّ و لە دەهندەيیی گەيشتبیّ، نووكی خامەی نووسينی لە قسەی هەرزە و بیّ بايەخ بەو لاوە چييد يكە ناپێویّ، واتە هێندە دڵاوا و دەهندەيە، هەرچەندی مەيدانی بەخششی بۆ پەسنكردن بپێویّ، ناگاتە ئەو سەری. بر فرو قالمش انفصالندن: تەنيا فەروەيەكی لە پاش بەجیّ ماوە، ئەويش هيچ تێدا بەستە نييە فڕشە و پەسنيشە. خاك خجلت يوزنده پيدا در: تۆزی شەرمەزاری بە ڕوويەوە ديار و ئاشكرايە. جاه و إقبال و عزّتك بر جا: شكۆ و دوارۆژی خۆشت هەميشە پايەدار. أولە تا كائنات جر جا در: تا كەون و كائينات پايەدار و بیّ بمێنیّ. داورا، همتك دريغ ايتمر: ئەی حاكم! هيممەتت درێغی ناكا. ئەگەر مەبەستت (ڕەزا)ی خدا بیّ.

٨

## سلطان عبدالحمید*

(پیتی) ریٔ

سریـر سلـطـنت مـلك الـیـمـیـن آل عـثـمـاندر(۱)
خـلافت خـانـدان پـروردهٔ عـبدالـحـمـید خـاندر
وکـــیـــل فـــخـــر عـــالـــم، زبـــدهٔ ذریَّـــت آدم
أمـیـر الـمـؤمـنـیـن، ظلّ خدا، مـحبـوب یـزدانـدر
بـیـلـنـمـز هـیـئت شاهـانـه‌سی عـکس تـجـلاّدن
مـلـکـدر، یـا مـلك شاه جـهـان، یـا مـاه تـابـانـدر
خـــردمـــنـــدان عـــاجـــز، عـــقـــل کـــل قـــاصر(۲)
ره انـدیشه بـاغـلـو قـوهٔ ادراك حـیـراندر(۳)
الـنـده کـاسهٔ شمس و قـمـر درگـاهـنـه قـارشو
بوکولمش صانکه گردون بر گدای کاسه گرداندر
باصوب ناف زمینه، عرشه چیقمش تخت اجلالی
دگـل بـاد اوزره دوران أیـلـه‌یـن تـخت سلـیـمـانـدر
بـولـنـمـاز گلشن عـصرنـده غـمـدن دیدهٔ گـریـان
نسیـم رأفـتـنـدن گـل گـبـی بـلـبـلـده خـنـدانـدر
اوگوندن کیم ایشیتمش صیت عدلك چرخ دون پرور
بـنـمـلـه ایـتـدیـگـی جـور و جـفـالـردن پشیـمـانـدر
یـقـه قـورتـارمـق ایستر پـنـجـهٔ قـانـون عـدلکدن
انکـچـون گـاه یـر الـتـنـده گـاه ابـر ایچره پـنـهـاندر
یـنـه چـیـقـمـاز او شاهك عـهـدهٔ مـدح و ثـنـاسندن
(رضا) گـر فـی الـمـثـل فـنّ سخـنـدانـیـده حسّانـدر
هـــمـــیشه تـــا قـــمـــر رونـــق فـــزای طـــارم خـــضرا
هـــمـــیشه تـــا (زحـــل) آرایش ایـــوان کـــیـــوانـــدر
الـــهـــی بـــرقـــرار اولسون سریـــری عـــافـــیت اوزره(٤)
وجـــود پـــادشاه عـــصریمز کـــیـــم جـــود و احسانـــدر

(١) ملك اليمين (ت).

(٢) خردميدان(ت).

(٣) ادراكه (ت).

(٤) الهى برقرار اولسون عافيت اوزه(ت).

(*) كێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن)

وەك: " تو از هر در كه باز آيى بدين خوبىً و زيبايى

درى باشد كه از رحمت به روى خلق بگشايى"

سرير سلطنت ملك اليمين آل عثماندر: تەختی فەرمانڕەوایی بەندەی دەستی بەرەی عوسمانییانە. خلافت خاندان پروردەء عبدالحميد خاندر: بنەماڵەی خیلافەت، پەروەردەی عەبدولحەمید خانە. وەكيل فخر عالم، زبدەء ذرّيت آدم: بريكاری جێ شانازیی جیهان، پوختەی نەوە و نەتیژانی ئایەم. أمير المؤمنين، ظل خدا، محبوب يزداندر: میری خوانـاسان، سێبەری خوا، خۆشەویستی یەزدانە. بيلنمز هيئت شاهانەسی عكس تجلاّدن: وێنەی شاهانەی لە شەوقدانەوەی خۆنواندنیڕا نازاندرێ. واتە: راستینی هیوولای نازاندرێ. ملكدر يا ملك شاه جهان يا ماه تاباندر: يا مەلايەكەتە، يا مەلەكشای جیهان، يا مانگی تابانە. خردمندان عاجر، عقل كل قاصر: ژیرو بەئاوەزان ئەقڵیان تێدا كولە، ئەقڵ و ئاوەزی هەمووان كۆتایە. ره انديشه باغلو قوەء ادراك حيراندر: ڕێی ئەندێشە و بیركردنەوە گیراوە، گوردی دەرككردنی تێدا سەرگەردانە. الندە كاسەء شمس و قمر درگاهنە قارشو: ڕۆژ و مانگ كەوێڵ بەدەستەوە داماو وەكو سواڵكەر وەستاون لە پێش دەركەی. بوكولمش صانكە گردون بر گداى كاسەگرداندر: گەردوون كووڕ بووەتەوە هەر دەڵێی بۆ دەرۆزە كردن كاسە گیرێگە. كاسەگێڕ: بە كەسێك دەگوترێ بۆ دەرۆزە كاسە و سینی بگێڕێ، شتێكی بدرێتێ. با صوب ناف زمينه، عرشە چيقمش تخت اجلالى: تەختی گەورەییی پێی لە نێوكی زەمین گیر كردووە، بۆ عەرش، بۆ تەختی كردگار بەرز بووەتەوە. دگل باد اوزره دوران ايليان تخت سليماندر: ئەوە تەختی حەزرەتی سلێمان نییە بەسەر باوە دەگەڕێ. بولنمز گلشن عصرندە غمدن ديدەء گريان: لە گوڵشەنی سەروبەندی ویدا، چاوی بە گریان لە تاو خەم پەیدا نابێ. وڵات ئاسوودە و ڕەحەتە، كەس نابینی خەم

بـخـوا و بگريـێ. نسيم رافـتـنـدن گل گبـی بـلـبـلـده خـنـداندر: لـه سای شنـەبـای فـێنـكـی بـەزەيـەوە بولبوليش، وەك گوڵ خـەندانـە، دەويـەكـەنـە. او گوندن كيم ايشيتميش صيت عدلك چرخ دون پرور: لـەوێ ڕۆژێوە گـەردوونی نـاكـەس و چـەپـڕەو بيستوويـە. بنملـه ايتديكی جورو جفـالردن پشيمـاندر: لـەو جـەور و جـەفـايـانـە، لـەو زوڵم و ڕەفتـار وشك و بـرنـگـيـيـانـەی دەرهـەقـی كـردووم، پـەژيـوانـە، يـقـە قـورتـارمـاق ايستـر پـنـجـەء قـانـون عدلكدن: دەيـەوێ خۆی لـە دەست داد و عـەداڵـەتت قوتـاركـا. واتـە زۆر بـە داد و عـەداڵـەتـی قـانوون خواخوايـەتی بـەرۆكـی لـە قـانوونی عـەداڵـەتـەكـانت ڕزگـار كـا. آنكچون گـاه ير آلتنده، گاه ابر ايچره پنهاندر: هـەر لـەبـەر هـەندێيـە، كـە گـاهـێ لـە بن زەوين، كـاوێ لـە ژێر پـەڕەی هـەوردا پـەنهـانـە، خۆی وەشێردووە. ينه چيقماز او شاهك عهده مدح و ثنـاسندن: وێڕای وەش لـە عۆدەی پـەسن و پێدا هـەڵگرتنی وی نـايـە، دەڕۆستی ئـەوە نـايـە. (رضـا) گـر فـی الَـمـثـل فـنٍّ سـخـنـدانـيـده حسَّانـدر: (ڕەزا) گـەرچـی لـە هـونـەری زارپـاراويدا، حـەسسانی كوڕی سابيتی ئـەنسارييـە. بـەڵام ئـەو هـەميشـە تـا مـانـگ، ڕەونـەق فـەزای تـارمـەی شينـە. واتـە: تـا مـانـگ شـەوق زێدەكـەری ئـاسمـانـی هـەيوانی سـەرداپۆشراوە. هـەمـيشـە تـا (زُحَل) آرايش ايـوان كـەيـوانـدر: هـەمـيشـە تـا پشكـی زوحـەل ئـارايشتـی گـەردوونـە. الهی برقرار اولسون سرير عـافيت اوزره: خوايـە هـەميشـە هـەر لـەسـەر تـەختـی تـەندروستی پـايـەدار بێ. وجود پـادشاه عصريمز كيم جود و احساندر: چونكـە بوونی پـادشـای سـەردەممـان دەهـنـدەيـی و سـەخـاوەتـە.

٩

**ال جميل***

(پيتی) ڕێ

سخـــا كسبـــی دگـــل آل جـــمـــيـــلـــه، ارث آبـادر
أك أدنـــی پـــايـــەء هـــمـــتـــلـــری أوج ثـــريَّـــادر
خصوصـا مصطفی، كيم ايده بيلمم وصف ايفـاسك(١)
وفـا هـرچـنـد اكـا مـخـلص بـولـنـمش حـقـی اوفـی در
دگـل أوفـــی أگـــر اعـــلادن اعـــلا بـــرلـــقب بـــولسه
جـنـــاب (مـصطـفـی) حـضرتـلـری آنـدنـده اعـلادر

یــتشمــز دامــن اوصافــنــه سرپــنــجــهء فــکــرم
نــهــال قــامــتــی، اهــلّــیــتــی اول رتــبــه بــالادر
زلال مشربــــــی الایشی شیــــــرن عـــــذابــــنـــده
صانــورسك الــلــه الــلــه شربــتــی شهــد مـصفّــی در
دری قارننده صاقلار قورقورسندن هر زمان دریا[۲]
اگــر دریــا کــفــی دریــاسنــه دیــرسم تــعــدادر[۳]
نـیـجـه دریـایـه تشبـیـه ایـلـهیـم اول دست احسانـی
کـه کـمـتـر بـخششی عـالیلـرك مـخـصوص دریـادر
ایـدر بـیك خـاطـر پـژمـردهیـی بـر لـطف ایـلـه احـیـا
او عــالــی قــدر أگــر عـیسی دگـلسه عـمٍّ عـیسی در
(رضـــا) آل جـمـیـلـی سودیـگـنده مدح ایـدر یـوقسه
نــه حــاجت رایت احسانــلــری مـیـدانـده بـرپــادر

---

(۱) وصفی ایفاسن (ت . م).
(۲) دری قارننده صالار خشیتندن... (ت).
(۳) دیرسەم (ت).
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: "ترا من دوست میدارم ندانم چیست درمانم
مرا اندر دلـت جایـی نمی بینم نمی بینم"
سخا کسبی دگل أماً جمیله ارث آبادر: سەخاوەت بەزۆر، بە پەیداکردن نییە، بەڵام بۆ جەمیل میراتی باو و باپیرانە، بۆی ماوەتەوە. أك أدنی پایەء همتلری أوج ثریّادر: پایەی هەرە نزمی هیممەتیان چڵەپۆپەی کۆیە. خصوصاً مصطفی، کیم ایدە بیلمم وصف ایفاسك: بە تایبەت، مستەفا، کە ناتوانم لە وەسفیدا هەقی خۆی بدەمێ، لە وەسف بەدەرە. وفا هر چند اکا مخلص بولنمش حقّی أوفی در: وەفا هەر چەندە بووە بە نازناوی، بەڵام ئەوفا، بە وەفاتربووە. دگل أوفی اگر أعلادن أعلا بر لقب بولسە: نەك بە وەفاتر، بگرە ئەگەر لە سەرووترەوە نازناوێکی بەرزتر هەبێ. جناب مصطفی

حضرتلری آندنده أعلادر: جەنابی مستەفا لەوەش بڵندترە. یتشمز دامن أوصافنه سرپنجەء فکرم: سەرپەنجەی بیرم ناگاتە داوێنی ئاکار و خەسیەتەکانی. نهال قامتی، أهلیتی أول رتبه بالادر: نەمامی بەژنی لێوەشاوەییی بە ڕادەیەکی وا بڵندە: (بەپێی ڕستەبەندیی بەیتی یەکەم دەبێ لە پاش بەیتی دووەمەوە بێ.. چونکە مانای بەیتی یەکەم دەبێ بە ئەنجامی بەیتی دووەم) زلال مشرب آلایشی، شیرین عذابندە: زولالی هاوەمەشرەبیەتیی، لە ناخی ئازار بەدەستەوە خواردندا. صانورسك اللّه اللّه شربت شهد مصفًّى در: هەر دەڵێی شەربەتی هەنگوینی پاڵاوتەیە. دری قارننده صاقلار خشیتندن هر زمان دریا: دەریا لە ترس و سامی وی هەمیشە دوڕ لە نێو زگیدا وەدەشێرێ. اگر دریا کفی دریایه دیرسم تعدّادر: ئەگەر کەفی دەریا بە دەریا بڵێم دەستدرێژییە. نیجه دریایه تشبیه أیلەیم اول دست احسانی: ئەو دەستی دەهندەییەی چۆن بە دەریا بچوێنم. که کمتر بخششی عالیلرك مخصوص دریادر: کە کەمتر بەخششە بڵندەکانی، تایبەت بە دەریایەکە بۆ خۆی. ایدر بیك خاطر پژمردەیی بر لطف ایله إحیا: بە یەك لوتف هەزار دڵی سیس هەڵاتوو دەبووژێنێتەوە. أو عالی قدر اگر عیسی دگلسه عمٍّ عیسی در: ئەو پایە بڵندە ئەگەر عیسا نەبێ، مامی عیسایە. (رضا) آل جمیلی سودیگنده مدح ایدر یوقسه: (ڕەزا) بەرەی جەمیل زادەی خۆش دەوێ، بۆیە پەسنیان دەدا، ئەگینا. نه حاجت رایت احسانلری میدانده برپا در: چ پێویست دەکا، خۆ ئاڵای چاکەیان لە گۆڕێدا دەشەکێتەوە.

١٠

## سجاده تأریخی*

(پیتی) ڕێ

طولسون همیشه جیب همایون پادشاه
کیم جود (معن) و (حاتم)ی افسانه یاپدیلر[١]
سجادهء شریفەیە عبدالحمید خان
پك منتظم عمارت شاهانه یاپدیلر
هرگز جهانه گلمدی ماننـدی برفلك
هرکاری یاپدیلرسه ملوکانه یاپدیلر

تــأريــخــنــی مـطــابــق واقــع دیـدی (رضـا)[1]
(سجـادەء پـیـمـغـبـر ایـچـون خـانـە یـاپـدیـلـر)

---

(١) (کیم جور (معنی) (حاتمی) افسانه یایدیلر) (ت).
(٢) (تاریخی...) (ت).
(*) کێش: بەحری ڕەجەز مەخبوون
(مستفعلن متفعلن مستفعلن فعول)
نموونەم بۆ ئەمە وەگیر نەکەوت.
طولسون هەمیشه جیب همایون پادشاه: خدایە، گیرفانی بە فەڕی پادشا هەمیشە هەر پڕ بی. کیم جود (معن) و (حاتم)ی أفسانە یاپدیلر: کە سەخاوەتی (مەعن) و (حاتەم)ی کرد بە ئەفسانە. سجّادەء شریفەیە عبدالحمید خان: بۆ سەججادەی پیرۆز، عەبدولحەمید خان. پك منتظم عمارت شاهانە یاپدیلر: تالارێکی شاهانە و ڕێکوپێکیان ڕۆنا. هرگز جهانە گلمدی ماننده بر فلك: هەرگیز گەردوونێکی لەو وێنەیە نەهاتە جیهانەوە. هر کاری یاپدیلرسە ملوکانە یاپدیلر: هەر کارێکیان ئەنجام دا، مولووکانەیان ئەنجام دا: تأریخنی مطابق واقع دیدی (رضا): (ڕەزا) مێژووی ڕۆنانی پڕ بە واقیع چۆنە، ئەوهای گوت. سجّادەء پیغمبر ایچون (خانە یاپدیلر): بۆ سەججادەی پێغەمبەر ماڵیان دروست کرد. ئەگەر (خانە یاپدیلر) بە حیسابی ئەبجەد کۆکەینەوە، دەکا ٩١٣ ك – ١٥٠٧ز.

## ١١

### پیغمبر*

(پیتی) ڕێ

خـیــالك شبـچــراغ لــجَّــەء بــحــر حـقـیـقـتـدر
جـمـــالك نـــوربـــخش دیـــدەء أهـــل بـــصـیـــرتـــدر
سن اول مـــاه فـــلك جـــاه شهـــنشاه دوعـــالمسن
در لـطـفـنـدە شهـلـر سر نـهـاد بـاب خـدمـتـدر
حـریـم روضـنـە یـوز سورمگە مشتـاق ایکـن جـبـریل
قـیـاس ایـلـە بـکـا تـقـبـیـل درگـاهك نـە دولـتـدر

حضوره، حال ما فی البالنی عرض ایلمش، گلمش
(رضا) نك التماسی خاك پایندن شفاعتدر

..............................................................

(*) كێش: بەحری هەزەج و موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: ؛ ″مرا مـی بینـی دم زیـادت می كنی دردم
ترامی بینم و میلم زیادت می شود هر دم″
خیالك شبچراغ لُجەء بحر حقیقتدر: خەیاڵت شەوچرای قووڵایی دەریای ڕاستینە. جمالك نوربخش دیدەء أهل بصیرتدر: جوانیت ڕووناكی بەخشی سۆمای خاوەن ئەقڵ و بە ئەقڵ و بینایە. سن أول ماه فلك جاه شهنشاه دو عالمسك: ئەتۆ ئەو مانگی جێ گەردوون شكۆیەی شاهەنشای دوو جیهانی. در لطفنده شهلر سر نهاد باب خدمتدر: شایان لەبەر دەرگای لوتفت سەرلەبەر دەركەی خزمەتن. حریم روضنه یوز سورمگه مشتاق ایكن جبریل: حەزرەتی جبرائیل كە بە تاسەی ڕوو بە كاشانە ساوینتەوەیە. قیاس ایله بكا تقبیل درگاهك نه دولتدر: ئەوجا بەراوردی بفەرموو، ئەوە چ دەوڵەتێكە! حضوره حال ما فی البالنی عرض ایلمش، گلمش: حاڵی نێوانمانی عەرزی حوزوور كردووە، هاتووە. (رضا) نك التماس خاك پایندن شفاعتدر: ئەوەی ڕەزا لە خاك و پاتی نیازە، شەفاعەتە. ڕەزا لە خاكی بەر پێت داوای شەفاعەت دەكا.

١٢

**سر عسكری مختار بگە**(١)*

(پیتی) ڕێ

شفاعتكلە اوقور عرضحالمی خونكار
شفاعت است سزاوار احمد مختار
محال قلب ایدەجك ممكناتی مكتوبە
ایدرسە خامەء معجز طرازنی دركار
تو ابر فضلی و دانش یكی مشاهدە كن
بخاك تیرە چگونە است ابر گهربار

تـــو آفــتـــاب كــمـــالـــی و آفـتـاب بـبـين
چـه گـونـه بـرشيـده ايـن روزهـای كـم مـقـدار
تـو سرو گـلشن مـحـدی و سرو سايـه راست
علی الخصوص كه وقت گل است فصل بهار
بـی شاه عـرضی گـدايـی نـمـی رسد بـازی
بـــه جــور نـــاظــر اوقـــاف مــرهـــم دلــزار
اگـر امـيـد نـبـاشد بـه لـطـف عـالـی را
چه گونه گفت (رضا) شعرهای خوش گفتار

(١) (مختار) (ت).

(*) كێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصلەم موسەببەغ
(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)
وەك: ″ مرا هوای سـحرگه پيـام يار آورد
نسيم بوی بهشتی از آن ديار آمد″

شفـاعـتـكلـه اوقـور عرضحـالمـی خونكـار: سوڵتـان عـەرزی حـاڵـەكـەم (عـەرزوحـاڵ: ئەسڵەكەی ″عەرزی حاڵ″ە.) بە شەفاعەتی تۆوە دەخوێنێتەوە. شفاعت است سزاوار أحـمـد مـخـتـار: شەفـاعـەت هـەر لـە ئـەحـمـەد مـوخـتـار دەوەشێتـەوە. شاعير لێرەدا تـەلميـحێكی بۆ حـەزرەتـی پێغـەمـبـەری نـازدار كـردووە.. ديـارە لێكـچوونی نێوەكان ئـەوەی بـەبـيـردا هێنـاوە، دەنـا ئـەحـمـەدی مـوخـتـار، پێغـەمـبـەر، لـە كـوێ و ئـەحـمـەد موختاری سەرعسكەر لە كوێ؟ محالی قلب ايدەجك ممكناتی مكتوبە: هێندە لە زەبرە، ناكردەنی دەكا بە كردەنی و لەسەر كاغەز نووسراو. ايدرسە خامەء معجز طرازنی دركار: ئەگەر قەڵەمی پەرجوو تەرزی وەكار ئێخی. تو ابر فضلی و دانش يكی مشاهدە كن: ئەتۆ هەوری فەزڵی و دانايی، بڕوانە... بخاك تيرە چە گونە است ابر گهربار: هەوری گەوهەر بار بۆ خاكێكی تاريك چۆنە. واتە: هەروەكو هەوری بە دنكە بارانی وەكوو گەوهەر، خاكی ڕەش دەكا بە زەڕو زێوەر، ئەتۆش هەژاران و بێ نەوايان بەو جۆرە زيندوو دەكەيەوە.. تو آفتاب كمالی و آفتاب ببين: ئەتۆ خۆری كەماڵی و بنۆڕە خۆر. چە گونە بركشيدە اين روزهای كم مقدار: چۆن چۆنی ڕۆژگاری

کەمبرِ هەوراز هەڵکشاوە و درێژ بووەتەوە. تو سرو گلشن مجدی و سرو سایە راست: ئەتۆ سەروی گوڵشەنی و سەروی سێبەر ڕاست. علی الخصوص کە وقت گل است فصل بهار: بە تایبەت، وەرزی بەهار کاتی گوڵە. اگر امید نباشد بە لطف عالی را: ئەگەر ئومێدێك بە لوتفی عالی نەبێ. چە گونە گفت (رضا) شعرهای خوش گفتار: شێخ ڕەزا چۆنی ئەم شیعرە خۆش و ڕەوانانە دەگوت.

## ١٣

## مفلسك عطسە سنە*

(پیتی) ڕێ

مـفـلسك عـطسە سنـە صیـحـەء نـاگـاه دیـنـور
مـنـعـمك ضرطـە سنـە یـرحـمك الـلـە دیـنـور
عــالــم پــرهــنــرە عــقــل كــهــن اصحــابــی
جــاهــل بــیــخــبــرە مــرشد آگــاه دیــنــور
یـولـی اگـری گـیـدەنـە زاهـدی پـاكـیـزە گـهـر
سوزی طـوغـری دیـەنـە شاعـری گـمـراه دیـنـور
مــرتشیـنك اوقـونـور مـضبـطـەء تـبـریـەسی
هـر طـرفـدن نـیـجـە بـیك أشهـد بـالـلـە دیـنـور
بـر قـوری نـامـی قـازانمقـدە (رضـا) فـائـدە نـە
استـخـوان ریـزە شطـرنـجـە دخـی شاە دیـنـور

---

(١) ملك الیمین (ت).

(٢) علی الخصوص کە وقت گل است فصل بهار (ت).

(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: "یوسف گم گشتە باز آید بكنعان غم مخور

كلبەء أحزان شود روی گلستان غم مخور"

مفلسك عطسە سنە صیحەء ناگاە دینور: بە پژمینی موفلیس، دەنگی ناخۆشی لە ناكاو دەگوترێ.

منعمك عطسه سنه يرحمك اللّه دينور: بە ترِی بەخشندە، يرحمك اللّە دەگوترێ. عالم پر هنره عقل كهن أصحابى: بە زانای پڕ هونەر خێوی ئاوەزی كۆن دەگوترێ. جاهل بى خبره مرشد آگاه دينور: بە نەزانی لە دنيا بێ خەبەر ڕێبەری وريا و ئاگا دەگوترێ. يولى أگرى گيدەنە زاهد پاكيزه گهر: ئەوەی بەخواری بە ڕێگادا دەڕوا زاهيدی ئەسڵ و ماك خاوێنی پێ دەگوترێ. سوزى طوغرى ديەنە شاعرى گمراه دينور: ئەوەی قسەی ڕاست بكا شاعيری ڕێونی پێ دەگوترێ. مرتشينك أوقونور مضبطەء تبريەسى: پياوی بەرتيل خۆر مەزبەتە و عەريزەی دەخوێندرێتەوە. هر طرفدن نيجە بيك أشهد باللّە دينور: لە هەموو لاڕا چەندين ئەشەتو بيللای بۆ دەگوترێ. بر قورى نامى قازانمقده (رضا) فـائـده نـه: ڕەزا لـە نـێوێكـی وشك و بـرنگ چ سوود، چـە هـەڵ دەكـڕێندرێ؟ استخوان ريزەء شطرنجە دخى شاه دينور: خۆ بە هێسكی ڕیزكراوی شەترەنجيش هەر شا دەگوترێ.. واتە ناوی گەورەو دێی وێران.

## ١٤

## باقەلم كيم ضرر ايلر*

(پيتی) ڕێ

ناموس آرايان كيمسه هجادن حذر ايلر(١)
شاعر ايلـه خوش گيچنور دفع شر ايلر
تـأخـيـر مـعـاشم سكـا بـر فـائـده ويـرمـز
أى بـاعث رزقـم بـاقـەلـم كـيـم ضرر ايلـر؟
اربـاب كـرم اولـمـه فـقـط حق شنـاس اول
وجدانـى اولان كـيـمسه بـو راهـه گذر ايلـر
جاندن اوصانوب طوغريسى ترك ادب إيتدم
مـعـنـاسنى ويـرمگلـه دگل صرف نظر ايلر
انسان اولان انسانـلـره حسن نـظـر ايـلـر
مـيـدان حـمـيـتـده طـوروب تـرك سر ايلـر(٢)

---

(١) (هجادەن) (ت).

(٢) (دوروب) (ت).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف

(مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)

وەك: " آن را که خدای از قلـم لطف نگـارد

شاید که بر او زحمت مشّاطه نیارد"

ناموس آرایان کیمسه هجادن حذر ایلر: ئەوەی لە نامووس بگەڕێ لە فڕ و داشۆران دەپرینگێتەوە.. سڵ دەکا. شاعرلر ایله خوش گیچینور دفع شر ایلر: دەگەڵ شاعیراندا بە خۆشی دەگوزەرێنێ و خۆی لە گەڕ لادەدا. تأخیر معاشم سکا بر فائده ویرمز: دواخستنی مووچەکەم هیچ سوودێ بە تۆ نابەخشێ. ای باعث رزقم باقەلم کیم ضررا ایلر: ئەی هۆی ڕۆزی بڕانم، یا ببینین کێ زیان دەکا؟ ارباب کرم اولمه فقط حق شناس أول: مەبە بە خاوەنی بەخشش و دەهەندەیی، تەنێ هەق ناس بە. وجدانی اولان کیمسه بو راهه گذر ایلر: کەسێ ویژدانی هەبێ بەم ڕێگەیەدا تێ دەپەڕێ. جاندان اوصانوب طوغریسی ترك أدب ایتدم: راستیت دەوێ لە گیانی خۆم بێزار بووم، بێ ئەدەبیم کرد. معناسنی ویرمگله دگل صرف نظر ایلر: کار لەوەدا نییە مانایەکەی بە دیار ئێخم، وازم لەوە هێنا. انسان اولان انسانلره حسن نظر ایلر: ئەوەی مرۆ بێ بە چاوی ڕێزەوە لە مرۆ دەنۆڕێ. میدان حمیتده طوروب ترك سر ایلر: لە مەیدانی غیرەتدا دەوەستێ و سەر لە پێناودا بەخت دەکا.

## ١٥

## بهرام پاشانك هجویەسی*

(پیتی) ڕێ

بـو عـجـل سامـریـنك کـیـم آدی بــهـرام پـاشادر

آنك تـصویـری الـلــه ایـچــون جــای تــمــاشادر

هــنــردن، مــعــرفــتــدن، فــهــمــدن، ادراك، دانشدن

تـهـی، خـالـی، مـجـوف، صانکـه بـر شکل مقـوّادر

مـقـوّا شکـلـنــه بــرشی دیــنــور، امــا بـو عـکـروتـه

نـەوار دیـنسون کـه صورتـدن مـجـرّد بـر هـیـولادر

قدوم منحست ملزومی ویران ایتدی ایرانی(۱)
دگل ایرانه، ایراندن اویانه دفع اولادر
اگر ییلدن ییله ایلر ایسه احبابی بر دعوت(۲)
بساط آرای خوان نعمتی زیتونله خورمادر
تورّم ایلمش اشکمبه‌سی باسور رنجندن
ککرد کچه صانورسن صوت ناقوس نصارادر(۳)
نیچون مطران أفندی سومسون (بهرام پاشا)ی
که ناقوس دبردن نغمه پرواز کلیسادر
ید آشاره تسلیم ایلمش أغنام و اعشاری
لوانك حاصلی کاتبلرك بیننده یغمادر
بنم مخدوممی أغنامه مأمور إیتمدی زیرا
بیلوردی لیره بندن حاصل أولماز ایش بداوادر
ندامت حاصل ایتدم شمدی هجو حمزه پاشادن
که بو دیوسه نسبت حمزه أفلاطون دانادر

---

(۱) (قدوم نحسنی (ت).
(۲) (اگر ایلدن) (ت).
(۳) (ککزد کچه) (ت).
(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: " اگر آن ترك شیرازی به دست آرد دل مارا
به خال هندویش بخشم سمرقند و بخارارا"
بو عجل سامرینك کیم آدی بهرام پاشادر: ئەم گوێرەکەی سامیرییە، کە نێوی بەهرام پاشایە. آنك تصویری اللّه ایچون جای تماشا در: وێنەی ئەو، پیاو بۆ خوا بلّێ، جێی تواشاو لێ نوارینە. هنردن، معرفتدن، فهمدن، ادراك و دانشدن – تهی، خالی، مجوَّف، صانکه بر شکل مقوَّادر: لە هونەر، لە زانیاری، لە فام، لە تێگەیشتن و دانایی، بەتاڵ و خاڵییە و هەر دەڵێی مقەببایەکە، مقوًا شکلنه بر شیی دینور أما بو عکرته – نه وار

دینسون کە صورتدن مجرَّد بر هیولا در: ئەمە شتێکە، بە شکڵە مقەببا دەگوترێ، بەڵام قەی چێکا ئەگەر بەم هەرزەکارە لە لە هیوولا ڕووت و پەتییە بگوترێ؟! مەبەست لە هیوولا (یۆ. ع. Ule ): مایەی سەرەتای گەردوون کە هەمیشە هەر جارە ڕەنگێ و هەر کاوە حاڵ و ڕەوشێ دەپۆشێ، گاهـ سپی گاهـ سەوز و سوور، گاهـ مرۆ و جارێ زیندوو و کاوێ مردوو و تاوێ تەڕو گیاوگۆڵ.. بۆ خۆی واحیدێکی سادەیە. ئیبن ڕوشد دەفەرموێ: هیوولا، بریتییە لە تەنیا شتێك، کە هۆی ″کەون″ و ″فساد″ە.. واتە دروستبوون و لەناوچوون... هەر ″بوو″ یەك لەمە خاڵی بێ ″کائن″ و ″فاسد″ نییە... (تهافت التَّهافت ص ١٠٧ ). ئەمە لە بیروباوەڕی ئیفلاتوونڕا هەلێنجراوە.. قدوم منحست ملزومی ویران ایتدی ایرانی: پێ و قەدەمی شووم و بەدوومیی هەمیشە لە دوو، ئێرانی وێران کرد. دگل ایرانە، ایراندن او یانە دفع اولادر: نەك هەر لە ئێران بگرە لە ئێرانیش بەولاترەوە ڕەتاندنی لە بابی ئەولایە.. اگر ییلدن ییلە ایلر ایسە احبابی بر دعوت: ئەگەر ساڵە و ساڵ زیافەتێك بۆ خۆشەویستان بکا. بساط آرای خوان نعمتی زیتونلە خورمادر: ژووری سفرە و خوانی نانخواردنی نیعمەتی، بە دەنکە زەیتوون و خورما رازاوەتەوە. تورُّم ایلمش اشکمبەسی باسور رنجندن: ورگی لەتاو دەردی مایەسیری هەڵمساوە. ککرد کچە صانورسك صوت ناقوس نصارادر: هەر کە دەنرکێنێ، هەر دەڵێی زرینگەی زەنگی کەنیشتی مەسیحییانە.. نیچون مطرا نافندی سومسون بهرام پاشایی: مەتران ئەفەندی بۆ چی بەهرام پاشای خۆش نەوێ. کە ناقوسی دبردن نغمە پروازی کلیسادر: مادامێکی زەنگی لە قوونەوە ئاواز پەرت و بڵاوکەرەوەی کەنیشت بێ.. ید اشارە تسلیم ایلمش أغنام و أعشاری: باجی مەڕ و ماڵات و دەیەکی خەراجی بە دەست بەدکارانەوە داوە. لوانك حاصلی کاتبلرك بیننده یغمادر: داهاتی پارێزگا، لە نێوان کاتبەکاندا بووە بە تاڵان و بڕۆ. بنم مخدوممی أغنامە مأمور ایتمدی، زیرا: مەخدوومەکەی، کوڕەکەی منی نەکرد بە کارمەند، چونکە. بیلوردی لیرە بندن حاصل اولماز ایش بداوادر: دەیزانی لیرەی لە من وەگیر ناکەوێ، کار بە بەلاشە... ندامت حاصل ایتدم شمدی هجو حمزە پاشادن: ئیدی ئێستا لە فراوێتن و هەجوی حەمزە پاشا پەژیوان بوومەوە. کە بو دیُّوسە نسبت حمزە افلاطون و دانادر: چون حەمزە لە چاو ئەم دەویتە، ئیفلاتوونی دانایە.

١٦

**باغدەمی یوقسە داغدەدر***

(پیتی) ڕێ

باغدەمی یوقسە داغدەدر، صولدەمی یوقسا صاغدەدر
هر گیجە بر بوجاقدەدر أنسەسی بر قوجاقدەدر
غائب اولاندە کیم بیلور، جن گبی نردە صاقلانور(١)
هانگی قوناقدە أگلنور، کیملر ایلە یاتا قدەدر
بر الی سبحە گزدیرر بر الی سیك طاشاقدەدر(٢)
بو ترس اوغلی گوت ویران، سیك اوزرندە اوطوران
باشین هوایە قالدران صانکە طوروب آیاقدەدر(٣)
حامل ایکن جنابتە باشلر اذان و قامتە
بر ایاغی جماعتدە بر ایاغی بولاقدەدر
ایشلیە ایشە باشلادی، قاپدی فرنگی علتی
بوزمادی اسکی عادتی، شیمدیدە ایشلەمەقدەدر
قز گبی اینجە در سوزی، ناز ایلە قالدیرر گوزی
ایپلیك ایلە آلور یوزی، چونکە گوزی یراقدەدر(٤)
گر آنـــی زار و آغلیان گورسن ایناندە بو یالان
باشی ازیلسەدە یلان، قویروغی طولاماقدەدر(٥)

............................................................

(١) نیردە(ت).

(٢) دەشاقدەدر(ت).

(٣) دوروب (ت).

(٤) صانکە گوزی داغدەدر (م).

(٥) دولاماقدەدر (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەتوی مەخبوون
(مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلن)

وەك: ″ هرچە کنی بکن مکن ترك من ای نگار من

هرچە بری بــبر مبر سنــگدلی بە کـار من″

باغدە می یوقسە داغدەدر، صولدەمی یوقسا صاغدەدر: لە باغ یا لە چیایە، لای ڕاستەوە یا لای چەپەوەیە؟ هر گیجە بر بوجاقدەدر، انسەسی بر قوجاقدەدر: هەر شەوە لە قوژبنێك و هەر جارە پاشی لە باوەشێکدایە. غائب أولاندە کیم بیلور، جنٌ گبی نردە صاقلانور: هەرکە ون دەبێ، وەك جندۆکە کەس نازانێ لە کێندەر خۆ وەدەشێرێ؟ هانگی قوناقدە أگلنور، کیملر ایلە یاتاقدەدر: لە کێهە دیوەخان ڕادەبوێرێ، لەگەڵ کێدا لە نێو جێدایە. مسجدە لامپە یاندیرر، ذکر ایلە خلقی قاندیرر: چرا لە مزگەوتان هەڵدەکا، بە زیکر خەڵك دەخاپێنێ. بر ألی سبحە گزدیرر، بر ألی سیك طاشاقدە در: بە دەستێکی تەزبیحات دەکا، دەستێکیشی بە کێر و گونەوەیە. بو ترس أوغلو گوت ویران، سیك أوزرندە اوطوران: ئەم کوڕی گەوواده قووندەرەی لەسەر کێر هەڵنیشتووە. باشی هوایە قالدران صانکە طوروب أیاقدەدر: سەری بە حەواوەیە، هەر دەڵێی ڕاوەستاوە. حامل ایکن جنابتە باشلر أذان و قامتە: بە لەشی پیسەوە بانگ دەدا و قامەت دەبەستێ. بر أیاغی بولاقدەدر: پێیەکی لە نوێژی جەماعەت و پێیەکی لە بلاّخ (کانیاو)وە. ایشلیە ایشە باشلادی، قاپدی فرنگی علّتی: دەگەڵ ژنەکەیدا دەستی بەکار (گان) کرد، تووشی نەخۆشیی فەرەنگی (سفلس) بوو. بوزمادی اسکی عادتی، شیمدیدە ایشلەمەقدەدر: خووی کۆنی خۆی تێك نەدا، وێستاکەش لە درەوشانەوە و جونبوشدایە، نووکەش هەر خەریکی کارە.. قز گبی اینجەدر سوزی، ناز ایلە قالدرر گوزی: قسەی وەکوو ئی کیژان نەرم و نیانە، چاوی بە نازەوە هەڵدێنێ. ایپلیك ایلە ألور یوزی، چونکە گوزی براقدەدر: دەم و چاوی بە کشتەك هەڵدەگرێ، چونکە چاوی لە چەکە، مەبەستی چەکی کێرە.. گر آنی زار و آغلیان طورسن اینانمە بویالان: ئەگەر بە گریە و زارییەوەت دیت، باوەڕی پێ مەکە، ئەمە درۆیە. باشی أزیلسەدە ییلان، قویروغی طولاماقدەدر: مار سەریشی پان کرێتەوە، سەری هەر دەجووڵێتەوە..

١٧

## حمزە پاشا*

### (پیتی) ڕێ

(حمزه پاشا) ایله غۆغاده ایکن گلدی بشیر
که بشارت سنه اول خائنی عزل ایتدی مشیر[١]
ساده عزلیله قناعت ایدمم اول ترسك
ایدرم مرگ مفاجات ایله آنی تبشیر
(شیخ مونجوغ) ایله طبعی اویاجقدر زیرا
منجوغ ایله بزەنور کلّه و أعناق حمیر

---

(١) خائن (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)
وەك: "گر مرا خار زند آن گل خندان بکشم
ور لبش جور کند از بن دندان بکشم"

حمزه پاشا ایله غوغاده ایکن گلدی بشیر: که دەگەڵ هەمزە پاشادا بە شەڕ هات، مزگێنیم بۆ هات. که بشارت سکا أول خائنی عزل ایتدی مشیر: که موژدەت لێ بێ، موشیر ئەو غایەنەی لەسەر کار لابرد. ساده عزلیله قناعت ایدەمم إول ترسك: تەنها هەر بە لەسەر کارلادانی دڵم ئاو ناخواتەوە. ایدرم مرگ مفاجات ایله آنی تبشیر: بگره بە مەرگی لە ناکاوی موژدە دەدەمێ. شیخ مونجوغ ایله طبعی اویاجقدر، زیرا: تەبیاتی دەگەڵ شێخ مونجوغدا دەگونجێ، چونکە. مونجوغ ایله بزەنور کله و أعناقی حمیر: سەر و کەللە و ملی کەران بە متوموورووو دەڕازێنرێتەوە. وشەی "مونجوغ" بە ترکمانیی کەرکووکە، بە تورکیی ئەنەدۆڵێ "بۆنجوق"ە..

## ١٨

### باش قوماندان*

(پیتی) ڕێ

شراب خـون دل صهـبـای اشك حسرتـم واردر
بـو مـاتـم خـانـهء سیـنـهمده بـزم عشرتـم واردر
در پـیـر مـغـان بـگـچیلـرینك بـاش قـومـاندانی
بنم گیم سایهء فقرمده شان و شوكتم واردر
بـنـی خـالـی بـیـلورسك قـوهء قـدسیـهدن جـاهـل
سگ درگـاه غـوثـم بـن دخـی بـر هـمـتـم واردر

---

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم
(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: " بە می سجّادە رنگین کن گرت پیر مغان گوید
كە سالك بی خبر نبـود ز راه و رسم منزلها"

شراب خون دل صهبای اشك حسرتم واردر: شەرابی خوێنی دڵ و فرمێسکی تاسە و حەسرەتم هەس. بـو مـاتم خـانـهء سیـنـمـده بزم عشرتم واردر: لەم پرسەخـانـەیەی سینـەمدا بـەزمـی ڕابـواردنم هـەس. در پیر مغانك بگچیلرینك بـاش قـومـاندانی: سەرکردەی پاسەوانانی بەر دەرکەی پیری موغان. بنم كیم سایهء فقرمده شان و شوكتم واردر: ئەمنم، کە لە سایەی هەژاریشمدا هەر خێوی شان و شەوکەتم. بنی خالی بیلورسك، قوّهء قوسیەدن جاهل: من بە لە هێزی پیرۆزی خاڵی دەزانی هەی نەزان. سگ درگاه غوثم بن دخی بر همّتم واردر: ئەمن سەگی بەر دەرکەی غەوسی گەیلانیم و منیش هیممەتێکم هەس.

١٩

## حضرت گیلانی حقندهٔ

(پیتی) رێ

مـرشد کـامـل مـریـد صادقك سلـطـانـیـدر
هـر نـه امـر ایـتسه اکـا فـرمـان آنك فرمـانیدر
مـنـبـع مـاء الحیـاة مـجـمـع البـحـرانیدر
خـضر تـوفـیـق هـدایـتـدر لـدنـی کـانـیـدر
طـفـل کش کشتـی شکـنـدر صورت ارشادده(١)
حـضرت مـوسی ء وقـتك خـواجـهء عـرفـانیـدر
فـیض لـطـفندن مشامـه نـغمـهء عیسی گلـور(٢)
جـانـدر او هـربـر بـدنده جـانلرك جـانـانیدر(٣)
امـتـثـال ایـلـه (رضا) امـر جـلـیـل الشانـنـه
امـر و نـهـی مـرشدك مستـرشدك بـرهـانیـدر(٤)

---

(١) صوره (ت).

(٢) فیچی (ت).

(٣) جاندر هر بر... (ت).

(٤) امر نهی (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: ″آن که نقشی دیگرش جـایی مصوَّر مـی شود

نقش أو در چشم ما هر روز خوشتر می شود″

مرشد کامل مرید صادقك سلطانیدر: ڕێبەری تەواو سوڵتانی مریدی سەرڕاستە. هر نه امر ایتسه آکا فرمان آنك فرمانیدر: فەرمانی هەر شتێکی پێ بفەرمویێ، فەرمان فەرمانی ئەوە. منبع ماء الحیاە مجمع البحرانیدر: کانی ئاوی ژینی ئاوەڕۆی دەریاکانە. خضر توفیق هدایتدر، لدنّی کانیدر: خدری باشاری ڕێنموونی، کانی زانستی خواییە. طفل کش کشتی سکندر صورت ارشادده: ساواکوژو کەشتی شکێنە.

حضرت شکێن لە رواڵەتی رێنوێنیدا. وقتك خواجەء عرفانیدر: مامۆستای عیرفانی حەزرەتی موسای وەقتە. فیض لطفندن مشامە نغمەء عیسی گلور: بەرامەی ئاوازی حەزرەتی عیسا لە لوتفی وییەوە بۆ کەپوو دێ. جاندر او هر بدند جانلرك جانانیدر: ئەو دە هەموو لەشێکدا گیانی گیانانە. امتثال ایلە (رضا) أمر جلیل الشَّأننە: ئەی رەزا فەرمانبەرداری فەرمانی شان و شکۆی مەزنی بە. أمر و نهی مرشدك مسترشدك برهانیدر: بکە و مەکەی رێبەر بۆ خوا هەبوون بەڵگە و بورهانی مریدە.

٢٠

**نقشبندیلر***

(پیتی) ڕێ

گل صد برگ گلزار جنانـدر نقشبنـدیلـر
غـذا گل ستان لا مکانـدر نقشبنـدیلـر[١]
هزاران اجویان عشقه بذل ایدرلر زاد ارشادی[٢]
جوانمردان قصر عارفانـدر نقشبنـدیلـر
دبستان ادبده خواجەء خضر لدنّیدن[٣]
سبق خوانان ختم خواجگاندر نقشبندیلر[٤]
حقیقتده صفای قلبە نائل اولدیلر بونلر
نقوش غیریدین حرز امانـدر نقشبنـدیلر
جمال ذات حقی بولدیلر اعیان کثرتده
بوصورتده عیان اندر عیاندر نقشبنـدیلـر
ایدرلر هوش دردم خلوت اندر انجمن دائم
(رضا)یە مرکز قطب زماندر نقشبنـدیلـر

---

(١) گلستانی (ت).
(٢) غداجویان (ت).
(٣) لدیندن (ت).
(٤) خواجکان (ت).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: "اگر آن تـرك شیرازی بـه دسـت آرد دل مـارا

بـه خـال هندویش بخشم سمرقند و بخارارا"

گل صد برگ گلزار جناندر نقشبندیلر: نەقشبەندییان گوڵی صەد پەڕی گوڵزاری بەهەشتانن. هزاران گل ستان لامکاندر نقشبندیلر: نەقشبەندییان بولبولانی هەزاران گوڵجاڕی بێ شوێنن. واتە: لە خوادا تواونەوە و سیفەتی وییان وەرگرتووە؟ إذا جویان عشقە بذل ایدرلر زاد ارشادی: ئەوان تێشووی ڕێبەری بە هەڵوەدای ئەوین پێشکێش دەکەن. واتە هەر ئەوانن تۆشەی ڕێبەرایەتی، بەوانەی ئاشقە ڕاستینن، پێشکێش دەکەن. دبستـان أدبـده خـواجـهء خـضر لـدنٍّیدن – سبق خـوانـان ختم خـواجگـاندر نقشبندیلر: هەر ئەوانن لە قوتابخانەی زانستی خواوەندا، لە لایەن مامۆستای خدری زانستی خواییەوە، پێشەنگ خوێنانی خاتەمی مامۆستایانن: شێخ ڕەزا لەم دوو بەیتەدا بەلاغەت ئاراییەکی زۆر چڕ و پڕ و ئاڵۆزی بە خەرج داوە.. لە "خواجەی خضر لدنّی"دا، نەقشبەندیی بە مامۆستای خدری لەدوننی تەشبیە کردووە، کە وەجهی شەبەه، بریتییە لە کاتی پێویستدا فریاکەوتن. دیارە خواوەندی مەبەستە. قەرینەش "خدرە" بەڵام تەشبیهەکە بەرەواژە، ئەمەش بۆ موبالەغەیە.. واتە خوا بە خدر تەشبیه کراوە.. وەك نموونەی نامێی بەلاغییان کە دەڵێن "ئەبو حەنیفە وەکوو ئەبو یوسف"ە.. ئەمە لە خەیاڵی شاعیران بە دوور نییە، تەنانەت ئەگەر بکەونە هەڵدێری هەڵەی ئاینیشەوە. وشەی "ختم" بۆنی ئەوەی لێ دێ، کە تەشبیهی نەقشبەندییان بە پێغەمبەر (د . خ) کرابێ.. چونکە تەنێ پێغەمبەری ئیسلام دوا پێغەمبەری جیهانە.. ئەوەشت لەبیر نەچێ (خاتەم) و (خەتم) حقیقتده صفای قلبە نائل أولدیلر بونلر: ڕاستیت دەوێ ئەمانە لە بێ خەوشیی دڵ بەرخورداربوون. قسە قسە دێنێ: ڕێگای نەقشبەندی موراقەبە و وەجد و دڵ و دەروون لە دنیا و مافیها خاوێن کردنەوەیە، واتە پتر بە پەرۆشی خواپەرستیی دوروونین، تا بەدەنی، بەڵام بە گوێی شەرعیش دەکەن، هەموو فەرزەکانی ئاین بەجێ دێنن.. دەگەڵ ئەوانەی کە پێیان وایە، عیبادەت تەنێ هەر عیبادەتی دەروونییە، جیاوازن. واتە ئەهلی باتینیش و زاهیریشن.. نقوش غیریدن حرز أماندر نقشبندیلر: نەقشبەندییەکان لە هەڵدێرانی ناخودایی "ڕێو ڕەسمی غەیری خواپەرستی" پەناگای پارێز و ئەمانن... لە شوبهە و

بە لای ناخواییدا هەڵزەلین بە دوورن، ئەوان بۆ لەو هەڵزەلینە بەدووربوون پەناگای ئەمینن؟ جمالی ذات حقُی بولدیلر أعیان کثرتده: ئەوان لەو باوەڕەدان کە ئەو هەموو زۆرییەی بوونەوەر، شتێکی ڕواڵەتە. ئەوانە سەرلەبەر لە "یەك" لە "وحدەت"دا یەك دەگرنەوە.. واتە بڕوایان بە وەحدەتی وجوود هەس.. باوەڕیان بە فەیز هەس.. جوانیی یەکیەتیی خوا لە زۆردا، لە فرەییی بوونەوەراندا، دەبینن. ئەم بیروباوەڕە، لە کن ئیفلاتوونیش هەر بەو جۆرەیە.. لە کن فیساگۆرییانیش هەر بەو جۆرەیە، چونکە ژمارە "١" بە سەرەتای هەرچی ژمارەیەکی لە دوای "١"ەوە دێ، لە "١" ڕا، پەیدا دەبێ.. سەرەتای ئیش هەموو یەك بوونە ئەویش... بو صورتده عیان اندر عیاندر نقشبندیلر: عەیان (ع. العیان، العیانی): شتی بەرچاو و بەرهەست. ئەعیان (ع. الاعیان): شتێك وجودی خارجیی هەبێ، واتە ئەوەی لە پێش مرۆ پەیدا بوون و پاش ویش هەبووبێ، نەك ئەوەی مرۆ لە پاشان بە خەیاڵیا بە هەڵە لە زەینیدا بۆی بچێ. ایدرلر هوش دردم خلوت اندر انجمن دائم: یەکەندەردوو لە خەڵوەتی کۆڕ و مەجلیسدا بە هۆش دێنەوە، بە مانای گوستیلکیش و پایانی هەموو شتان دێ.

٢١

**اربیللی کوچك ملا حقندە***

(پیتی) ڕێ

بـــو شفـــق کـــیـــم فـــلك لـــکـــەء دامـــانـــیـــدر
پـــایمال ایـــتـــدیـــکـــی مـــظـــومـــلـــرك قـــانـــیـــدر
آه مـــظـــلـــوم نسیـــم چـــمـــن مـــفـــخـــرتـــی
دهـــن زخـــم جـــگـــر غـــنـــچـــەء خـــنـــدانـــیـــدر
مـــطـــلـــع جـدی، چـــراگـــاه حـمـل، خـانـەء ثـور(١)
بـــرطـــاقـــم جـــانـــورك عـــرصـەء جـــولانـــیـــدر
اوستنە قونمش أسد، صیرتنە بینمش سرطان
روز و شب مـــلـــعـــبـــەء عـــالـــم حـــیـــوانـــیـــدر
گـــر بـــو وحشیـــلك ایسە نـــطـــفـــەء آباء
مـــدنـــیـــت صفت غـــول بـــیـــابـــانـــیـــدر

گیچ بو اقبال جهاندن نه سعادت اومولور
بو بنادك كه ستم اعظم اركانیدر
بر بوقك كوكسنه جوهرلی نشانلر دیكیلور
بر اوصورغانی ایدر پوست نشین ارشاد
صانكی ویس القرنك زبدهء اقرانیدر
(بوالهدی) كلب حلب مخلص عالیسی ایكن
شمدی شیخ الوزرا طرّهء عنوانیدر
اویله محصول زنا، خائن مادر بخطا
رخنه جوی نسب حضرت گیلانیدر(۲)
بو گبی ایشلری چوقدر فلك سفله نواز
ایستهمز هر نه ایسه شیمهء انسانیدر
اصل انسان دیدیگك جوهر نایاب أگر
اولسه أربیلدهكی علاّمهء ربّانیدر
حضرت (حاجی عمرزاده كوچك ملا) كیم
مایهء كسب غنی سایهء احسانیدر(۳)
كیمیا ممكن ایسه حاصل فیض نظری
جام جم وار ایسه آینهء وجدانیدر
(ابن سینا) گبی چوق عالمه حكمت گوسترر
سبق آموختهء مكتب عرفانیدر
نامه پیرای حكم خامهء معجز أثری
چهره پرداز كرم دست زر افشانیدر
مظهر صدق و صفا آینهء ناصیهسی
مطلع شمس و قمر دست گریبانیدر
خرقه پوشان درِ خانگهء ارشادی(٤)
ایریشوب هر بری بر خواجهء خرقانیدر
چونكه تنظیم ثنادك صوره تقدیم دعا
نزد ارباب سخن شرط سخندانیدر

قـالـديـروب درگـه مـولايـه (رضـا) دست نـيـاز(٥)
بـر دعـا ايـلـه كـه هـنـگـام دعـا خـوانـيـدر(٦)
مـهـر اقـبـالـى جـهـانگـير أولـه تـا مـهر منـير(٧)
بـــو رواق فـــلك زيــــنت ايــــوانــــيــــدر

---

(١) چراگاه (ت).
(٢) رخنه جويى (ت).
(٣) غنا (ت).
(٤) خانقه (ت).
(٥) مولايا (ت).
(٦) هنگام (ت).
(٧) مهر و منير (ت).
(*) كێشك بەحرى ڕەمەڵ مەخبوون ئەصلەم
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)
وەك: "گر سر صحبت اين بى سر و پايت باشد
بر سر و چشـم من دلشده جايت باشد"

بوشفق كيم فلگك لكەء دامانيدر: ئەم شەفەقە، سوورايیی ئاسۆی سەر لە ئێوارەی داوێنـی پـەڵـەی گـەردوونـە. پـايمال ايـتـديگی مظلوملرك قـانيدر: كـە خوێنـی ئـەو زۆرلـێكراوانـەيـە كـە پێخوستی كردوون. آه مـظلـوم نسيم چمن مفخرتی: ئـاهـی زۆرلێكراو؛ شنەی چيمەنی شانازييەتی. دهن زخم جگر غونچەء خندانيدر: زاری برينـی جگـەر خـونچـەی خـەندانيـەتی. مـەبـەستی ئـەوەيـە، كـە هـێنده بـە دەنگی زۆر لـێكـراوانـەوە دەچـێ، هـێندەيـان بـۆ بـە پـەرۆشە، هـەناسـەی گـەرمـی كـەساسيـان بـە شنەبای فێنك دەزانێ، هێندە ئاشقە پەرۆشی مەزڵوومە، بەدەنگی ناڵە و زارييەوە چوونيان بە فەخر دەزانێ، شانازی بەوەوە دەكا، لەسەر زۆر لێكراو و بەشخوراوان هـەڵـداتـێ و دڵـی پـێ فـێنك دەبـێتـەوە. مـەبـەست لـە زاری بـرينـی جگـەر خـونچـەی خەندانيەتی ئەوەيە، كە هەر ئێش و ئازارێكی لەسەر هەژارانی پێ بگا، نارەحەتی ناكا، بگرە دڵخوشی دەكا، پێ دەكەنێ... شاعير لەم دوو بەيتەدا چەندين (بەيان ئـارايـی)ی كردووە: لێكچواندنی (ئـاه)ی زۆرلـێكراو بـە (شنـە) لـە عورفی بـەيـاندا

(تەشبیهی بەلیغ)ە. (چەمەنی مەفخەرەت) ئیستیعارەیەکی مەکنییەیە.. قەرینەکەی (ئیزافە)یە.. (مەفخەرەت) بە (مێرگ) چوێندرایە. زیکری موشەببەهـ، حەرفی موشەببەهـ بیهی کرایە. هەروەها تەشبیهی (زاری برینی جگەر) بە (غونچە) تەشبیهێکی بەلیغی دیکەیە. بەلیغ واتە: موشەببەهـ و موشەببەهـ بیهی زیکرکرابێ. (غونچەی خندان) ئیستعارەیەکی ئیشتیقاقی خەت تەبەعییە. کرانەوە و پشکتنی جومبد، خونچە بە کەنینیە خەنینەوە ئیستیعارەیەکی ئیشتقاقی خەت تەبەعی خەت موسسەرەحەیە... زیکری موشەببەهـ بیهی و حەزفی موشەببەهـ کرایە مطلع جدی چراگاه حمل، خانەء ثور: جێ هەڵاتنی بزن لەوەرگەی بەرخ، خانەی گا. بیر طاقم جانەورك عرصەء جولانیدر: جەولانگای دەستەیەك درندە و جانەوەرە مەبەست لە (مطلع جدی) ئەفەریقا، یا عەرەبستان، لە (چراگاه حمل) ئەوروپا، یا دەولەتی ئێران. لە خانەی سەور ئاسیا یا عوسمانییە أوستنە قونمش اسد صیرتنە بینمش سرطان: پشکی شێری لەسەر نیشتووەتەوە، پشکی قرژاڵ سواری پشتی بووە. (أسد) ئینگلیز، (سرگان) روسی مەبەستە. روزو شب ملعبەء عالم حیوانیدر: رۆژ و شەو بووە بە یاریگەی جیهانی ئاژەڵ. گر بو وحشیلیك ایسە نطفەء آباء: ئەگەر نوتفەی باوکان ئەم وەحشیگەرییە بێ. مەدەنییەت سیفەت غول بیابانیدر: شارستانییەت ئاکاری غوولی بیابانە. گیچ بو اقبال جهاندن، نە سعادت أومولور: لەم ئیقباڵ و دەوڵەتی جیهانە دەست هەڵگرە. بو بنادك كە ستم أعظم أركانیدر: بەختەوەرییەك لە بینایەك كە ستەم گەورەترین پایەکانیەتی، چ ئومێد دەکرێ. بیر بوقك گوكسنە جوهرلی نشانلر دیکیلور: نیشانی جەوهەردار بە سینگی گووەکەوە دەچەقێندرێ. كە فلان مملكتك قوجە قوماندانیدر: کە گۆیا قوماندانی زەبەلاحی فلان وڵاتە. بیر آوصور غانی ایدر پوست نشین إرشاد: ترکەنێك دەکا بە پۆستنشینی رێبەرایەتی. صانکی ویس القرەنك زبدەء اقرانیدر: وەك بڵێی سەرتۆپی هاووڵانی وەیسولقەرەنییە. وەیسولقەرەنی (ویس القرنی) لە یارانی حەزرەتی عەلی (خ . ل) بوو. ئەم پیاوە پیرۆزە نە تەنێ لە کن حەزرەتی عەلی، بگرە لە کن حەزرەتی عومەر و یارانی گەورەی پەیامبەریش خۆشەویست بوو و زۆریان رێز لێ دەنا. هێندە سەروساختی لەگەڵ پەیامبەردا خەستوخۆڵ بوو، کاتێ بیستیەوە پەیامبەر لە شەڕی ئوحوددا ددانی لەدەست داوە، دوو ددانی بەنبرەی پێشەوەی خۆی هەڵکێشا. ئەم مرۆ پیرۆزە تا بڵێی لە خوا ترس و دیندار بوو. کاتێکی بیستیەوە حەزرەتی عەلی لەشکر کێشێیەك بۆ غەزا دەکا، لەگەڵیدا

ڕێك کەوت، چوو بۆ شەڕ و لە جەنگەی شەڕێدا شەهید کرا. ئەم نەقڵەم لە کتێبی "عارفان ایران" خوێندووەتەوە، بەڵام لغت نامەی دهخدا، دەڵێ: کوڕی بەتووتە، فەرموویە، وەیسولقەرەنی کوڕی عامیر کوڕی جوز و کوڕی مالیك، لە تیرەی کوڕانی مراد، یەکێ لە دنیادەستبەردارانی پەیڕەوانی پەیامبەر بووە. بۆ خۆی بە بنەچەکە خەڵکی یەمەنە. بە سەروبەندی پەیامبەردا نەگەیشتووە. نەبووە بە یارانی عومەری کوڕی خەتاب و لە شەڕی "صفین"دا دەگەڵ حەزرەتی ئەبوتالیبدا بووە، نەقڵ گێڕان پتر لەسەر ئەو باوەڕەن کە دە هەمان شەڕدا، لە ساڵی ٣٧ ك. دا: ٦٥٧ز دا، کوژراوە. بە پێی قسەی کوڕی بەتووتە ، ئارامگای ویی لە شاری دیمەشق دیدەنی کردووە. (بوالهدی) کلب حلب مخلص عالیسی ایکن: بولهودا، سەگەکەی حەڵەب، کە دڵسۆزی جەنابی عالیی بوو. شیمدی شیخ الوزرا طرەء عنوانیدر: هەنووکە توڕڕەی ناونیشانی شەیخولوزرا، پیری وەزیرانە. اویلە محصول زنا: خائن مادر بخطا: نەویرەی زیناو غایەنی داك بە هەڵەبووی. رخنە جوی حضرت گیلانیدر: لە ڕەخنەگەر و گزارە لێ کێشی حەزرەتی گەیلانییە. بو گبی ایشلری چوقدر فلك سفلە نواز: گەردوونی سپڵەلاوێن لەم جۆرە کارە حیزانەی زۆرن. ایستەمز هر نە ایسە شیمەء انسانیدر: هەرچی ئاکاری مرۆیەکییە، نایەوێ. (طبع ناساز جعل را بوی گل درد سراست:) اصل انسان دیدیك جوهر نایاب: ئەگەر ئەو گەوهەرە نایابەی کە ماکی مرۆی پێ بێژی. اولسە اربیلدەکی علامەء ربانیدر: هەبێ، ئەویش زانای گەورەی خواوەندییە. حضرت حاجی عمر زادە کوچك ملا: حەزرەتی عومەر زادە، مەلای گچکە کە. مایەء کسب غنی، سایەء احسانیدر: سایەی دەهەندەیی و چاکەی وی مایەی دەوڵەمەندی وەگیر خستنە. کیمیا مومکن ایسە حاصل فیض نظری: ئەگەر کیمیا کارێکی کردەنی بێ، ئەوە لە سەر شاڕێی لوتف و چاوێرییی ویدایە، جام جم وار ایسە آینەء وجدانیدر: ئەگەر جامی جەم (جەمشید) هەبێ، ئەوە نەینکی ویژدانی وییە. ابن سینا گبی چۆق عالمە حکمت گوسترر: حیکمەت و فەلسەفە بە زۆر زانای وەکو کوڕی سینا نیشان دەدا، سبق آموختەء مکتب عرفانیدر: پێشان فێر بووی فێرگەی عیرفانییە. عرفان: هەویرێکی سەیری لە چەندین فێرگە فەلسەفەییانەی جیهان پێکهاتگە. لە عیرفان (تصوف)دا بیروبڕوای بەرەهەمانیان. ڕیواقییان، نەستورییان میهرییان، موسڵمانانی لە خوا ترس، بیر و بۆچوونی ئەفلاتوونییانی نوێباو، تەنانەت شەمەیەك لە ئاینی زەرتوشتیش هەن. عیرفان بە مانای "میستیك" یا "میستیسیزم"،

یا ″گنۆسیسم″، کە بە مانای بە ڕەمز و پێوار، نەپەنی″یە. کە فارس بە ″عرفان″ یان تەرجەمە کردووە. بە گشتی بریتییە لە جیهانبینیی ئاینی تایبەت کە پێوەندیی مرۆ، چ ڕاستەوخۆ و شەخسی و نزیکایەتی (بگرە بە دیدار گەیشتن)ی خوا دەگەیەنێ و پێی وایە لە ڕێی ″شهود″ و ″ ئەزموونی دەروون″ و ″دیدار″ و ″حال″ەوە بە خودا گەیشتن کارێکی لە توانست بەدەر نییە. بەلاَم تەسەوف نە لە قورئاندا، نە لە فەرموودەی پێغەمبەردا (د.خ)دا، هیچ بنەمایەکی نییە. ئەوانەی ئایەت و حەدیسی پیغەمبەر بە پێی خوایشتی خۆیان لێك دەدەنەوە، ڕاست ناکەن. تەسەووف لە سەدەکانی ٥، ٦، ٧، ی ك.دا هیندستان و ئێرانەوە، دزەی کردووەتە نێو ئیسلامەوە. نامە پیرای حکم خامە و موعجز أثری: نامە ڕازێنەوەی حوکمی خامەی سروش تەئسیری وی. چهرە پرداز کرم دست زر افشانیدر: ڕوخساری پەرداختکەری کەرەمی دەستی، زێڕ پرژێنی وییە. مظهر صدق و صفا آیینەء ناصیەسی: ئاوێنەی هەنیەی جێ شەوقدانەوەی ڕاستی و بێ خەوشییە. مطلع شمس و قمر دست گریبانیدر: ئەو جێی خۆر و مانگی لێ هەڵدێن، دەست بۆ گیرفان بیەی وییە. ئەگەر وابێ، مانایەکەی وای لێ دێ: خۆر هەلاَت و مانگ هەلاَت گیرفان و بەریکی وییە. خرقە پوشان در خانەگەء ارشادی: مریدە پەلاَس پۆشەکانی بەر دەرکەی ڕێبەرایەتیی وی. ایریشوب هر بری بر خواجەء خرقانیدر: پێ گەیون و هەر یەکە خواجەیەکی خەرقانییە. خەرقانی: شێخ ئەبولحەسەن عەلی کوڕی جەعفەر کوڕی سەلمانی خەرقانی، یا عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی عاریفی گەورەی سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی، لە ڕوخسارە هێگجار درەخشانەکانی عیرفانی ئێرانییە، کە ئازادانە بیر کردنەوە و خەڵك گەرایی جیهانی و بەرفراوانیی نیگای مرۆڤەکی و بیری بڵندی عیرفانی بە مۆرك و شەقڵی تایبەت و کەم مانەندە. خەرقانی، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەم و سەرەتایەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا لە خەرقانی قومس (کومش)، کە ئەوڕۆ ئوستانی سەمنانە، ژیاوە. ئەو لە ساڵی ٣٥١ یا ٣٥٢ی کۆچیدا لە شارۆکەی خەرقانی قومسی سەر بە بوستام (لە سێ فەرسەنگیی باکووری بوستام هەڵکەوتووەو نهۆ سەر بە شارستانی شاروودە لە سەمنان) لە دایك بووە و لە ڕۆژی سێشەمە، دەیەمی مانگی موحەررەم (عاشوورا) لە ساڵی ٤٢٥ ك. دا لە تەمەنی حەفتا و سێ ساڵیدا، لە شارۆکەی قەرخاندا، لە دنیای ڕوون سەری نایەوە. خەرقانی شێخ بایەزیدی بوستامیی مەزن، لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچیدا کە شێخ و پێشەنگی حاڵی جەزبە و بیرکردنەوە

و ڕامـانـی وی بـوو، ئـەویش وەك عـاریـفـی هـاوچـەرخـی نـامێی، شێخ ئـەبوسەعید ئـەبـولخـەیر، خـیرقـەی ئـیرشادو تـەریقـەتـی لـە شیـخ ئـەبـولـعـەبـاس، ئـەحـمـەد کوڕی محەمەد عەبدولکەریم قەسابی عامیری وەرگرتووە. چونكه تنظیم ثنادن صوره تقدیم دعا: چونکە پاش پێشکێش کردنی ستایش و سەنا. نزد ارباب سخن شرط سخندانیدر: لـە کـن شاعـیـر و قسە پـەروەران، مـەرجـی قسەزانـی و زمـان پـاراوی شاعـیـریـەتـە. قالدیروب درگه مولایه (رضا) دست نیاز – بر دعا ایله هنگام دعاخوانیدر: ڕەزا دەستی نیاز بۆ دەرکەی خواوەند بڵند کە و دوعایەك بکە، کاتی دوعاخوێنییە. مهر اقبال جهانگیر اوله تا مهر منیر: میهری ئیقبال و دەوڵەتی سەر لەبەری جیهان بگرێتەوە، تا خۆی ڕووناککەرەوە لە گەڕدابێ. بو رواق فلك زینت ایوانیدر: چونکە ئەو، بەزەك و دۆزەکی هەیوانی ئەم ڕیواقی گەردوونەیە.

## ٢٢

## یوزدخی*

(پیتی) زێ

یـتـمـیش سکسان دردیمی درمـان ایـده بـیـلـمـز
مشکـلـلـریمی یـوز دخـی آسان ایـده بـیـلـمـز(١)
یـوز الـلـی ایـلـه بـیـتـر أمـا گـدی دوران(٢)
یـوز الـلـی قـدر لـیـرەیـی احسان ایـده بـیـلـمـز
یـا دەست تـهـی گلسه اگـر (مـوسیء عمـران)(٣)
ویـران اولان تـکـیـەیـی عـمـران ایـده بـیـلـمـز

............................................................

(١) مشكلريمی (ت).

(٢) يوز اللی بيتر (ت).

(٣) موسی عمران: (موسايی عمران) اوقونور. (ش)

(*) کێش: بحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف
(مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن)
وەك: " اندوه تو شد وارد کاشـانەام امشـب
مهمـان عزيز آمده در خانەام امشب"

یتمیش سکسان دردیمی درمان ایده بیلمز: حەفتا و هەشتا دەردم دەرمان ناکا. مشکللریمی یوز دخی آسان ایده بیلمز: گرفتەکانم سەدیش ئاسانیان ناکا. یوز اللی ایلە ایش بیتر أما گدی دوران: بە سەدو پەنجا کارەکە مەیسەر دەبی، بەڵام رۆژگاری نامەرد. یوز اللی قدر لیره بر احسان ایده بیلمز: ئەوەندەی سەد و پەنجاش ناتوانی چاکەیەك ببەخشی. یا دست تهی گلسە اگر موسی عمران: ئەگەر موسای کوڕی عیمران بەدەستی خالی بی. ویرانه اولان تکیەیی عمران ایده بیلمز: ناتوانی تەکیەی وێران چاك کاتەوە، تەعمیری کا. هاوئاهەنگیی نێوان (عیمران، بابی مووسا و عیمران بە مانا ئاوەدانکردنەوە) جیناسە.

## ۲۳

## قوماندان فلاطون تدبیر*

(پیتی) شین

طشت زرینی آلوب باشنه دنیایی دولاش(۱)
آتکی سور دیەمز کیمسه سکا آتلو یواش
بارك الله قوماندان فلاطون تدبیر
اختلاسك أوگنه گیچدی نه أل کسدی نه باش

..............................................................

(۱) دنیای (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەقسوور

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)

وەك: ″همه کس را تن و اندام جمال است و جوانی

وین همه لطف ندارد تو مگر سرو روانی″

طشت زرینی آلوب باشنه دنیایی دولاش: تەشتی زێڕین بە سەر سەرەوە بگرە و دنیا پەی کە. آتنی سور دیەمز کیمسه سکا آتلو یواش: ئەسپی خۆ تاو دە، کەس پیت نالێ، هۆ سوارەکە لە سەرەخۆبە. بارك اللّه قوماندان فلاطون تدبیر: بترەژم هۆ سەرکردە، بۆ خۆت و تەگبیری ئەفلاتوونییانەت. اختلاسك أوگنه گیچدی نه أل کسدی نه باش: ڕێی لە دزی و گزی و فزی گرت، نە دەستی بڕی و نە سەر.

## ٢٤

### توفیق بگ میرلوا*

(پیتی) فیّ

نسخـەسی گـلـدی بـکـا سویـلـدیگ مـدح رؤوف
ایچنه بن دخی بر نسنەیی صوقسام دیمه اوف(١)
بـطـن فـضلـنـده نـهـان نـافـەء حـکـمت آثار
ینـه چـیـقـدی قـوقـوسی یـعـنـی ریـاح مـألـوف
قـــوەء شاعـــرەیـــی شعـــردن آکــلار عــارف
مـثـلاً بـعـره ایـلـه اولـدی أبـاعـر مـعـروف
ذات والاکـزی مـدح ایـتـمـگـه شایستـه ایـکـن
بـو تـنـزل یـاقـیشیـرمـی سنك ادراکـنـه یـوف(٢)
بـر گـنـیش حـوصلـەوار سنـده کـه مـاشااللـه
او گنیش ظرفه صیقار هر نەیی قیلسه مظروف
شربت شعـــر بـــخـــور تـــاکـــه روانت بـــاشد
نشود دفـــع قـــبـــوضیت طـبـعت بـه سفـوف
بـــو سیـــه اژدره بـــگـــزر قـــلـــم تحریـــرك
کـه آچـوپ آغـزیـنـی ایسترسه ایدر عـالمی لـوف(٣)
ایش مـوافـق گـلـەمـز اولمسه تـوفـیـق رفـیـق
نـیك وبـد جـمـلـەسی تـوفـیـق اوزرنـده مـوقـوف
تـخت یـاپـدیـر ده، چـابـق اول، بـزه گـوندر، تـوفـیق
سن دخـی قـاچ غـروشك ایـلـه (رضـا)یـه مـصروف

................................................................

(١) صوقارسەم(ت).

(٢) یوف: بوشنه، یوس، بادهوا، بادوا... قاموس ترکی ص ١٥٦٣. ش. سامی.

(٣) آچوب آغزینی (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەڵ موسەممەن ئەصلەم
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فع لن)

وەك: ″هرگز آن دل بنمیرد کە تو جانش باشی

نیك بخت آن کە تو در هر دو جهانش باشی″

نسخەسی گلدی بکا سویلدیگك مدحە رؤوف – ایچنە بن دخی بر نسنەیی صوقسام دیمە اوف: نوسخەی ئەو پەسنە بە بەزەیەی فەرمووتە پێم گەیشت، ئەگەر منیش شتێکی تێ ئاخنم مەڵێ ئۆف، بطن فضلندە نهان نافەء حکمت آثار: نێوکی حیکمەت ئاسەوار لە نێو زگی فەزل و هونەریدا وەشارتییە. ینە چیقدی قوقوسی یعنی ریاح مألوف: دیسان بۆنی بای گۆڕین هات، واتە بای خواسایی تڕ و تس دیسان هات. قوەء شاعرەیی شعردن آکلار عارف: پیاوی شیعرناس بەهرەی شاعیری لە شیعری شاعیرەوە هەڵدەسەنگێنێ. مثلا بعرە ایلە اولدی اباعر معروف: بە نموونە وشەی ئەباعر کە کۆی ″بعیر″ە، بەعرە، کە پشکەڵی وشترە، بوو بە ناسراو و نامێ. مەبەستی ئەوەیە، کە وشتر بە کەرسۆیەکەیدا دەناسییەوە گا بە گۆمدا دەناسییەوە، ئەو کابرایەش بە تڕو تسەکەیدا دەناسرێتەوە، بە قسە قۆڕەکانیدا، کە لە شیعر ناچن، بگرە کە لە تڕو تس دەچن، دەناسرێنەوە. ذات والاکزی مدح ایتمگە شایستە ایکن: لە کاتێکدا شایستەی ئەوەیە پەسنی جەنابی عالیتان بکا. بو تنزل یاقیشرمی سنك ادراکنە یوف: ئەمە هەر وا بە بەلاش و هەرزە بۆ شانی تۆ دەبی، لە شانی تۆ دەوەشێتەوە؟ بر گنیش حوصلە وار سندە ما شاالله: بە راستی جیکلدانەت ماشەللا فرەوانە. او گنیش ظرفە صوقار هر نەیی قلسە مظروف: هەر چییەك بکا بە مەزرووف دەو دەفرە هەراوەی دەپەستی، مەبەستی لە زەرف، قوون و لە مەزرووف، کیرە. دیارە زەرف و مەزرووف، کە بە رواڵەت چامە ستایشەکەیە، کە ئەویش خامەی خۆی تێ وەرداوە. شربت شعر بخور تا کە روانت باشد: خۆشاوی شیعر وەخۆ، تا زگت رەوان بی، نشود دفع قبوضیت طبعت بە سفوف: قەبزیت بە خوێاوکیش چارەسەر ناکرێ. سفوف: بە دەرمانێك کە بە خوێ وەگیرێ دەگوترێ. بر سیە أژدرە بکزر قلم تحریرك: خامەت وەك ئەژدیهایەك دەچی. آچوب آغزینی ایسترسە ایدر عالمی لوف: زاری دەکاتەوە، بیەوێ، دنیا هەڵدەلووشی. ایش موافق گلەمز أولمسە توفیق: ئەگەر باشار و سەرکەوتن یار نەبی، کار راست نایە، کار مەیسەر نابی. نیك و بد جملەسی توفیق اوزرندە موقوف: چاك و خراپ هەموو بەسەر سەرکەوتنەوە بەندە. دیارە ″توفیق″ دوو مانای هەس، یەکەمیان بە رواڵەت باشارو سەرکەوتن، دووەمیان، توفیق بەگی میر ئالایە. واتە ئەو هەموو گانکەرە بە سەر جەنابی تۆفیق بەگەوەن.. تخت یاپدیردە، چابوق أول بزە

گوندر توفیق: ئەختەکە دروست کەو تۆفیقمان لە بۆ بنێرە. مەبەست، یا باشار و مەدەدمان بۆ بنێرە، یا میرئالای، تۆفیق بەگمان بۆ بنێرە بیگیین... سن دخی قاچ غروش ایلە (رضا)یە مصروف: ئەتۆش چەند قرۆشێك بۆ (رەزا) بۆ خەرجی بنێرە. ئەوجا "تۆفیق" دەبیتە مونادایش..

٢٥

## أهل عراق*

(پیتی) قاف

معتدل گیتمز هواسی گه صاوقدر گه صیجاق[١]
ناموافقدر مزاجی أهلنه بکزر عراق[٢]
بو عراقك خلقنی (حجاج) اصلاح ایتمدی
هر طرفدن ملتك قانك ایدردی انهراق[٣]
حق تعالی تقسیم ایتمشدر نفاقی اون یره
طقوزك ویرمش عراقك اهلنه بالاتفاق
گیجه گوندوز چالیشر کسبنده بولماز ازدیاد
کیسەسی بوش، قارنی آج، باشی آچیق، یالین ایاق[٤]
مختلف آب و هواسی دردی چوقدر رزقی آز
راحت ایسترسك اگر خاك عراقدن اول اوزاق
زنگینی سکران گبی، مسکینی سرگردان گزر[٥]
باطلی تصدیق ایدرکن حق سوزه ویرمز قولاق
بو عراقك طوپراغنده صوگبی آلتون آقار
صو کنارنده صوسز خلقه صویی اولمش یصاق

(١) صاووقدر (ت).
(٢) ناموافقند (ت).
(٣) انهراق (ت.).س
(٤) باش (ت).

(٥) زەنگی (ت).

(*) کێش: بەحری رەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: " هر زمان زین سبز گلشن رخت بیرون می برم

عالمی از عالم فکرت به کف می آورم"

معتدل گیتمز هواسی گە صاوقدر گە صیجاق – نا موافقدر مزاجی أهلنه بگزر عراق: عیراق مجیزی ناسازە، بە خەڵکەکەی دەچی، ئاووهەوای سازگارانه ناڕوا، جاری سارد و کاویژ گەرمە. بو عراقك خلقنی (حجاج) إصلاح ایتمدی: خەڵکی ئەم عیراقە حەجـجـاجی کوری یووسفی سەقەفی چارەسەری نەکرد. هر طرفدن ملتك قانك ایدردی انهراق: لە هەموو لاڕا خوێنی میللەتی دەڕشت. حق تعالی تقسیم ایتمیشدر نفاقی اون برە: خودا دووڕوویی کردووە بە یازدە بەشەوە: طقوزك ویرمیش عراقك اهلنه: نۆی بە خەلکی عیراق بەخشیوە. گیجە گوندوز چالیشیر کسبنده یولماز ازدیاد: شەو و ڕۆژ لە هەڵپەی ژیاندا خەریکە، کەچی هیچی وەگیر ناکەوی. کیسەسی بوش قارنی أج، باشی آچیق، یالین أیاق: کیسکی بەتال، زگی خاڵی، سەری قۆت، پێخاوس. مختلف آب و هواسی دردی چوقدر، رزقی آز: ئاووهەوای ناجۆر، دەرد و قوڕبەسەریی زۆر، رۆزیی کەم و قوت. راحت ایسترسك اگر خاك عراقدن اول أوزاق: ئەگەر سەرسووکی و ئاسوودەییت گەرەکە، لە عیراق دوور بە. زنگینی سکران گبی، مسکینی سرگردان گزر: دەوڵەمەندی وەك سەرخۆش و دەستەوسانی سەرگەدان دەگەڕێ. باطلی تصدیق ایدرکن حق سوزە ویرمز قولاق: دە کاتێکدا بڕوا بە پڕوپووچ و هەرزە دەکا، گوێ بە قسەی هەق نادا. بو عراقك طوپراغندە صو گبی آلتون آقار: لەم خاکی عیراقەدا، زێڕ وەکو ئاو لەبەری دەڕوا، صو کنارندە صوسز خلقە صویی أولمش یصاق: ئاوی لە گوێی ئاو، لە خەلکەکەی پاوان کراوە.

## ٢٦

## سلطان عبدالحمید خان غازی*

(پیتی) کاف

(قـل هـوالـلـه احـد) حـرز سر مـاه أفسرك

مست صهـبـای (ألـم نشرح) دل دانشورك

مستشارك عـــقـــل اول هـــمـــدمك (روح الامين)
دستـگــيــر فــيض أقــدس، (اسم اعــظــم) يــاورك
تــاج و تـخـتك تــا ابـد مـحـفـوظ (الـلـه الـصمد)
(آيــة الـكـرسي) مـدد (انــا فـتـحـنــا) رهـبـرك
ريـــــزه سنگ آستـــانك دره تـــاج الملـــوك[١]
قرة الـــعين سلاطين خـــاكـــپـــاى انـــورك
بــرجـهــان كـفـاره قــارشو، غـمـزهء خـوبـان گـبـى
صف چـــكـــوپ آمـــادهء هــيـجــا سپـاه صفـدرك
تـــاج و تـــخت دولت يـــونـــان دل عـــاشق گــبـــى
سيـــنـــه چـــاك نـــاخـــن سيــم سمــنــد عسكـرك
جـوهـر فـردك وجـودى يـوق ديـهن جـاهـل دگـل[٢]
نص قـــاطـــعـدر بـــو دعـوى أوزره نـوك خـنـجـرك
عـرشه آصمـه قـورقـارم عـرشى ده ايـتسون رخـنـهدار
جـــوهـــر فـــرد كـــيـــان تـــيـــغ ثـــريـــا جـــوهـــرك
هــدهــد شاهــد (سبــأ) يــا سايــهء بــال هـــمـــا[٣]
يـــــا دم بـــــاد صبــــــادر رخش آهـو پـيـكـرك[٤]
جـــانشين فـــخـــر عـــالمسك عـــجب مـــى اولسهلـــر
(جم) قولك (كى) بنده (خاقان) كوله (كسرا) چاكرك[٥]
حـى قـائـمـلـه حسابـى بـر گـلـور (عـبـدالحمـيـد)
چـــوق دوام ايـــتسون گـــرگ ذات عـــدالت گستـــرك
مـــرحـــمت كـــارا، سلـــيـــمـــان حشمـــتـــا، شاهـــنشهـــا
أى (رضا) لب تشنـــــهء احسان عـــــالـــــم پـــــرورك
شفــقت مــلت نــوازك صورسه كــيــمــدر بــو (رضا)
(طـالـبـانـى) (عـبـدالـرحـمـن) زاده مـورى احـقـرك
مـهـر مـاه اولـدقـچـه رخشان روز و شب، تـابـان اولـه
اوج بـــــرج سلـــــطـــــنـــــتـــــده آفـتـــاب مـنـظـرك

..............................................................

(١) پاره سنك آستانك دره التاج الملوك (ت).

(٢) دیەن (ت).

(٣) هدهد شاهد (سبأو) سایه و بال هما (ت).

(٤) یادەم (ت).

(٥) چاکرن (ت).

(*) کێش: بەحری رەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: " باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدیش

بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش"

قل هو اللّه احد حرز سر ماه أفسرك: سوورەتی قول هووەللاهو ئەحەد، نوشتەی چاوەزاری سەری مانگ تانجت. واتە سەرت وەك تانج وایە. مست صهبای ألم نشرح دل دانشورك: دڵی زانست وەرت مەستی شەرابی ئایەتی "ألم نشرح"ە. شاعیر دوعای خێر بۆ سوڵتان عەبدولحەمید دەکا، دەڵێ ئایەتی "قل هو اللّه" نوشتەی سەرت و دڵی وریا و زانست وەرت بە شەرابی قل هو اللّه مەست بی؛ چونکە ئایەتی ئەم سوورەتە دەڵێ خواوەند سینگی پەیامبەری شەق کرد و لە هەموو خەوش و بەلغێکی خاوێن کردەوە و بە ئەوینی خۆی مەستی کرد. مستشارك عقل أول، همدمك روح الامین: راوێژکارت عەقڵی ئەووەل، هاودەمت حەزرەتی جبرائیل. مەبەست لە "عقل أول" یەکەم ئەقڵ لە دە ئەقڵەکان کە لە فەلسەفەدا باسی کراوە، واتە یەکەم ماکی دنیا پەیدابوون.. دیارە بە پێی فەلسەفەی ئایدیالیستان.. دستگیرك فیض أقدس، (اسم أعظم) یاورك: دەستگیرت فەیزو بەرەکەتی پیرۆزتر و نێوی گەورەتر یاوەرت. مەبەست لە ئیسمی ئەعزەم، نێوی خوا "اللّە" یە. تاج و تختك تا أبد محفوظ (اللّه الصمد): تاج و تەختت هەتا هەتایە دە پەنای ئایەتی "اللّه الصمد"دا بی. "صمد" بە مانای پتەو، مەحکەم دێ. "آیة الكرسي" مدد "إنا فتحنا" رهبرك: ئایەتولکورسی مەدەدکار و ئایەتی إنا فتحنا رێبەرت بی. ریزه سنگ آستانك درهء تاج الملوك: وردە بەردی بەر هاسانەکەت مرواریی تانجی شایانە. قرة العین سلاطین خاکپای انورك: قورەتولعەینی سولتانان خاکی بەری پێی تۆی لە هەموو رووناکییەك رووناکترت. "قرة العین" بە کوردی بە مانای چاوڕوونییە. وشەکە لە قر – یقر –ەوە هاتووە، واتە

چاو فینك بوونەوە. عەرەب کە بە یەکی دەلی قرت عیناك، واتە چاوت فینك. دە قورئاندا دەفەرموێ "لكي تقر عينك" واتە: بۆ وەی چاوت فینك بیتەوە. بر جهان کفارە قارشو، غمزەء خوبان گبی – صف چکوب آمادەء هیجا سپاە صفدرك: سپای درِ بە ریزی لەشکردەرت دە هەمبەری جیهانێکدا لە کافران، وەك غەمزەی جوانانی چاك سانی بەست، ریز بوو، ئامادە و تەیار بوو. تاج و تخت دولت یونان دل عاشق گبی: تاج و تەختی دەولەتی یونان وەك دلی عاشق. سینە چاك ناخن سم سمند عسکرك: سینە سبە بە چنگورکی سمی سەمەندی سەربازانت هەلدراو. سەمەند بە ئەسپێکی زەرد ئامال دەبێژرێ. جوهر فردك وجودی سوق دیەن جاهل دگل: ئەوەی کە دەڵێ جەوهەری فەرد نییە وە نەبی نەزان بی. نص قاطعدر بو دعوی اورزە نوك خنجرك: نووکی خەنجەری تۆ بوو ئەم کێشەیە بەڵگەی بێ چەند و چوونە، دەقی بێ گومانە. دەلی فەیلەسووفان لە سەر جەوهەری فەرد، داخوا هەیە یان نییە، هەرایانە و لە کێشەدان، یەك دەڵێ هەیە و یەك دەڵێ نییە. لە پێشترێ باسی ئەوەمان کرد، کە زانست ئەمەی ساغ کردووەتەوە و "جوزئی لایەتەجەززا" ئەفسانەیە و راست نییە، واتە هەموو شتێ بە سەر خۆیدا دابەش دەبی و هەرگیز دواییی نایە.. ئەمەش بە کردەوە، زانستی ئەتۆم ساغی کردووەتەوە دیارە لە دنیای مادەدا. شاعیر ستایشتی سوڵتان دەکا، دەڵێ ئەوەی دەڵێ جەوهەری فەرد نییە، نەزان نییە، چونکە نووکی خەنجەری جەوهەرداری تۆ ئەم کێشەیەی یەکلا کردووەتەوە، کەواتە خەنجەری تۆش جەوهەرە و جەوهەری دیکەش هەیە، جەوهەری فەرد نییە مادامێکی خەنجەری تۆش جەوهەرە، دیارە لە یەك جەوهەر زێتر هەیە و مەفهوومی "حصر" راست نییە و "تعدد" هەیە. فەردایەتی، تاکایەتی نییە تەنێ خوا نەبی.. بەلام شێخ ڕەزا لە پەسنی چکۆڵەیی زاری ماشووقدا، ئەمەی بە پێچەوانەوە گوتووە، لەوێدا دەڵێ زاری ماشووق هێند گچکۆکەیە، بووە بە جوزئی لایەتەجەززا، ئەوەی کە ئیدی بە سەر خۆیدا دابەش نابی... عرشە آصمە قورقارم عرشی دە ایتسون رەخنەدار: خەنجەرت بە عەرشەوە هەڵ مەواسە، دەترسم عەرشیش رەخنەدار کا. جوهر فرد کیان تیغ ثریا جوهرك: جەوهەری فەردی کەیانییان، تیخی کو، جەوهەری تۆن. "هدهد شاهد (سبأ) سایەء بال هما – یا دم باد صبا در رخش آهو پیکرك: پەیوە سلێمانکەی شاجوانی "سەبەء" و باڵی هوما – یا وزەی بای سەبا رەخشی پەیکەر مامزتن. جانشین فخر عالمسك، عجب می اولسەلر. ئەتۆ جێنشینی جێی شانازی جیهانی، چما هیچ سەیر لەوەدا

هەیە. ″جم ″ قورك ″کی″ بندە ″خاقان″ کولە″ کسرا″ چاکرك: جمشید بەندەت، خوسرەو کۆیلەت کیسرا نۆکەرت بن ″سبأ″ نێوی شارێکە لە عەرەبستانی کۆن، لە ولاتی یەمەنێ کە شای وی بە بەڵقیسا نامێ بوو و بە قسەی تەورات بە دیداری پادشای جهودان، سلیمان گەیشتووە و سەروساختی دۆستانەی دەگەڵدا بنیات ناوە و بەپێی قسەی باوی ئیسلام شووی پێ کردووە. هدهد ″ع. الهدد″: پەرەولێکە لە تەرحی بـاڵسووك ″ POSSEREOUX ف.″ دنـدووك نـاسك ″ Tenuirostrف.″ مكـان كـە دندووکێکی نووك تیژ و درێژ و خوار و لەشێکی هێندەی سار، سارچە، سرچە، پاساری، چویك و کێشکەی هەیە و گەزەندە خۆرە. بە تەنیا دەژی و لە بەژنی داران هێلانە هەڵدەکۆڵی. تانج کلاوێکی جوانی هەس و وەك باوەشین دەتوانی وەی کاو دای ئێخی. ئەوجا لەبەر هەندێ ″شەبەسەر″ی پێ دەگوترێ. وا مەشهوورە کە پەیکی حەزرەتی سلیمان بووە و نامەی لە نێوان حەزرەتی سلیمان و شا بەڵقیسدا پێ نێردراوە. هما ″پ . همای″: بە مانای پیرۆز، فەرخوندەیە. باڵدارێکی راویی رۆژانەیە، لەشێکی تا ئەندازەیەك درشتی هەس. پەڕی سەرەوەی مشکی رەنگ و ئامال سپییە و رەنگی سینگی ئامال زەردی مەیلەو خەنەییە و چەند پەڕێکی بڵندتری بەسەرەوە هەیە و بە هەردوو لایدا شۆڕ دەبنەوە و هیندی پەریش دە بن دندووکیدا هەن و لێی بوون بە نەخش. ئەم پەرەو لە بەستەزمانە هەر چەند بە جۆری راوی ڕۆژانە لە قەلەم دریاگە، بەلام خۆراکی لە هیسك زیتر نییە و هێسکان لە سەر زەوین کۆدەکاتەوە و لە بڵنداوییەوەی بە سەر بەردی چیاکاندا هەڵدەدێرێتە خوار و پاش هورد و خاش بوونی، دەیانخوا. پێشینان ئەم باڵندەیەیان بە مایەی بەختەوەری زانیوە و پێیان وا بووە کە سێبەری بەر هەر کەسێ کەوێ بە خۆشبەختی بەرخوردار دەبی. حی قائملە حیسابی بر گلور ″عبدالحمید″: عەبدولحەمید حیسابی دەگەل″حی قائم″دا کە خوایە، یەك دەردەچێ. چوق دوام ایتسون گرك ذات عدالت گسترك. زاتی داد بەربلاوت هەمیشە هەر بەردەوام بی. مرحمت کارا، سلیمان حشمتا، شاهنشها: ئەی کار بەزەیی بە خەڵکدا هاتنەوە، ئەی سلیمان دەبدەبە و سەنسەنە، ئەی شای شایان: ئەی ″رضا″ لب تشنەء احسان عالم پرورك: ئەی رەزا لێو تینووی چاکە و بەخششتی جیهان پەروەرت. شفقت ملت نوازك صورسە کیمدر بو ″رضا″ ئەگەر ئەم رەزایە بپرسی بـەزەیـی نـەوازی مـلـتـت کـێیـە؟ ″تـالـبـانـی″ عـبـدالـرحـمـن زاد″ مور احقرك؟ دەڵێم: عەبدوڕەحمان زادە نازناو تاڵەبانی، مێرووی لە هەموو کەمینان کمتەر. مهر ماه

اولدقچه، روز و شب، شابان اوله – أوج برج سلطنتده آفتاب منظرك: مانگ و ڕۆژ له گەڕانی خۆری دیمەنت شەو و ڕۆژ له پشکی فەرمانڕەواییدا، هەمیشە هەر تابان و درەوشاوە بی.

۲۷

**حمزه پاشا***

(پیتی) کاف

نشر اولندی تزك تازه گبی بر غزلك
اول تزكدن بیلورم حالی یماندر صقالك(۱)
صقلك هر بری جاروب خلایه دونەجك
حمزه بابا بو ایسه زادهء طبع جعلك
گیت سنك عزلك ایچون کیمسه تأسف ایدەمز
تا کوپك وار ایسه کرکوکده سنك چوق بدلك(۲)
بو لواده املك قالماق ایدی بیللرجه(۳)
گوتنه قویدی فلك رشتهء طول املك
سنی تشییع ایدرم دیدهء گریان ایله آه
دوشمەدی دامه اول بچهء آهو کفلك
اوپریم لبلرینی، اشك ندامت توکریم
او لب غنچه دهن، اول پسر لب عسلك
گلیریم بن ده سزکله بینریم آرقه کزه(٤)
بر ایمش مادەلری چونکه جمیلی جملك
عزل عالیکزه ظن ایتمه (رضا) اولدی سبب
سوء کردار و فساد عملندر عملك

(۱) جاوربی خلایه (ت).
(۲) ... کرکوکده چوقدر بدلك (ت).

(٣) بیلرجه (ت).

(٤) گلردم (ت).

(*) کێش: بەحری رەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)

وەك: " هر كه دو كـوى خرابات مـرا بـار دهد

بـه كمال و كرمش جان من إقرار دهد"

نشر أولندى تزك تـازه گبى بر غزلك: غەزەلێکت وەکوو تـەپاڵەی تـەڕ بڵاوبووەوە. أول تزكدن بيليورم حالى يماندر صقالك: بەم تـەپاڵەيەدا دەزانم ريشت حاڵی پەرێشان. صقالك هر برى جاروب خلايه دونەجك: هـەر تەڵێ لە مووی ریشت دەبی بە گەسكی ئاودەستخانە. حمزه بابا بو ايسه زادهء طبع جعلك: هەمزه بـابـا، بیت و ئەمە بێ مجێزی قالۆنچانەت. كيت سنك عزلك ايچون كيمسه تأسف ايدەمز: بڕۆ حەوت بەرد لە شوێنت، كەس داخت بۆ ناخوا، كەس گونت لۆ لە خم نادا. مەبەستی ئەوەيە كە ئەو شيعرەی حەمزه پاشا بڵاوی كردووەتەوە لەو گووە دەچی، قالۆنچە و كيزك خلى دەدەن. چونكە زۆر هيچ و پووچ و قۆڕە. قسە قسە تێرێ: ئەم قالۆنچە بيلا مانێ گوو خلدەرە، رۆژگارانی كۆن، ميسرييان پەرستوويانە و لە سەردەمی تەوتەمييەت (دار و دەوەن و جانەوەر و تەير و توو پەرستن)دا بە سەرچاوەی خێر و بێريان لە قەڵەم داوە؛ چونكە پێيان وابووە ئەو پيساييیەی لە چاڵێكدای بۆ توێشەی زستانی وەدەشێری، مايەی بڕشت و بڕستی زەوين بووە و بێ ئەو گووە، كە بۆ زەوين بووە بە پەين، كشتوكاڵ سەرناگرێ. هەكە لە درۆشمی ميسريی كۆن ورد بييەوە، دەبينی گۆيەك لە نێوان دوو شاخی قالۆنچەيەكدايە، بەڵام پاشان ئەم خلە گووە بووە بە گۆی رۆژ و بۆ خۆت دەزانی تيشكی رۆژيش هەر سەروكاری بە كشتوكاڵەوە هەيە. ئەمە يەك. دووەم بۆ شايەتيی ئەم قسەيە، ميسرييەكان بە سەدان قالۆنچەيان لە دار و شتی ديكە دروست دەكرد و دەگەڵ مردووانيان، لە گۆڕخانەكانياندا وەدەشێردن، كە گۆيا نيشانەی ئەوەيە كە مردوو زيندووە و هەروەكوو لە دنيای رووندا پێويستی بە هەموو شتێكە، هەروا لە دنيای تاريكستانيشدا پێويستی بە خۆراك و شمەك و هەموو جۆرە كەلوپەلێك هەس... لەبەر هەندێ، هەموو شتێكيان دەگەلدا، لە گۆڕخانەكاندا، بۆ دادەنان. ئـەمـەش لـە هـەڵـكەنـدنـی گۆڕخـانـە قـووچـەكـەكـانی ميسردا، ئاشكرا بـە ديارکەوتووە و گومانی تێدا نييە... گيت سنك عزلك ايچون كيمسه تأسف ايدەمز: بڕۆ

ئەستۆت ورد کە، کەس خەم و داخت بۆ ناخوا. تا کوپك وار ایسە کرکوکدە سنك چوق بدلك: تا سەگ لە کەرکووکدا هەبی، جیاتیت زۆرن. بو لوادە أملك قالماق ایدی بیللرحە: بە هەویای ئەوەوە بووی لەم پارێزگایەدا چەندین ساڵ بمینییەوە. گوتنە قویدی فلك رشتەء طول أملك: کەچی رۆژگار سەربەنی هەویای درێژی لە قوونت نا. سنی تشییع ایدریم دیدەء گریان ایلە آە: ئەگەر بە دیدەی گریانەوەت بەرەو گۆڕستان بە ڕێ کەم: دوشمدی داممە أول بچەء آهو کفلك: بە داخەوە سمتی وەك سمتی ئەو مامز بێچووەتم بە داوەوە نەبوو. أوپریم لبلرینی أشك ندامت توکریم: لێوەکانت ماچ دەکەم، فرمێسکی پەشیمانی دەرێژم. أول لب غنچە دهن، اول پسر لب عسلك: ئەو کورە خونچە لێوەکەت، ئەو لێو هەنگوینەکەت ماچ دەکەم. گلیریم بن دە سزکلە بینرم أرقەکزە: ئەمنیشو دەگەڵ دێم، سواری پشتوو دەبم. ایمش مادەلری چونکە جمیل جملك: چونکە مادەی وشەی "جمیل" و "جمل" یەك شتە. واتە وەك وشتر وای. عزل عالیکزە ظن ایتمە (رضا) أولدی سبب: پێت وا نەبی (رەزا) بوو بە هۆی دەست لە کارکێشانەوەتان، لە کاردەرکردنتان. سوء کردار و فساد عملندر عملك: ئەوە لە خراپیی کردەوە و چەوتیی رەفتارتەوەس.

٢٨

**در مدح عبدالله پاشا کە حملە**

**برسر عشیرت میراودلی برد***

(پیتی) کاف

دامـــان دلـــیـــرانـــەء بـــنـــد کـــمـــر ایـــتـــدك
کـــوه و کـــمـــر پشدری زیـــر و زبـــر ایـــتـــدك
کـــاشـانـــەلـــری اوج ثـــریـــا ایـــلـــە هـــمـــدوش
بـــر طـــائـــفـــەء اشراری هـــم آغـــوش یـــر ایـتدك
تـــابـــع اولانـــی یـــرلـــرینـــە ایـــلـــدك اسکـــان
طـاغـی قـالانـی صـاغـە سوروب دربـدر ایـتدك
خـیـبـر گـبـی بـر قـلـعـەء آلمق دگـــــل آسان
الـلـە ایـچـون ای حـضرت والـی هـنـر ایـتدك

صف بستــهء جــنگ ایــلــدیــگك عسکــر اوگــنــده
جـولان ایـدەرك مـلـتــه جـانك سپـر ایـتـدك[1]
قــیــردك قــوهء طــاغــیــەنك انــفــنــی مـکسور
هــپ آنــلــری مــحــکـوم بــر أدنــی نـفـر ایـتـدك
بـیـلـدرمك ایـچـون سلـطـنت و شان و شکـوهـی
گـوش فـلك الأطـلسی طـوپ ایـلــه کـرّ ایـتـدك
ایــرانـــی دخـــی ألمق ایــدی مــقــصدك أمـــا
انـصافــه یـاقشمـاز دیـو صرف نـظـر ایـتـدك
اسلـوب حـکـیـمـانـه ایشی عـوقـه صالـوردی
تشهـیـر سلاح ایـلــه سوزی مـخـتـصر ایـتـدك
عشق اولسون اگـر بـویـلـه ایسه دوریـه چـیـقـمـق
چشم ظـفـره جـلـوه ویـران بـر سفـر ایـتـدك
عـصرك گـیـدیشی مـنـهـج عـدل اوزره دگـلـدی
فـتـحکلـه آنـــی رشك زمـــان عـــمـــر ایـــتـدك
بـر حـمـلــه ایـلــه قـالمادی قـارشنـده مـبـارز
أی فـــارس مــیــدان شجــاعت نـــهلـــر ایـــتـدك
یـــوز سورمك امــیــدنــده ایــدم پــایــنــه أمـــا
بـخـتـم بـکـا یـاو اولمادی چـابـوق گذر ایـتدك
یــاخـود صاقـنـمـق عـادت ایمش شاه گـدادك
شاعـــرده گـــدادر دیـــو آنـدن حـذر ایـتـدك[2]
یــا بشقــه سبب دن طـولایــی شیــخ (رضا) نك
خـوش گـوکـلـنـی پـامـال سپـاه کـدر ایـتـدك[3]

---

(١) سبر (ت).

(٢) دواندن (ت).

(٣) خوشلولکی (ت).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف

(مفعولُ مفاعيلُ مفاعيلُ فعولن)

وەك: ″ آن را كە خـداى از قلم لطـف نگارد

شايد كە بر او زحمت مشّاطە نيارد″

دامان دليرانەيى بند كمر ايتدك: شاقەڵى دلێرانەت هەڵكرد، مەردانە هاتيە كار. كوە و كمر پشدرى زير و زبر ايتدك: چيا و بەردى پشدەرت ژێر و ژوور كرد. وشەى ″كمر″ بە ماناى پشتيش و بەرديش دێ. ئەم كەمەرە كە بە گۆرانييە، لە كورديى باكوردا بووە بە كەڤر، لە هێندێ ناوچە گەرميان ″كەور″ يش دەگوترێ. هەروەها ″تەوەن″يش و ″كوچك″يش دەگوترێ. كاشانەلرى أوج ثريّا ايلە همدوش – بر طائفەء أشرارى هم آغوش ير ايتدك: تيرەيەكى بەدكارت، خانە و كاشانە دەگەڵ لووتكەى كۆدا هاوشانت، هاوباوەشى زەوين كرد. واتە ئەوانەى سەريان لە ئاسمان دەسوى دەگەڵ زەويندا بە يەك كرد. تابع أولانى يرلرينە ايلدك إسكان: ئەوانەى مليان دا لە جێى خۆت دامەزراندن. طاغى قالانى صاغە سوروب دربدر ايتدك: سەركێش و كەڵەوەكێشت بەرەو لاى ڕاست ڕادان و دەربەدەرت كردن. واتە بۆ ئێرانێت دەركردن. ئەم چامەيە بە ڕواڵەت ستايشت و پەسنە، بەڵام لە ناوكرۆكدا تەوس و گاڵتە پێكردنە.. چونكە عەبدوڵڵا پاشا لەم شەڕەدا سەر نەكەوت و بە سەرشكاوى و قوون دڕاوى لە شەڕى پشدەرێ وەگەڕا و لە كاريش وەلا نرا. خيبر گبى بر قلعەيى آلمق دگل آسان: گرتنى قەڵايەكى وەك خەيبەر كارێكى هاسان نييە. اللّە ايچون اى حضرت والى هنر ايتدك: پياو بۆ خوا بڵێ بە ڕاستى هونەرت نواند. صف بستەء جنگ ايلديك عسكر أوكندە: بەو ڕێز و سان بەستنى شەڕەى لە پێش لەشكرتدا نواند. جولان ايدەرك ملتە جانك سپر ايتدك: گيانت بە تاخت و تاز و لە دژمن هەڵكردنەوە كرد بە سەنگەرو سوپەر. قيردك قوەء طاغيەنك انفنى مكسور: دەماخى هێزى سەركێش و هارت شكاند. هپ آنلرى محكوم بر أدنى نفر ايتدك: ئەمانەت سەرلەبەر كرد بە ژێر دەستەى نەفەرێكى لە هەمووان پلە و پايە نەويتر. بيلدرمك ايچون سلطنت و شان و شكوهى – گوش فلك الأطلسى طوپ ايلە كرّ ايتدك: بۆ ئەوەى فەرمانڕەوايى و شان و شكۆى فەرمانڕەوايى بە دنيا ڕاگەيەنى، گۆى گەردوونى ئەتلەسيت بە گرمەى تۆپ كەڕ كرد. ايرانى دخى آلمق ايدى مقصدك أما: دەت هەويست، ئێرانيش بگرى، بەڵام فەرمووت لەگەڵ ويژدانىدا ناگونجێ، وازت هێنا. اسلوب حكيمانە ايشى عوقە صالوردى: شێوەى حەكيمانە و ئاقڵانە كارەكەى گۆج دەكرد. تشهير سلاح ايلە سوزى مختصر ايتدك: بە چەك هەڵكێشان قسەكەت كورت و موختەسەر كردەوە. عشق أولسون اگر بويلە ايسە

دوريه چيقمق: ئافەرين، ئەگەر ئەمە كارى پاسەوانى و بۆدەورييە دەرچوون بێ. وشەى ″دوريە″ بە ماناى چەرخەى پاسەوانە. زۆر جارى وابووە، عوسمانى بۆ بزواندنى هێزى سەربازى لەشكرێكى بە ناوى دەوريەوە دەناردە سەر كوردستان، سربستان يۆنانستان، چييە؟ وەڵڵا سەرباز ماندوون، با كێشمانێكى خۆيان بدەن و برش هەڵ نەهێنن. توركى ملهوڕ بە بيانووى ئەمەوە دەكەوتنە وێزەى خەڵكى بەستەزمان، بزنيان لێ دەستاندن، پووڵيان لێ دەستاندن و..... و .... والييبەكانى بەغدا كە بە زۆر، كەنيزێكى ئەرمەنى، يا لاز، يا ئەنجاز، يا بۆسنى، يا هەرسەك، يا ئەڕنەووتيان بە تالان دەبرد و دەگەڵ ئەوەكەى ئەورۆ، جاشى كەرێك بوون، هەميشە دەگەڵ سەردارانى كورد بە بڕوبيانوو بوون و گەڕيان پێ گێڕاون و بووە بە شەڕ و هەڵڵا و كوشت و كوشتار، جارێ پشدەر، جارێ بڵباس، جارێ ئاكۆ، جارێ ماكۆ و هتد... لەبەر ئەوە جارێ بە سەرشكاوى و قوون دڕاويى والى و لەشكرى واليش شكاوەتەوە... ئەم كارە مێژوويينەى عوسمانى بۆ هێندێ هەتيوچەى كۆنە دووڕەگ و سێ ڕەگ و بەرماوەى سەردەمى عوسمانيى گۆڕبەگۆڕ، پاش ئەوەى ئينگليس بۆ نەوتى كوردستان، عوسمانيى خوێڕووى، لە بەغدا و بەسرا و كوردستان وەدەرنا و بە ناو حوكوومەتى عێراقى دامەزراند، مايەوە. لە شەڕى كوردستاندا كابرايەكى ئەحمەقى گەمژە كە نێوى عەبدوسەلام عارف بوو، كە چەوساوەى پێ پەتيى دەناردە سەر كوردستان دەيگوت ″الجيش العراقى″ بۆ ″نزهة″ دەنێرم... پێى وابوو، شەڕى كوردستان گەشت و گەڕانە... بەڵام هەر بە قووندڕاوى و سەرشكاوى دەگەڕايەوە... تەنانەت چەوساوەى وڵاتى شاميشيان دەو ″نزهە″يەدا تاقى كردەوە، بەڵام ئەو خوێڕووە، بە بنەچەكە بەرماوەى سوريان و ئارام و گاڕان و هارانە، لە چەوساوەى بەغدايێ قووندڕاوتر و سەرشكاوتر دەگەڕانەوە.... چشم ظفره جلوه ويران بر سفر ايتدك: بە ڕاستى سەفەربەرێكى وات كرد چاوى زەفەر و سەركەوتنت ڕوون كردەوە، عصرك گيديشى منهج عدل أوره دگلدن: ڕەوت و ڕەفتارى سەردەم و زەمانە لە سەر بەرنامەى داد و عەداڵەت نەبوو. فتحكله آنى رشك زمان عمر ايتدك: بەم فشە فش و سەركەوتنەت، ئەم سەفەرەت كرد بە مايەى ئێرەيى و حەسووديى سەروبەندى ئيمامى عومەر، واتە هێندە سەركەوتنێكى گەورە و گرانت وەدەست هێنا، زەمانى ئيمامى عومەر بەخيليى پێ دەبا، بر حمله ايله قالمادى قارشندە مبارز – اى فارس ميدان شجاعت نه لر ايتدك: بەختم بە يار نەبوو هەر زوو تێ پەڕى. ياخود صاقنمق عادت ايمش شاه گدادك: ياخۆ، عادەت وايە شا خۆى لە گەدا و سواڵكەر دەبێ بپارێزێ.

شاعرده گدادر دیو أندن حذر ایتدك: فەرمووت، شاعیریش گەدایە، سڵت لیّ کرد و لیّی پرینگایەوە، یا بشقە سببدن طولایی شیخ (رضا) نك: خوش گونلکی پامال سپاه کدر ایتدك: یا لەبەر هۆی دیکە خۆشی خۆشیی شێخ ڕەزات پێخوستی سپای خەم کرد.

## ٢٩

## مدحیه*

(پیتی) واو

سن أی میرلوا الهام ربانیله ملهم سن(١)
بیلورسن سرّ غیبی عالم أسراره محرم سن(٢)
بو استعداد ایله سردار أکرمدن مکرّم سن
دگل سردار أکرم صدر أعظمدن معظّم سن
گروه اشقیا قارشنده طوفان غضب اما(٣)
(رضا) آسا اولان بیچارەلر حقنده ارحم سن

(١) میری لوا (ت).

(٢) سری غیبی (ت).

(٣) گروهی أشقیا (ت).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: ″ تو از هر در که باز آیی بدین خوبیّ و زیبایی

دری باشد که از رحمت به روی خلق بگشایی″

سن ای میر لوا الهام ربانیله ملهم سن: تۆ ئەی میری لیوا (جەنڕاڵ)، بە سرووشی خوایی گۆش کراوی. بیلیرسن سرّ غیبی عالم اسراره محرم سن: پەنامی پێوار دەزانی و لە نهێنی و ڕازەکان ئاگا و خەبەرداری. بو استعداد ایله سردار أکرمدن مکرم سن: بەم بەهرەیەوە، لەلایەن سەرداری لە هەموان بە کەرەمترەوە، کەرەم پێ بەخشراوتری. دگل سردار أکرم صدر أعظمدن معظّم سن: نەك هەر سەرداری ئەکرەم، بگرە لە صەدری ئەعزەم (سەرۆکی وەزیران)یش مەزنتری. گروه أشقیا قارشنده طوفان غضب أمّا: دە بەرابەر دەستەی یاخی و ئەشقیادا باو بۆرانی تووڕەیی و ڕکی.

(رضا) آسا أولان بیچارەلر حقندە أرحم سن: ئەتۆش وەك (ڕەزا) لە بۆ بێچارە و بیٚ نەوایان، بە بەزەتری.

٣٠

**أهل توحید***

(پیتی) کاف (ن)

دلـی مـرآت شوق کـبـریـادر أهـل تـوحـیـدك
شهـودی هـر نـفس ذوق لـقـادر أهـل تـوحـیـدك
زر خـالص ایـدر قـلب سیـاهـی خـارق عـادە
غـبـار خـاکـپـای کـیـمـیـادر اهـل تـوحـیـدك
لسان حـالـی حـل طـلسمـات عـجـایـبـدر
مـحـقـق هـر بـری مشکل گشادر أهـل تـوحیدك
دم عـیسی احـوالـی، یـد بـیـضادر اقـوالـی
کـلام جـانـفـزا، نـطـقـی شفـادر أهـل تـوحـیـدك
یـا (ابراهیم ادهم) در یـا خـود مخدوم اعظم در
(رضـا) یـە هـر بـری مـرد خـدادر اهـل تـوحیدك

............................................................

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: ″ دلا یاری دگر جستی بدین کار از تو خوشنودم

تو از زاری بیاسودی من از خواری بـیـاسودم″

دلی مرآت شوق کبریادر أهل توحیدك: بەرەی خوا بە یەك زانان دڵیان نەینکی شەوقی گەورەیی خوایە. شهودی هر نفس ذوق لقادر أهل توحیدك: بەرەی خوا بەیەك زانان خوا لە یەك پشوودا بۆ بەدیارکەوتنیان زەوقی بە دیدار شادبوونیانە. مەبەست لە ″شهود″ پەردە لە نێواندا نەمان و خوا، چە بە دڵ، بە چاوی مرۆیەك کە لە بەندوباری دنیا خۆی ڕەها کردبیٚ، مەبەست ئەوەیە کە موسڵمانی خوا بە ڕاستی و بە زانست بە یەك زان، زەوق لە دیداری خوا وەردەگریٚ. ″عرفان″ کۆمەڵێك زاراوەی

تایبەتی هەن: شوهوود، ویسال، وەجد... سۆفی پێی وایە مرۆ بۆ وەی بە شوهوود بگا، دەبێ، بەم هەڵدێرانەدا تێپەڕێ: خواست، ئەشق، لە دنیا دەستبەرداری، خوا بە یەك زانین، سەرسوڕمان، لە خوادا توانەوە... زر خالص ایدر قلب سیاهی خارق عادە: زێڕ بێ خەوش دەکا و دڵی ڕەش لە عادەت بەدەر دەکا. یا دڵی ڕەش وەك زێڕی بێ خەوش لێ دەکا . غبار خاکپای کیمیادر أهل توحیدك: بەرەی خوا بە یەك زان گەردی خاکی پێیان کیمیایە. لسان حالی، حل طلسمات عجایبدر: زمانی حاڵیان، گرێ خاوکەرەوەی تەلەسمە سەرسوڕهێنەکانە. محقق هر بری مشکل گشادر أهل توحیدك: بێ گومان هەر یەکێ لەبەرەی وان گرفت ڕەوێنە. دم عیسی در أحوالی، ید بیضا در أقوالی: ئەحواڵیان، حاڵ لێهاتنیان هەناسەی حەزرەتی عیسایە، قسە و فەرمایشتیان وەك پەرجووی حەزرەتی پەیامبەرە، کە خودا فەرمانی دایێ دەستی پیرۆزی لە بەرکی وەك مانگی سپی دەرێنێ. کلام جانفزا، نطقی، شفادر أهل توحیدك: بەرەی خوا بە یەك زان وتەیان جونبوشی گیان زێدەکار و فەرمایشتیان شیفابەخشە. یا (ابراهیم أدهم) در یاخود مخدوم أعظم در: هەر کێهەیان دەگری، ئیبراهیم ئەدهەمێکە بۆ خۆی، یا مخدوومی مەزنترێکە. مەبەست لە مەخدوومی ئەعزەم: حاجی محەممەدی خەبووشانی، لە مەزنانی عارفانی سەردەمی شا سمایلی سەفەوی لە کەڵە وەلییان پەروەرانی ئەهلی بەیتە، مریدی شێخ محەممەدی لاهیجی و سەید محەممەدی نوربەخش بوو. لە ساڵی ٩٣٨ ك. دا لە خوارزم بەرەو بارەگای سۆمای چاوان باروبنەی پێچایەوە. مەبەست لە ئیبراهیم ئەدهەم: کوڕی مەنسوور، کوڕی بەڵخی، ئیبراهیمی ئەدهەم یەکێ لە مەزنانی دەست لە دنیابەردارانی نیوەی سەدەی دووەمی کۆچی، لە ساڵی ١٦٠ یا ١٦٦دا، لە غەزای بیزەنتییە شەهید بوو. محەمەد کوڕی کوناسە، شاعیری کەرخیی خوشکەزای، کە دە ساڵی (٢٠٧ك.)دا چامەیەکی شیوەنی بۆ گوتووە، لەوێدا دیاردیی بۆ ئەوە کردووە کە گڵکۆی ئیبراهیم لە شاری ڕۆژاوایە؟ خاوەنی (الاغانی) گۆڕی بە (الجدث الغربی) نێو بردووە. بە قسەی بەندوباوی دیکە، ئارامگای وی لە "سوقین" یەکێ لە قەڵایەکانی ڕۆمە و دەڵێن شازادەی بەڵخ بووە. ڕۆژێك لە ڕاو و شکارگایەکدا، لە پێوارەوە بانگێك بەر گوێی دەکەوێ، کە ئەی ئیبراهیم، ئایا تۆ بۆ ئەو کارە هاتی؟ بە بەر گوێ کەوتنی ئەم بانگە دڵ و دەروونی بە شوور و پەژارە کەوت و لە ئەسپەکەی پیادە بوو، کراسەکەی خۆی بە یەکێ لە شوانەکانی باوی بەخشی و رووی لە بیابان کرد. دێر زەمانێك کات و ساتی لە چیا و چۆلان بە سەر برد. پاشانەکێ چووە مەککەی شەریف، دراوسێتی

ماڵی خوای کرد و لەوێ بە دیدار و هاودەمیی چەند پیاوچاکێکی وەکوو فەزڵی عەیاز و سوفیانی سەوری گەیشت. بە قەولێ بە خزمەتی ئیمام محەمەدی باقریش (د. خ.) گەیشتووە. سەرەنجام چووە شامێ و تا پایانی تەمەنی لەوێندەر ژیا. ئیبراهیم ئەدهەم کەرامەتی زۆری وەپاڵ دەدرێ و نێوی لە کن تورکان بە نمای پیرۆزییەکی لە خواسایی بەدەر بەربڵاوە. لە کن بەرەی تەریقەت و شاعیرانی سۆفی مەشرەب زۆر زوان زەدە. (رضا)یە هر بری مرد خدادر أهل توحیدك: خوا بە یەك زانان، هەر کێهەیان دەگری، بۆ (ڕەزا) پیاوێکی خوایە.

٣١

## حمزه پاشا هجوی*

(پیتی) لام

تیكدی پالان خری ایشته علی الاستعجال(١)
شرقدن غربه خروج ایلیەجكدر (دجّال)
پایمال ایتدی بوتون ملت اسلامی یازیق
أی مسیحا یره ایندرمه بو دجّاله مجال
صویدی رشوتله أگر حمزه بنم طائفەمی
بنده اصلانم آنی هجو ایله الحرب سجال
متصرف اولور حمزه گبی بر أشك(٢)
هر نه ایتدكسه سن ایتدك بزه زی قحط رجال(٣)

.................................................................

(١) پالانی خری (ت).
(٢) یٚ یشك (ت).
(٣) هرنه ایتدیكده ایتدك بزه أی قحط رجال (ت).
(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەقسوور
(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)
وەك: " یك دو جامم دی سحرگه اتفاق افتاده بود
وز لب ساقی شرابم در مذاق افتاده بو"
تیكدی پالان خری علی الاستعجال: ئیدی وا کورتانی کەری درووو. شرقدن غربه

خروج ایلیه جکدر دجّال: دەجاڵ پەیدا دەبێ و لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا دڕەوا. پـایمال ایـتدی بتون ملت اسلامـی یـازیق:حـەیفـێ، سەرلـەبـەری ئۆمـەتـی ئیسلامت پێخوست کرد. ای مسیحا یره ایندرمه بو دجّاله مجال: ئەی مەسیحا بوار لەسەر رووی زەویـن بـەم دەجـاڵـە مـەدە. صویـدی رشوتلـه اگر بنم طـائفـه مـی: مـادامێکی تیرەکەی رووت کردمەوە. بنده أصلانم آنی هجو ایله الحرب سجال: ئەمنیش شێرم و بـە هـەجو هـەڵی دەکەمێ و شەڕیش مەیدان خوێندن و دەگڕ یەکدی ڕاچوونە. متصرّف أولور حمزه گبی بر اشك: کەرێکی وەك حەمزە بە موتەسەڕیف دەبێ؟ هر نه ایتدکسه سن ایتدك بزه ای قحط الرِّجال: هـەر چییەکت پێ کردین، کردت، ئەی قـاتیی پیـاوان.

## ٣٢

## طریق چمچمال*

(پیتی) لام

اشقـیـا حـقـنـده عـاجـز ارتـکـاب ایـتـمـکـدەدر
ارکك ایـلـه قـانجغك بـیـنـنـده واقـع بـرمـثـال
بـو دوام ایـلـرسه مـلك و مـال هـپ الـدن گـیـدر
جـان دخـی ایـتـمـزسه تـخـلیص گریبـان احتمـال
قوش ده گیچمەز کاربانله باد پیمان نیلسون(١)
أشقـیـادن بـلـه بـاغـلامش طـریـق چـمـچـمـال(٢)
آلمـق آلمقـده مـفـوض بشقـه بـرشی بـیـلـمـیـور
اولمسون بـهـرام یـا آلـدیـغـی أیـلـق حـلال

---

(١) کاربان ایله (ت).

(٢) آشقیادن یله (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: ″ باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش
بر جـفـای خـر هجـران بلـبل بـایـدش″

أشقيا حقنده عاجز ارتكاب ايتمكەدر – اركك إيله قانجغك بيننده بر مثال: لە بارەی ئـەشقـيا و يـاخـيـيـانـەوە دەستـەپـاچـەيـە و وا ديـارە ئـەم نـەيـتـوانـيـوە، فـەرق لـە نێوان ماكەرێك و پياوێكدا بكا.. بو دوام ايلرسه ملك و مال هپ الدن گيدر: ئەگەر ئەمە وا بڕوا، هەرچی سەروەت و سامان هەس، لە دەست دەچێ. جان دخی ايتمزسه تخليص گريبان احتمال – قوش ده گيچمز كاربانله، باد پيمان نيلسون: ئەگەر ڕۆحيش بەرۆكی خۆی لە دەستی قوتار نەكا، باڵندەش ناتوانێ تێ پەڕێ، بای وەعد چ پكا؟ مەبەستی لە بای وادە: بای دەبوورە. زشقيادن بله باغلامش طريق چمچمال: ڕێگای چەمچەماڵ، ڕەشەبای ڕێگر گرتووبە. آلق آلمقده مفوَّض بشقه بر شی بيلميور – أولمسون بهرام بهرام يا رب آلديغی آيلق حلال: لە بێنەو وەرگرتن بەولاوە چييديكە نازانێ، خوايە مووچەكەی پێ حەڵاڵ نەبێ. "بەهرام" بە مانای كابراش دێ و بە مانای لە ڕاودا بەختيار و سەركەوتووش دێ.

٣٣

### طبيب عزت بگ*

(پيتی) لام

خستـــەلـــر بـــاشنـــە تـــكـــمـــيـــل نـــفسدن أوَّل
گـلسه (عـزت بك) اولـور رجـعـتـه مـجـبـور أجـل
گـلـمدی عـالمه گـلـمـز دخـی بـر بـويلـه حكـيم
حـكـمـتـنـده أول شفـاخـانـەء استـاد أزل
يـد بـيـضـايـی تـداويسنـه لـقـمـان حـيـران
فـكـر (بـقـراط) زبـون، عـقـل (فـلاطـون) مـختـل
حـكـمت سد سكـنـدر گـبـی مـيـدانـده ايـكـن
رخـنـه ويـرمـز بـدن خستـەيـه يـأجـوج عـلـل
عـزتك وصفـی تـوكـنـمـز چـنـه چـالمق نـه لازوم
سوس (رضا)، چونكه سوزك أحسنی (ماقل ودل)

---

(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: ″ نازنـــین عـیب نبــاشد كه كـند نـــاز ای دل

او همی سوزدت از عشق تو می ساز ای دل″

خسته لر باشنه تكمیل نفسندن أول – گلسه عزت بگ رولور رجعته مجبور أجل: ئەگەر عیززەت بەگ پێش دوا هەناسەدان بەسەر نەخۆش ڕا بگا، ئەجەل ناچاری گەڕانەوە دەبێ. واتە: ئەوەندە بژیشكێكی چاكە. گلمدی عالممه گلمز دخی بر بویله حكیم: بژیشكێكی وا تاوەكوو ئێستا نەهاتووەتە جیهان. حكمتنده اول شفاخانهء استاد أزل: ئەم بژیشكە ڕاستی زانە هەر لە عەزەڵەوە. ید بیضایی تداویسنه لقمان حیران: دەستی پەرجوی چارەسەركردنی، لوقمانی حەكیمی سەر لێ سووڕماوە. فكر بقراط زبون عقل فلاطون مختل: بیری بوقرات لە هونەری وی زەبوون و داماو و ئەقڵی فەلاتوون شێواوە. حكمت سد سكندری كه میدانده ایكن: تا حیكمەت سەددی سكەندەریی وی لە گۆڕێدا بێ. رخنه ویرمز بدن خستەیە یاجوج علل: یاجووجی نەخۆشی ڕەخنە لە لەشی نەخۆشان ناكا. عزتك و صفی تو كنمز چنه چالمق نەلازوم: ستایش و پەسنی عـیززەت نـابـڕێتـەوە، چ پـێویست بـە چـەنـەلێدان دەكـا. سوس (رضـا) چونكـە سوزك أحسنی ما قل و دل: كڕ بە (ڕەزا) چونكە چاترینی قسە ئەوەیە، كە كورت و مانا گەیێن بێ.

٣٤

**خرم اودم***

(پیتی) میم

خـــرَّم او دم كـــه ساكـــن دیـــر مـــغـــان ایـــدم

هـــمـــراز جـــام، هـــمـــدم رطـل گـران ایـدم

تـــركـــان سروقـــامت ایـلـــه دست در مـــیـــان

خـوبـان غـنـچـه لـبـلـه دهـان بـردهـان ایـدم

گـــاهـــی حـــریـف حـلـقـهء رنـدان بــاده نــوش

گـــاهـــی انـــیس مـــجـــلس دردكشان ایـــدم

مهری[1] نكتـه سنـج و خـیـالی[2] بـذلـه گو

یـاران شوخ مشرب ایـلـه هـم عـنـان ایـدم
سجـاده غـرق بـادهء عـمـّامـه رهـن مـی
سردفـتـر گـروه خـرابـاتـیـان ایـدم[۳]
گـاهـی مـقـیـم خـانـهء خـّمـار و بـر زمـان[٤]
قـارنـچـهلـرلـه مـعـتـکـف کـنـج خـان ایـدم
خـیـلـی زمـانـده حـضرت دسـتـور کـامـلك
بـر بـاقـمـهسنـده طـائـر قـدس آشیـان ایـدم
اول بـزم دلـفـریـبـده طـوطـی خـوش ادا
اول انجمـنـده شاعـر مـعـجـز بـیـان ایـدم
دوران کـارزار فـصاحـتـده بـن دخـی
(نـفـعـی) گـبـی بـرافـعـی آتش زبـان ایـدم
عـمـان ایـکـن کـفـمـده بـولـنـمـازدی بـر صدف
لـقـمـان ایـکـن مـعـطّـل بـر لـقـمـه نـان ایـدم
عقل و فهم دانش ایله هیچ اویمادی زمان[٥]
بـردم بـن دخـی گـرچـه فـریـد زمـان ایـدم
تـیـر مشهـدم مـقـام (رضا) دن اوحـال ایـلـه
هـر بـر بـلایـه شاکـر و الحمـد خـوان ایـدم

---

(١) و (٢) (مهری و خیالی) هەردووکیان لە فوزەلاو شوعەرای کوردن کە لە ئەستەنبۆڵ سەریان ناوەتەوە. (مهری) کەرکووکی و (خیالی) خەڵقی ولاتی هەولێر بوون.

(٣) گروهی (ع).

(٤)…. خمار و زمان (ع).

(٥) عقل و فهم و دانش ایله او عادی زمان (بردم بر دخی گرچه فرید زمان ایدم) ئەم بەیتە بەم شێوەیە لە چاپی مەریوانیدا نووسراوە و لە چاپی عەلی تاڵەبانیدا نییە. منیش هەر ئەوەندەم پێ کرا ئاوهای ڕاست کەمەوە.

(*) کێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون مەحزووف
(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعل)

نموونەم بۆ ئەمە وەچەنگ نەکەوت.

خرَّم او دم کە ساکن دیر مغان ایدم: ئای لە خۆشیی ئەو دەمەی کە نیشتەنیی پەرستگای ڕۆحانییانی زەرتوشتییان بووم. همراز جام، همدم رطل گران ایدم: هاوڕازی پیاڵە و ڕەتڵی گران بووم. ڕەتڵ (ع. الرَّطل) ١٧٥ درهەمە. مەبەستی کووپەی شەرابە. ترکان سرو قامت ایلە دست در میان ایدم: دەگەڵ جوانانی بەژن سەروی وەك جوانانی ترکاندا دەستە و نێوبەژن بووم. خوبان غنچە لبلە دهان بر دهان ایدم: دەگەڵ جوانانی زار خونچاندا زار بە زاراوە بووم. گاهی حریف حلقەء رندان بادە نوش: کاویێ هاوڕێی گرۆی ڕەندانی بادە نۆش. گاهی انیس مجلس درد کشان ایدم: جاریێ هاودەمی کۆڕی تڵیە نۆشان بووم، یا دوردکێشان بووم. مهری نکتە سنج و خیالی بذلە گو – یاران شوخ مشرب ایلە هم عنان ایدم: دەگەڵ ئی وەکوو میهریی نوکتە خۆش و خەیاڵی گاڵتەیی و یارانی مجێز بە گەمە و گاڵتەدا هاوجڵەو بووم. میهری و خەیالی، دوو شاعیری کورد بوون شێخ ڕەزا دەگەڵیاندا، لە ئەستەمبۆڵ هاوسەروساخت بووە. میهری کەرکووکی و خەیالی هەولێری بووە. سجّادە غرق بادە عمّامە رهن می: سەججادە نوقمی پیاڵەی شەراب و مێزەر بارمتەی مەی. سردفتر گروه خراباتیان ایدم: سەردەفتەری گرۆی مەیخانەنشینان بووم. مەبەست لە ″خرابات″ هەروەکوو لە پێشترەوەش باسم کردووە بە وێرانە و کەراواش مانای دێ. گاهی مقیم خانەء خمار بر زمان: گاهێ نیشتەنیی خاندە طوطی خوش أدا: لەو بەزمی دڵفریوەتدا تووتیی قسە ڕەوان. اول انجمندە شاعر معجز بیان ایدم: لەو ئەنجومەنەدا شاعیری پەرجوو بەیان بووم. دوران کارزار فصاحتدە بن دخی – نفغی کبی بر أفعی آتش زبان ایدم: لە سەروبەندی هەنگامەی زارپاراوی و قسەڕەوانیدا، وەکوو نەفعیی شاعیر، مارێکی زمان ئاگرین بووم. دیارە لەنێوان ″نفعی″ و ″افعی″ دا جیناسێکی نیوە کەت هەس. عمان ایکن کفمدە بولنمازدی بر صدف: کە دەریای عومان بووم، پوولێکی هێندی سەدەفێکی بێ بەهام شك نەدەبرد. لقمان ایکن معطل بر لقمە نان ایدم: کە لوقمانێك بووم، داماوی پاروەە نانێك بووم. لوقمان بە زۆر خۆر و چڵێسیش دەگوترێ. تیر مشهدم مقام (رضا) دن أو حال ایلە – هر بر بلایە شاکرو الحمد خوان ایدم: بە تێریی مەشهەدی مەقامی (ڕەزا) بەو حاڵەشەوە سپاسگوزاری هەموو بالآیەك بووم. مەبەست لە مەشهەدی مەقامی ڕەزا، ئیمام ڕەزایە.

## ٣٥

## کنز راز*

## (پیتی) میم

گشت فـضـای عـالـم جـان ایـتـمك ایستـرم
جـان کـمـنـده بـر جـولان ایـتـمك ایستـرم
بـیـرون دلـده بـولمـادم آثـار کـنـز راز
چـاك درونـه عـطف عنـان ایـتـمك ایسترم
درگـاه حضرتـه عرض نیـاز ایلـه‌یم گرك(١)
أسرار مـن لـدنـی بـیـان ایـتـمك ایسترم
جـاسوس آهـم آلمـادی جـانـانـه‌دن سپـر
إشبـو جـهـان نـورد دوران ایـتـمك ایسترم(٢)
روا دگـل حـقـیـقـتـه سن شیـخـه کین (رضا)
بـن جستـجـوی پـیـر مـغـان ایـتـمك ایسترم

---

(١) له چاپی عه‌لی تاڵه‌بانی له جیاتی (ایله‌یم گرك) نوخته دانراوه..

(٢) اشك (ت).

(*) کێش: به‌حری ڕه‌جه‌ز موسه‌ممه‌ن مه‌خبوون مه‌حزووف

(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعل)

نموونه‌م بۆ ئه‌مه وه‌چه‌نگ نه‌که‌وت.

گشت فضای عالم جان ایتمك ایسترم: گه‌شت و گه‌ڕان کردنی فه‌زای جیهانم ده‌وێ. جان کمنده بر جولان ایتمك ایسترم: ده‌مه‌وێ له گیانی که‌مه‌ند کراودا ته‌ڕاتێنێ بکه‌م. بـیـرون دلـده بولمادم آثـار کنـز راز: لـه ده‌ره‌وه‌ی دڵدا ئـاسه‌واری گـه‌نجینـه‌ی ڕازم نه‌دیته‌وه. چاك درونه عطف عنان ایتمك ایسترم: ده‌مه‌وێ جڵه‌و به لای دروون دادڕیندا وه‌رگێڕم. درگاه حضرته عرض نیاز ایله‌یم گرك: ده‌مه‌وێ له ده‌رگای ئه‌و حه‌زره‌ته عه‌رزی نیاز بکه‌م. أسرار من لدّنی بیان ایتمك ایسترم: ده‌مه‌وێ نهێنییه‌کانی زانسته خواییه‌کان به‌یان که‌م. جاسوس آهم آلمادی جانانه‌دن سپر: سیخوڕی ئاه و ناڵه‌م سه‌نگه‌ری له ماشووقی گیان نه‌گرت. إشبو جهان نورد دوران ایتمك ایسترم:

دەمەوێ گەشتی جیهان گەڕانی زەمان بکەم. روا دگل حقیقتە سن شیخە کین (رضا): رك و کین لە شێخ ڕەزا هەڵگرتن ڕەوا نییە. بن جستجوی پیر مغان ایتمك ایسترم: ئەمن هەڵپەکردنی پیری موغان دەدەم.

٣٦

**نعیم***

(پیتی) نوون

بـــر نـــعــیـــم آدلـــو صنـــم گـــلـــمش دیـــار شامـــدن
زن او زن کـیـم بـویـلـه مـحـبـوبـی چـیـقـارمش آمدن
آن سسی خوش چالغیجی گلمش خصوصا اکسەسی(١)
چـــوق نـــفـــوسی ایـــتـــدی اغـــوا مـــلت إسلامـــدن
حـــاجـیـلـر گـورسە آنـــی دور مـــطـــاف کـــعـــبـــەدە
بـــاش چـیـقـــاریـــر اژدهـــا آسا سیـکـی إحـرامـدن(٢)
دونـدە پـنـهـان ایـلـمش سمـتین دونك حـفـظـی ایـچـون
دون دگـل گـردنـدە حـفـظ ایـتـمـز آنـی اقـلامـدن
نـــقـــرەء سمت و سریـــنـــی پـــارەسز گـــیـــرمـــز ألـــە
سن کـە مـفـلس سن (رضا) گـیـچ بـو خـیـال خـامـدن

................................................................

(١) ئەم دوو دێڕە لە چاپی تاڵەبانیدا بە نوختە دانراون. لە چاپی مەریوانیدا هەن.

(٢) (...): (سیکی)یە.

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن فعلاتن فعلات فع لن)

وەك: "صنما مردەء آنم کە تو جانم باشی – می دهم جان کە مگر جانم جهانم باشی"
بر نعیم آدلو صنم گلمش دیار شامدن: بتێکی نعیم ناو لە وڵاتی شامێڕا هاتووە: زن أو زن کیم بویلە محبوبی چیقارمش آمدن: ژن چ ژن، کێ خۆشەویستی وای لە کوز هێناوەتە دەر. آن سسی خوش چالقیجی گلمیش خصوصا اکسەسی: ئەو مووزیك ژەنە دەنگ خۆشە هاتووە، بەتایبەت دوتوەی. چوق نفوسی ایتدی رغوا ملت اسلامدن:

خەڵکێکی زۆری لە بەرەی موسڵمانان لە خشتە برد. حاجیلر گورسە أنی دور مطاف کعبەدە: ئەگەر حاجییان لە دەوری تەوافی کەعبەیدا ببینن. باش چیقارر اژدها أسا سیکی إحرامدن: کێری وەك ئەژدیها لە پۆشاکی ئیحرامەوە دەردێنێ. دونده پنهان ایلمش سیمین دونك حفظی چون: قوونی زیوینی لە دەرپێدا شاردووەتەوە. دون دگل گردنده حفظ ایتمز آنی آقلامدن: نەك لە دەرپێدا، بگرە بە گەردنیەوەشی ببەستێ لە قەڵەمانی ناتوانێ بپارێزێ. مەبەستی لە "اقلام" کێرە و دیاردییەکیشی بۆ قەڵەم و دوێت تێدایە..

نقرەء سمت و سرینی پارەسز گیرمز ألە: زیوی سمت و سورینی بێ پارە وەگیر ناکەوێ.

سن کە مفلس سن (رضا) گیچ بو خیال خامدن: ئەی ڕەزا، تۆ کە موفلیسی لەم خەیاڵی خاوە واز بێنە.

## ٣٧

## إحدى الرَّاحتين*

(پیتی) نوون

یــا (جــمــیــل) مــارآه سائـــــل

بــاسطــاً لــلـكـفِّ احـدی الــراحـتین

عــن نــدی کــفَّــیك یــأسي راحــةٌ

کیف لا (والیأس إحدی الراحتین)

فــاز ایــری فـیك خـابت خـصیـتـی

إنَّ حــظـی مــنك حــظُّ الخصیـتین

---

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەددەس مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: "عشق چون دل سوی جانان می کشد

عــقل را در زیر فــرمان می کــش"

یا (جمیل) ما رآه سائل / باسطاً للكفِّ إحدی الرَّاحتین: ئەی جەمیل تا ئێستا دەرۆزەکەرێ دەستێکی لێ پان نەکردوویتەوە. عن ندی کفیك یأسي راحه – کیف لا والیأس إحدی الرَّاحتین: لە سەخاوەتی دەستت نائومێدیم ئاسوودەییە – چۆن نا، کە

نـائـومـێدی یـەکـێ لـە دوو سەرئـاسوودەیـیـیـەکـانـە. مـەبـەست لـە یـەکـێ لـە دوو سەرئاسوودەیییەکان: بیرنەکردنەوە و لە بیرچوونەوە، یا بە کام گەیشتن و بە مەرام گەیشتنە. فاز أیری فیك، خابت خصیتی: کێرم گرێوی بردەوە، بەڵام گونم دۆڕاندی، إنَّ حظّی منك حظ الخصیتین: بەداخەوە بەشم بوو بە بەشی هەردوو گونان، مەبەستی ئەوەیە کە دەبا هەردوو گونیشی تێ بردبا، بەڵام نەکرا، بێ بەش بوو.

### ٣٨

### بو الهدی*

(پیتی) هێ

کـیـمسه مـغـرور اولمسون دنـیـاده جـاه و مـالـنـه
عبرت آلماق لازم اولدی (بوالهدی) نك حالنه
بـر زمـان صدر وزارت رتبـەسیـیدی نـاگـهـان(١)
چـالـدی بـر تـکـمـە فـلك اول مـفسدك اقـبـالـنـە
رفع اولندی رتبەسی، بیلمم نه اولدی مسندی
بـاب عـالـیـدن سور اولـدی ایـرمـادی امـوالـنـە
نـفـیـنـە چـیـقدی اراده، بـختـی اولدی سرنگون
حـالـی دونـدی بـر دخـی اسکـی حـلب حـمـالـنـه
هـرکـیـم ایـلـرسه خـیـانت دولـتـه حـالـی بـودر
دولاشور بـرگـون ایـاغـی دامـن اعـمـالـنـه

.................................................................

(١) رتبەسی ایدی (ع).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: "ای بە قدّ برکـشیده همــچو سرو غاتفر

ای رخ تو همچون ماه و از وی خوبتر"

کیمسه مغرور أولمسون دنیاده جاه و مالنه. کەس بە دەسڕۆیی و سەروەت و سامانی غەڕرا نەبێ. عبرت آلمق لازم أولدی (بوالهدی) نك حالنه: پەند وەرگرتن لە حاڵی

(بولهودا) بوو بە کارێکی پێویست و ناچارەکی. بر زمان صدر وزارت رتبەسییدی ناگهان: سەردەمانێ پلە و پایەی سەرۆك وەزیری بوو، کەچی لە ناکاو. چالدی بر تکمە فلك أول مفسدك إقبالنە: ڕۆژگار لەقەیەکی لە یەغباڵ و دەوڵەتی ئەو دنیا بە فەساد بەرەدا، دا. رفع أولندی رتبەسی، بیلمم نە أولدی مسندی: لایان برد، بەڵام نازانم پلەی بوو بە چی؟ باب عالیدن سور أولدی ایرمادی أموالنە: لە بابی عالییان وەدەرنا، فریای ماڵ و سامانی نەکەوت. نفینە چیقدی إرادە، بختی أولدی سرنگون: فەرمان بۆ ڕەهەندە کرانی دەرچوو، بەختی ژێرو ژوور بوو. لە جیاتی "بخت"، " تخت"یش دەگونجێ.. حالی دوندی بر دخی أسکی حلب حمّالنە: حاڵی جارێکی دیکە وەگەڕا بە حاڵی حەممالی حەڵەب. هر کیم أیلرسە خیانت دولتە حالی بو در: هەرکەسێ خیانەت لە دەوڵەت بکا ئەمە حاڵیەتی. دولاشور بر گون أیاغی دامن أعمالنە: ڕۆژێ لاقی بە داوێنی کردەوەکانیەوە دەئاڵێ.

## ٣٩

## پاچەچی ابراهیم منیب*

(پیتی) هێ

قرلسون أل آیاغك، قانە باطسون پاچەچی زادە(١)
نیچون ویردك نعیمك نونهال عمرینی بادە
سورن بزم طربدن ساقی و سازندەیی زیرا(٢)
نعیك سز دردسردر نغمەء نی، نشئەء بادە
ستم اندازەدن چیقدی إلهی بردها گوندر
(هلاکوخان) گبی برکافر خونریزی بغدادە
اسامی نامەء عشّاقنی اول سروبالانك
آچوب گوردم یازیلمشدر (رضا)نك اسمی بالادە

---

(١) قرلسوك (ع).

(٢) سازندەو (ع).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)
وەك: ″مرا می بینی و هر دم زیادت می كنی دردم
ترا می بینم و میلم زیادت می شود هر دم″

قرلسون أل آیاغك قانە باطسون پاچەچی زادە: ئەی سەرو پیّ فرۆش، دەست و پێت بشكێن، خڵتانی خوێن بن. نیچون ویردك نعیمك نونهال عمرینی بادە؟ بۆچی تەمەنی نەونەمامی نەعیمت بە با دا؟ سورن بزم طربدن ساقی و سازندەیی زیرا: مەیگێڕو گۆرانی بێژ و موزیك ژەن لە كۆڕی بەزمی ڕابواردن وەدەرنێن، چونكە نعیم سز دردسردر نغمەء نی نەشئەء بادە: بێ نەعیم، ئاوازی نەی و نەشئەی پیاڵە سەرێشەیە. ستم اندازەدن چیقدی الهی بر دها گوندر – (هلاكو خان) گبی بر كافر خونریزی بغدادە: زۆر و ستەم لە ئەندازە دەرچوو، خوایە، كافرێكی وەكوو هولاكۆخان بۆ بەغدا بنێرە. أسامی نامەء عشاقنی أول سرو بالانك – آچوب گوردم یازلمشدر (رضا)نك اسمی بالادە: نێونامەی ئەو بەژن سەرو بەژنە وەكرد، نواڕیم نێوی (ڕەزا) لە سەرووی هەمووانەوە نووسراوە. ئەوەیە كە نێوی شێخ ڕەزا لە سەر دەفتەرەوە بۆ ستەم لێكردن نووسراوە.

## ٤٠

## پیر مغان*

(پیتی) هیّ

عـــرض در سعـــادتـــە وارد كسە ای صبـــا
بـر فـاتحە أوقـو پـیـر مـغـانك مـزاریـنـە
طوپراق ایچندە سویلە یتر یاتماغك شكیب
قـالـق عـودت ایلـە جـانب دار و دیـاریـنـە
تـاكـی اسیـر خـاك، بـاشك قـالدر، آچ گـوزك
بـاق عـالمك صفـای بـهـار و نـهـاریـنـە
ویـرمـز ایسە جـواب یـنـاشدر پـیـالـەیـی
بـر جـرعـە دوك او عـاشق رندك كـنـاریـنـە

---

(*) كێش: بەحری ڕەجەز موسەممەن مەخبوون مەجبووب

(مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعل)

نموونەم بۆ ئەمە وەدەست نەکەوەت.

عرض در سعادتە وارد کسە ای صبا: ئەی بای سەبا ئەگەر گەیشتیە عەرزی دەرگای بەختەوەری. بر فاتحە أوقو پیر مغانك مزارینە: فاتیحایەك بۆ زیارەتگای پیری موغان بخوێنە. طوپراق ایچندە سویلە یتر یاتماغك شکیب: بێژە، ئەی شەکیب، لە نێو خاکدا نووستنت ئیدی بەسە. مەبەستی لە شەکیب، مەولانا محەمەد عەلی، لە شاعیرانی دوایی ئێرانییە. بۆ خۆی شیرازییە، لە سەروبەندی عوسمانیدا، ئەفغانستانی داگیر کرد، پاشان شەهید کراوە. ئەم بەیتە ئی وییە:

"دە عالم را جزای قاتل من دە خدای من

کە بس باشد همین ذوق خونبهای من"

بە کوردییەکەی: خوای من سزای هەر دوو دنیا لە جیاتیی بکوژی من بدە، کە ئیدی بەسە، هەر ئەوەندەیە زەوقی خوێنبەهای من. قالق عودت أیلە جانب دار و دیارینە: ڕابە وەگەڕێ ماڵ و حاڵ و وڵاتت. تا کی أسیر خاك، باشك قالدر، آچ گوزك: تاکەی دیلی خاك بی، سەر هەڵبڕە، چاوت هەڵێنە. باق عالمك صفای بهار و نهارینە: بنۆڕە سافی و بێ گەردیی بەهار و ڕۆژی دنیایێ. ویرمز ایسە جواب یناشدر پیالەیی: ئەگەر بەرسڤی نەدایتەوە، شەراب لە لێو نزیك کەوە. بر جرعە دوك أو عاشق رندك کنارینە: قومێکیش بڕێژە دەوروبەری زیارەتگای ئەو ئاشقە ڕەندە.

## ٤١

## صاچمە سپانی*

(پیتی) هێ

یازدیغك صاچمە سپانی بکا استاد ایتدك

ایتمە توفیق کە لعنت اوقونور مفتریە

سکا وعد ایلدیگم هدیەلری عرض ایتدم

زوجە کز خانمە شاد اولدی دیدی گل بریە

قلدی اظهاری فرح پیشکشمدن أما

متکّایی چویروب سبحەیی ویردی گریە

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلە.

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)

وەك ″ تا خبر دارم ازو بی خبر از خویشتنم

با وجودش زمن آواز نیاید که منم″

یازدیغك صاچمە سپانی بکا استاد ایتدك: ئەو قسە قۆڕو هەرزانەی، بۆت نووسیبووم، لێت کردمن بە سەرمەشقی مامۆستایان. ایتمە توفیق کە لعنت أوقونور مفتریە: مەکە تۆفیق، چون لەحنەت لە پیاوی بوختان هەڵبەست دەکرێ. سکا وعد ایلدیگم هدیەلری عرض ایتدم: ئەو دیارییانەی بەڵێنیانیم دابوویێ. زوجەکز خانمە شاد أولدی دیدی گل بریە: بە خانمی ژنتم دا، شاد و دڵخۆش بوو، گوتی وەرە پێشێ. قلدی إظهار فرح پیشکشمدن أما: دڵخۆشیی لە پێشکێشەکانم دەربڕی، بەڵام. متکایی چویروب سبحەیی ویردی گریە: پاڵپشتەکەی وەرگێڕا، تەزبیەکەی خستە پێشم: واتە پشتی تێ کردم و کوزی خستە پێشم.

٤٢

**بغداد***

(پیتی) هێ

گلمدم فسق و فساد ایتمك ایچون بغدادە

برطاقم اهل غرض باشلدیلر افسادە

باشلدم بن دە معایبلرینی تعدادە

قزلری فاحشەدر بچەلری کون دادە(١)

سیکی ویر هر کیمی گوردکسە (زهاوی) زادە(٢)

---

(١) فاحشدر (ع).

(٢) زهاوی دادە (ع).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن فاعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: ″ نازنین عـــیب نباشد كه كـــند ناز ای دل
او همی سوزدت از عشق و می ساز ای دل″

ئەم تەرزە شیعرە موسەممەتی پێ دەگوترێ. وشەكە بە عەرەبی بۆ خۆی بە مرواریی دە ڕشتە كێشراو دەگوترێ. لە هونەری شیعردا بە بەیتێك دەگوترێ كە بە چوار بەشەوە بكرێ و لە دوای سێ بەشیەوە، شاعیر پابەندی سەجع بێ و لە بەشی چوارەمدا قافییە ڕەچاو كرێ، وەك:

″ربع از دلم پر خون كنم، أطلال را جیحون كنم
خاك دمن گلگــون كنم، از آب چــشم خـویشتن″

گلمدم فسق و فساد ایتمك ایچون بغدادە: بۆ فیسق و فەساد بۆ بەغدایێ نەهاتم. بر طاقم أهل غرض باشلادیلر إفسادە: دەستەیەك لە بە غەرەز و داخ لە دڵ، دەستیان بە فەساد و گێرەشێوێنی كرد. باشلادم بن دە معایبلرینی تعدادە: ئەمنیش دەستم بە عەیب و عار ژماردنیان كرد. قزلری فاحشە در بچەلری كوندادە: كیژیان سۆزانی و كوڕیان قووندەر. سیكی ویر هر كیمی گوردكسە (زهاوی) زادە: هەر كێهەت دیتن، بیدە بەرێ، لەو زەهاوییە قووندەرانە. دادە: بە مانای خوشكیش و ئەوەی دەداش دێ، ″زادە″ بە ″دادە″ وەخوێنی مانایەكی دیكەی لێ هەڵدەزقێتەوە.

## ٤٣

## بغداد حمامی*

(پیتی) هێ

گـیـرمـە بـغـدادە أگـر گـلـدك ایسە حـمّـامـە
بـرگـل اندامـی گـوروب، سن دە دوشرسك دامـە
چـلـدیـر گـورسە أگـر غـلـمـانـلـری شیـخ الاسلام
دولاشر پـــایـــنـــە زنجیــر گـــبـــی عـــمّـــامـــە
بـــوسەدن رشوت اگـــر وعـــدە آلـورسە، ایلـر
بـاطـل حـق ایـدر تحریـر شهـادت نـامـە[١]

(١) باطل حق ایدر تحریر شهادت نامە (ع).

(*) كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: ″گر سر صحبت این سر و پایت باشد

بر سر و چشم من دلشده جایت باشد″

گیرمه بغداده اگر گلدك ایسه حمامه: ئەگەر هاتیه گەرماو، نەچیه ناو بەغدایێ. بر گل اندامی گوروب، سن ده دوشرسك دامه: دوایی چاوت بە گوڵ ئەندامێك دەكەوێ، وەدووی دەكەوی. چلدیر گورسه أگر غلمانلری شیخ الإسلام: ئەگەر شێخولئیسلام خوڵامانی ببینێ. دولاشر پاینه زنجیر گبی عمامه. دەنا مێزەرەكەی وەك زنجیر بە لاقیەوە دەئاڵێ. بوسەدن رشوت اگر وعد آلورسه، ایلر: ئەگەر ماچان بە بەرتیل وەرگرێ. باطل حق ایدر تحریر شهادت نامه: باتڵ وەكوو هەق دەكا و شایەتنامەی دەداتێ.

٤٤

**شكایت نامه***

(پیتی) هێ

قلـم آلـدم یـازەیـم شاهـه شكـایت نـامـه
دهشت واقـعـەدن چـاتـلـدی نـوك خـامـه(١)
بـریـهـودی بـچـّه اسلامـی قـبـول ایـتمش ایكن
آغـلـیـه آغـلـیـه ویـرمك نـه دیمك حـاخـامـه
زوجـەسی طـالـقـەدر، قـانـی هـدر، مـالـی حـلال
گـوشهء چشم اهــانـتـلـه بـقـان اسلامـه
حـكـم ایـدوب كـفـرینـه اصحـاب شریـعت أمـا
حـضرت قـاضی لاری گـبـی بـر عـلاّمـه(٢)
ایـتـمسون غـیـرت اگـر حـضرت شیـخ الاسلام
قـالـەمـاز حـرمـتـی پـاچـاوره قـدر عـمّـامـه
سن ده بو یولده (رضا) مال و سری ایله فدا(٣)
دیـن اسلامـه یـاقشمـز گـبـی هـنـگـامـه
(رائف)ك سیئاتی گون گبی میدانه چیقار(٤)
گـر شهـنشاه دوشرسه ایشی استـعـلامـه

............................................................................

(١) چاتلد: (ت).

(٢) لازی: (ت).

(٣) مال و پوسری: (ت). سر و مالی: (م).

(٤) جرعەکشی: (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

وەك: ″ آز تو با مصلحت خویش نمی پردازم

همچو پروانه که می سوزم و در پروازم″

قلم آلدم یازەیم شاهە شکایت نامە: دەستم دایە قەڵەم سکاڵانامە بنووسم. دهشت واقعەدن چاتلادی نوك خامە: لە دەهشتەتی ڕووداوەکە نووکی خامە قەڵشا. بر یهودی بچە اسلامی قبول ایتمش ایکن: بەچکە جوویەك کە گۆیا ئیسلامەتیی قوبووڵ کردووە. آغلیە آغلیە ویرمك نە دیمك حاخامە: دەستی بە گریانێ کرد، گوتی ئەی قوون بە حاخام دان یانی چی؟ زوجەسی طالقەدر، قانی هدر، مالی حلال: ژنەکەی بێ تەڵاق، خوێنی بەلاش،ماڵی حەڵاڵ، گوشەء چشم إهانتلە بقان اسلامە: ئەوەی بە گۆشەنیگای چاوی تەوهین لە ئیسلام بنۆڕێ. (رائف)ك سیَّئاتی گون گبی میدانە چیقار – گر شهنشاە دوشرسە ایشی استعلامە: بێت و لە کردەوە خراپەکانی (رائیف) بپێچرێتەوە و شاهەنشا کاری ڕێی کەوێتە جێی هەواڵ پرسین. هەمووی وەك ڕۆژی ڕووناك بە دیار دەکەون. حکم ایدوب کفرینە أصحاب شریعت أما: هەروەها شەریعەت مەداران بە کافری مەحکووم دەکەن. حضرت قاضی لاری گبی بر علامە: ئەگەر زانایەکی وەکوو حەزرەتی قازی لاری، یا حەزرەتی شێخولئیسلام هیممەتێ نەکەن. قالەماز حرمتی پاچاورە قدر عمامە: مێزەر هێندەی پارچە پەڕۆیەك ڕێزی نامێنێ. سندە بو یولدە (رضا) مال و سری ایلە فدا: (ڕەزا) ئەتۆش سەر و ماڵ لەم پێناوەدا بەخت کە. مؤمنك جیینە گیرمز بو گبی هنگامە: هەنگامەی وا دە بەریکی کەسەوە ناچێ.

٤٥

## در مدح مهدی چلبی که چرا تجار را چلبی می گویند*

(پیتی) یێ

دوشونوردم نه ایچون تاجره دیرلر چلبی
فارسی در بو لغت، تورکی میدر، یا عربی
بونی کیمدن صورەیم، بحر تفکرده ایکن
گلدی تاج الأدبا قارشومه (مهدی چلبی)
دیدم ای جرعەکش معرفتك شقٌ سطیح[۱]
وی عراق و عجمك داهیەء بوالعجبی
لقب عالیکزك اصل معناسی ندر
باقدی دوندردی بناگوشەء چشم غضبی
دیدی یاهو چلبی نازك اولان ذاته دنیر
هر فرومایه اولان چاپقنه دینمز چلبی
دیدم: احسنت بو فضل و هنر و معرفته
أی بزم مملکتك مفتخر و منتخبی
گیتمدن مکتبە، تحصیل کمال ایلەمەدن
نرده بولدك بو قدر دانش و علم و ادبی
گورمدی مثلنی أی فاضل یکتا گوزمز
(مصری) گزدم (یمنی)، (شام) و (حجاز) و (حلبی)[۲]
سایەسندە ایدرز حل مسائل، یوقسه
نه بیلور شیخ (رضا) اویله معمیّ لقبی[۳]

.................................................

(۱) جرعه کش: (ت).

(۲) گیزدم: (ت). مغربی (ت).

(۳) معما: (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)

وەك: ″ هرگزم نقش تو از دل و جان نرود

هر گز آن یاد سرو خرامـان نرود″

دوشونـوردم نـە ایـچـون تـاجرە دیرلـر چلبـی: بیرم دەکردەوە داخـۆ بـۆ بـە بـازرگـان چەلەبی دەڵێن؟ فارسی در بو لغت، ترکی میدر، یا عربی؟ ئەم وشەیە فارسییە، تورکییە، یا عەرەبی؟ بونی کیمدن صورەیم، بحر تفکردە ایکن: هەروا لە دەریای بیرکردنەوەدا بووم، گەلۆ، لە کێی بپرسم؟ گلدی تاج الادبا قارشومە (مهدی چلبی): مەهدی چەلەبیم ڕووبەڕوو هات. دیدم ای جرعەکش معرفتك شقّ سطیح: گوتم ئەی کەرتی سەتیح زانست مژت. سەتیح: کوڕی ڕەبیعە، کابرایەك بوو لە کوڕانی زیب (گورگ) لە سەروبەندی جاهیلییەتدا ژیاوە، هەمیشە لەسەر زەوین ڕادەکشا و باسی پـێوار و غـەیـبـی دەکـرد، تـەنـانـەت دەڵێن، پـێشبـینـیی هـاتـنـی پـەیـامـبـەری کـردووە. تـەمـەنـێکـی درێژی بـەسەر برد، بە پێی هـێندێ بـەندوبـاو لـە شەوی لـەدایکـبوونـی پەیامبەردا مردووە. وی عراق و عجمك داهیەء بوالعجبی: وەی زیرەك و زرنگی عەجایەباتی عیراق و عەجەم. لقبی عالیکزك أصل معناسی نەدر؟ ئەسڵی مانای نازناوی بڵندتان چییە؟ باقدی دوندردی بنا گوشەء چشم غضبی: لێی نواڕیم، ئاوڕی تووڕەییی لێ دامەوە. دیدی یا هو چلبی نازك أولان ذاتە دنیر: گوتی کاورا، چەلەبی بە پیاوی ناسك دەگوترێ هر فرومایە أولان چاپقنە دینمز چلبی: بە هەر پەست و ئاڵچاخێ چەلەبی ناگوترێ. دیدم احسنت بو فضل و هنر و معرفتە: گوتم بتڕەژم، بۆ خۆت و هونەر و فەزڵ و دانایيت. ای بزم مملکتك مفتخر و منتخبی: هۆ جێ شانازی و هەڵوژێردەی وڵاتی مە. گیتمەدن مکتبە، تحصیل کمال ایلەمەدن: بێ وەی بچیە فێرگە و فەزڵ و کەماڵ وەدەست بێری. نردە بولدن بو قدر دانش و علم و ادبی؟: ئەم حەمکە دانایی و زانست و ئەدەبەت لە کوێ وەگیر کەوت؟ گورمدی مثلنی ای فضل یکتا گورمز: چاومان بە فازیلێکی بێ مانەندی وەکە وی تا ئێستا نەکەوتووە. مصری گزدم یمنی، شام، حجاز و حلبی: وڵاتی میسر، یەمەن، شام و حیجاز و حەڵەب گەڕام، ئی وەکە ویم نەدیت سایەسندە ایدرز حلّ مسائل، یوقسە: ئێمە لە سای وییەوە، مەسئەلان هەڵدێنین، دەنا. نە بیلور شیخ (رضا) أویلە معمّی لقبی: شێخ (ڕەزا) هەڵێنانی نازناوی ئەوها بە موعەمما لە کوێ هەڵدێنێ.

٤٦

**رائف پاشا***

(پیتی) یێ

گلور گلمز همان دینی یهودی التزام ایتدی[١]
نه تعظیم شریعت نه دعایات نظام ایتدی
مسلمان اولمش ایکن بر یهودی زادهیی جبراً[٢]
یدی حاخامه تسلیم ایلیوب چوق احترام ایتدی
ایشی بر خائنه واردردی آخر (رائف) جاهل[٣]
که ملت هر طرفدن، خارج و داخل قیام ایتدی
ملوّث ایلدی رشوتله دینی دولتی گویا
جناب داور اکرم سیچوپ ابقای نام ایتدی[٤]
امیر المؤمنین اعدامنه امر ایتسه شایاندر
بو بدطینت که هتك ملت خیر الانام ایتدی
بنای ارتشا چوق یرلری نقصان قالمشدی[٥]
قمو نقصانلری الله ایچون (رائف) تمام ایتدی[٦]
الهی حاکمی شرع شریفی بردوام ایله
نه غیرتله که اول علاًمهیی عالی مقام ایتدی
خصوصاً قهرمان دولت و ملت (امین پاشا)
قوماندان دیانت پیشه خیلی اهتمام ایتدی

.............................................................

(١) گلماز: (ت).

(٢) زادەو: (ت).

(٣) خایند: (ت).

(٤) سەچوپ: (ت).

(٥) نقصاند: (ت).

(٦) محو: (م).

(*) کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

وەك: " اگر آن ترك شیـرازی بـه دست آرد دل مـارا

بـه خـال هندویش بخشم سمرقند و بخـارارا"

گلور گلمز همـان دینی یهودی التزام ایتدی: هـەر هـات و نەهـات، یەكسەر ئـاینی جوهوودانی گرت. نـه تعظیم شریعت نـه رعـایات نظام ایتدی: نه گوێی دایه گەورەیی و ڕێزی شەرع و نـه گوێی دایه نیزام و یـاسا. مسلمـان أولمش ایكن بر یهودی زادەیی جبرا: بەچكە جوویەك كە بـه زۆر موسڵمـان بووە. ید حـاخـامـه تسلیم ایلیوب چوق احترام ایتدی: بـه دەستی حـاخـامەوە دا و زۆری ڕێز لێ گرت. ایشی بر خـائنـه واردردی آخر (رائف) جاهل – كه ملت هر طرفدن، خـارج و داخل قیـام ایتدی: رائیفی نەزان كـارەكەی گەیـانده خـائینێك. كە میللت لـه دەرەوە و لـه نـاوەوە سەریـان هەڵدا. ملوث أیلدی رشوتله دین و دولتی گویـا: ئـاین و دەوڵەتی بـه بـەرتیلخۆری گلاو كرد. جنـاب داور اكرم سیچوب إبقـای نـام ایتدی: جەنـابی داوەری ئەكرەم نێوی هـەڵوژێرد و بۆی هـێشتـیـەوە. زمـیـر المؤمـنین اعدامـنـه أمـر ایتسه شایـاندر: ئـەگـەر خـەلیفـه فـەرمـانـی كوشتنی بفەرمووێ، شایـانیەتی. بو بدطینت كه هتك ملت خیر الانـام ایتدی: ئەم بەد مـایەیه كه ئەتكی نـامووسی پێغەمبەری كرد. بنـای ارتشا چوق یرلری نقصانده قـالمشدی: بینـای بـەرتیل خۆری زۆر جێگای بـه نـاتـەواوی مـابووەوە. قمو نقصانلری اللّه ایچون (رائف) تمـام ایتدی: هەموو نـاتـەواوییەكانی، رائیف تـەواوی كردن. الهی حـاكمی شرع شریفی بر دوام ایلـه: خودایـه، قـازیی شەرعی شەریف پـایەدار و بـەردەوام كە. نـه غیرتله كه أول علامـەیی عـالی مقـام ایتدی: بـه چ هیممـەتێكەوە ئەو زانـایـەی بڵند پـایه كرد. خصوصاً قهرمـان دولت و ملت (امین پـاشا) : بـه تـایبەت قـارەمـانی دەوڵەت و میللـەت، ئەمین پـاشا. قومـاندان دیـانت پیشه خیلی اهتمـام ایتدی: سەركردەی ئـاین پیشه زۆری مشوور خوارد.

٤٧

## چایچی كل وزیر مدحنه*

(پیتی) یێ

كـل وزیـرك مـجـمـع خـوبـان اولان چـایـخـانـەسی

جــوهــر روح روانــدر جــرعــەء پــیــمــانــەسی(١)

قـوردیـغـی کـرسیـلـر اوزره خـوب رویـان عـراق[2]
آل یـنــاقـلـر هـر بـری یـاقـوت و مـرجـان دانـەسی
بـویـلــه بـزم دلـفـریـبـی گـورسه شیـخ خــانـقـاه
مــانــع اولمز رقــصنــه واعــظـلــرن افسانــەسی
پــادشاهك جــانــنــه بـر بـنـدەسیـدر (کـل وزیـر)
ایستــەمــز الا (رضا)ی حــضرت شاهـــانــەسی
آقچەلر صرف ایتدی شهر آیین ایچون روز جلوس
یــوق ایـکـن بـر آقـچـه بـیت المالـدن مـاهـانـەسی
چـای ایـچـون بـیکـلـرجـه اجـرت ویـرمیـان آدملره
مــنت ایــتــمـرز آفـریـن طـبـع جـوانمردانــەسی
ایستــەسه ایـلــر ستــایش ایستــەسه ایـلـر هـجـا[3]
لا ابــــالـــیـــدر (رضا) نك مشرب رنـــدانـــەسی

................................................................

(١) جرعەو و: (ت).

(٢) کورسیلر: (ت).

(٣) ایسترسه: (ت).

(*) کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

وەك: ״ شرط مـردان نیـست در دل عشـق جانان داشـتن

پش دل انـــدر بند وصـــل و بند هــــجران داشتن״

کل وزیرك مجمع خوبان أولان چایخانەسی: چاخانەکەی وەزیرە کەچەڵ کە بووەتە کۆڕی جوانانی چاك. جوهر روح روان در جرعەء پیمانەسی: کە قومێك و پیاڵەیەکی گەوهەری ڕۆحی ڕەوانە. قوردیغی کرسیلر أوزره خوب رویان عراق: ئەو کورسییانەی دای مەزراندوون، ڕوخسار جوانانی وای لە سەر دادەنیشن. آل یناقلر هر بری یاقوت و مرجان دانەسی: هەر کێهەیان دەگری دانەی یاقووت و مەرجانێکە بۆ خۆی. بویله بزم دلفریبی گورسه شیخ خانقاه: شێخی خانەقا بەزمی دلفریوی وا ببینێ. مانع أولمز رقصنه واعظلرن أفسانەسی: پڕوپووچی پەنددادەران ڕێ لە سەمای ناگرن.

پـادشاهك جـانـنـه بـر بـنـدەسيـدر (كـل وزيـرك): وەزيـرە كـەچـەڵ بـۆ رۆحـی پـادشا بەندەيەكی ئاڵقە لە گوێيە. ايستەمز إلا (رضا)ی حضرت شاهانەسی: لە (ڕەزا)ی حەزرەتی شاهانەی زێتر ناوێ. آقچەلر صرف ايتدی شهر آيين ايچون روز جلوس: چەندين پارە و پووڵی بۆ چراخان و شايلۆغانی شارايين خەرج كرد. يوق ايكن بر آقچه بيت المالدن بر ماهانەسی: دە كاتێكدا قڕانێكی مووچە لە بەيتولمالدا نييە. چای ايچون بيكلرجه أجرت ويرميان آدملره – منت ايتمز آفرين طبع جوانمردانەسی: هەرگيز منەت بەسەر چايخۆری پارە نەداودا ناكا، ئافەرين بۆ خۆی و تەبيعەتی جوامێرانەی. ايستەسه ايلر ستايش ايستەسه ايلر هجا – لا اباليدر (رضا) نك مشرب رندانەسی: تەبياتی مجێز ڕەندانەی ڕەزا گوێ ناداتێ، بيەوێ ستايشت دەكا و بيەوێ فڕان داوێ.

٤٨

## حازم بگ*

(پيتی) يێ

دولـتك أك صادقـی، والـيـلـرك أك احسنـی[١]

ايستـەدك الـلـهـدن، الـلـه گـونـدردی سنـی

پك مـبـارك بـر زمـان بـغـدادە تشريـف ايـلـدك

ای وزيـر كـاردان، ای عـدل و دادك مـعـدنـی

غـرەء مـاه مـحـرم، سال نـو، فـصل بـهـار

لالـەلـر نـوخـيـز و، گـلـلـر تـازە، والـيـمز يـبـی[٢]

سن گـبـی بـر آصفك حـزم و ثـبـاتك گورمدم[٣]

ديـكـلـەمـم أفسانـەء (اسفـنـديـار) و (بـهـمـنـی)

سلِّ سيف ايتمك نه حاجت حسن تدبيرك يتر

قـيـد بـنـد طـاعـتـكـدر اشقـيـانك گـردنـی

مـيـگـذارد از نـهـيب خـصم اگـر آتـش شـود

چـارەء پـيـكـان (رسـتـم) كـی كـنـد رويـيـن تـنـی

تـو هـمـان حـازم بـگـی عـالـی جـنـاب كـه آفتاب

مـيـكـنـد از نـور رأيت اقـتـبـاس روشنـی

